

بەسەرهاتی ڕاستەقینەی
مندالێکی چەکدار



# ڕێگایەکی دوورودرێژ

نووسەر: ئیشمایل بییە

و. لە ئینگلیزییەوە: شێنێ بۆسکانی

# ڕێگایەکی دوورودرێژ

**بەسەرهاتی ڕاستەقینەی منداڵێکی چەکدار**

نووسەر: ئیشمایل بییە
و. لە ئینگلیزییەوە: شێنێ بۆسکانی

**سلێمانی**
**٢٠١٣**

زنجیرەی کتێبی گۆڤاری هەنار
ژمارە ( ٦٥ )

# ڕێگایەکی دوورودرێژ


- نووسەر: ئیشمایل بییە
- و. لە ئینگلیزییەوە: شێنێ بۆسکانی
- بابەت: یاداشت
- پیتچنی: وەرگێڕ
- نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: پەیام ئەحمەد
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوللا
- قەبارەی کتێب: A5
- ژمارەی لاپەڕە: ٢٢٤
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (٩٧٠)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی کەمال
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (١٥٦٥)ی ساڵی ٢٠١٣ی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوانی دراوەتێ.

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**
**گردی ئەندازیاران**
**ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩**

## پێشەکی

ئەم کتێبە باس لە چیرۆکی ڕاستەقینەی ژیانی (ئیشمایل بییە) دەکات کە لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا لە دەست جەنگ هەڵدێت و هەموو ئەندامانی خێزانەکەی لەدەست دەدات، ئەمیش وەك چەندین هەزار منداڵ لە ناوەندی هەموو شێتییەکاندا خۆی وەك سەرباز دەبینێتەوە، ئیدی لەو ساتەوە دڵنیا دەبێت کە توانای هەیە چەندین کاری چەپەڵ و نامرۆڤانە ئەنجام بدات، پاش ئەوەی کۆچی کرد لەو وڵاتە، بڕیاری دا چیرۆکی ژیانی پڕ چەرمەسەری بۆ هەموو جیهان ئاشکرا بکات، چیرۆکی لەدەستدانی بەرائەتی منداڵی و لەدەستدانی هێز بۆ پاکبوونەوە لە گوناه. ئیشمایل لە ساڵی ١٩٨٠ لە سیرالیۆن-ی ڕۆژئاوای ئەفریقا لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٩١ شەڕی ناوخۆ لە وڵاتەکەی بەرپا بوو. چەندین کەس بوونە یاخیبوو، بەرەیەکیان پێکهێنا بە ناوی (بەرەی یەکگرتووی شۆڕشگێڕان) بۆ ماوەی یانزە ساڵ جەنگیان لەو وڵاتە بەرپا کرد تا ساڵی ٢٠٠٢. لە بنەڕەتدا ئەم بەرەیە لەلایەن (فۆدەی سانکۆ)ی سەر بە خێڵی (میندی) لە سیرالیۆن، دامەزرا. لە سەرەتادا ئەم بەرەیە چەندین دروشمی وەك "نا بۆ کۆیلایەتی" و "هێز و سامان بە یەکسانی موڵکی هەموو لایەکە".. . هتد بەرزکردەوە. لە کاتێکدا ئامانجی سەرەکییان تەنها بریتی بوو لە ڕووخاندنی حوکمەتی ئەوکاتەی سیرالیۆن. لەبەر ئەوەی سیرالیۆن وڵاتێکی دەوڵەمەندە بە ئەڵماس، بێ شك زلهێزەکانی ئەو کاتە چاویان بڕیبووە

ئابوورییــە بەهێزەکــەی. فــۆدەی، پــەیمانی دابەشــکردنی ئەڵماســەکان و چەندین شتی تریشی نەبردە سەر، لەبری ئەوە پارەکانی بۆ کــڕینی چــەك و پێکهێنانی سوپایەك بۆ خــۆی بــەکارهێنا. هــەموو کانگــە ئەڵماســەکان لەژێر کۆنترۆڵی یاخیبووەکاندا بوون. ئیتر لەو کاتە بــەدواوە یاخیبووەکــان تەنها لە بیری هێشتنەوەی کۆنترۆڵیان بوون بەسەر ئــابووری ئــەو وڵاتــەدا، هــەموو ئەمانــەش بوونــە ئیفلیجبــوونی ئــابووری ســیرالیۆن، برســێتی و قاتوقڕی ڕووی کردە وڵاتەکە. یاخیبووەکان زۆربەیان منداڵ بوون، نزیکــەی دە هەزار منداڵ ناچارکرابوون بۆ سووتاندنی گوندەکان و هەڵکەندنی کانە ئەڵماســـەکان و چــاودێریکردنی ئازووقــە و چــەك و تەقەمەنییــەکان. بەگوێرەی سەرژمێرییەکان لە هــەموو جیهانــدا سێســەد هــەزار منــداڵی سەرباز هەن، ئیشمایل-یش یەکێك بووە لەوان. تا ئــەمڕۆش نزیکــەی دوو هەزار منداڵ لە سوپای سیرالیۆن خزمەت دەکەن. منداڵــەکان ئەوەنــدەیان ماددەی بێهۆشکەر پێدرابوو، بەتەواوەتی لە هەموو سیفاتێکی منداڵبوون داماڵێنرابوون. کوڕەکــان دەبوونــە یــاخیبوو، کچــەکانیش ناچــاردەکران و بازرگانیی لەشفرۆشییان پێوەدەکرا. زۆربەی منداڵەکان ناچارکرابوون دایك و باوکی خۆشیان بکوژن، بڕێ جار بۆ چێژوەرگرتن گرەویان لەسەر ڕەگــەزی منداڵێك دەکرد لە سکی دایکیدا، ئایــا کچــە یــان کــوڕ! پاشــان ســکی دایکەکەیان هەڵدەدڕی تا لە وەڵامەکەی دڵنیابن. تەنانەت منداڵی تەمەن پێنج ساڵانیش ناچاردەکرا بۆ کاری سەربازی.

تــا ســاڵی ١٩٩٧ جــۆنی پــاوڵ کۆرمــا (ئەنجومــەنی هێــزە چــەکدارە شۆڕشگێڕەکان)ی دامەزرانــد، ئــەوەش لێــدانێکی کتــوپڕ بــوو بــۆ ســەر

یاخیبووەکان. هێزەکانی خۆرئاوای ئەفریقا بڕیاری گەڕاندنەوەی (ئەحمەد تیجان کابا)یان دابوو بۆ سەر دەسەلات وەکو سەرۆکی نوێی ئەو وڵاتە. بۆیە ئەنجومەنەکەی جۆنی و یاخیبووەکان بڕیاری ڕێکەوتنیان دا پێش ئەوەی هەردوو بەرەکە لەلایەن هێزەکانی خۆرئاوای ئەفریقا (کە ئەوانیش لەلایەم نایجیریاوە بەڕێوەدەبرا) لە پایتەخت دەربکرێن. ژمارەی کوژراوانی ئەو جەنگەش بە زیاتر لە دووسەد هەزار کەس مەزەندە دەکرێت.

بەرەی یاخیبووەکان بووە پارتێکی سیاسیی ڕەسمی تا ساڵی ۲۰۰۷. لە ساڵی ۲۰۰۹ هەرسێ سەرکردەی (بەرەی یەکگرتووی شۆڕشگێڕان) بە ناوەکانی (عیسا سێسەی، مۆریس کالۆن و ئەوگەستاین گبۆو) تۆمەتبارکران بە تاوانی هەڵگیرساندنی جەنگ و تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی. دوای ئەوەی ئاشتی بەرقەرار بوو، هەڵبژاردن لە وڵاتی سیرالیۆن کرا، (بەرەی یەکگرتووی شۆڕشگێڕان) ٪۲. ۲ی دەنگەکانیان بەدەستهێنا و هیچ کورسییەکیان بەرنەکەوت.

ئەمڕۆ ئیشمایل لە شاری نیویۆرك لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیشتەجێیە. ئەوکاتەی تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو، بەرەو ئەوێ کۆچی کرد. خوێندنی زانستە سیاسییەکانی لە کۆلێجی ئۆبیرلین تەواوکردووە، پاشان بۆتە ئەندامی (هیومان ڕایتس وۆچ) بۆ داکۆکی کردن لە مافی منداڵان. لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان و چەندین بۆنە و کۆبوونەوە، وتاری پێشکەش کردووە.

(ڕێگایەکی دووردرێژ)ی بیبە، یەکێکە لە کتێبە هەرە شاکارەکان تا ئێستا خوێندبێتمەوە. خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئازاربەخش بوو،

لەهەمانکاتدا دڵخۆشم کە لەگەڵی مامەوە. بیبیە بە زمانێکی زۆر ڕەوان و ئاسان بەسەرهاتەکەی دەگێڕێتەوە، کە هەست دەکەیت لە بەرامبەرت دانیشتووە و بەدەم کوپێك چاوە بۆت دەدوێت. بیبیە پارێزگاری لە یەکڕیزیی بەسەرهاتەکە کردووە، سەرەتا بە ژیانی ناو گوندەکەی لەگەڵ هاوڕێکانی و پاشان خولیای بۆ سەمای هیپ هۆپ و دواتر لەدەستدانی خێزانەکەی و بوون بە سەرباز و لە کۆتاییدا بە کۆچکردن بەرەو دەڤەری ئاشتی کۆتایی بە چیرۆکەکەی دەهێنێت. ئەم کتێبە پەیامێکی گرنگ لەخۆ دەگرێت، تەنها پەنجە بۆ منداڵانی سیرالیۆن ڕاناکێشێت، بەڵکو بۆ هەموو منداڵانی جیهانە کە بەدەست جەنگەوە دەناڵێنن. بیبیە ڕووداوەکانی دە ساڵ لەمەوپێش وەك دوێنێ باس دەکات. کاتێك ئەم کتێبەم خوێندەوە تەمەنم حەڤدە ساڵ بوو، ئیشمایل-یش کاتێك لەو بارودۆخەدا دەژیا هاوتەمەنی من بوو. ئەوکات نەمدەتوانی تەنانەت بە وێنەش ژیانی خۆم وەك ژیانی بیبیە بهێنمە بەر ئاوێنەی بیرم. ئەم چیرۆکە بە ترسی ڕاستەقینەی ئاساندم، لەگەڵ گوێگرتن لە بیبیە منیش بە ژیانی جەنگ ئاشنابووم. بیبیە بە دەنگێکی دیار و جیا لە هەموو دەنگەکانی تر دەدوێت و شتگەلێکی ئەوەندە سامناك ئاشکرا دەکات کە چۆك بە مرۆ دەدات لە بەردەم یەزداندا بۆ سوپاسکردنی ئەو ژیانەی پێی بەخشیووە.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بە هەوڵ و ماندووبوونی بەڕێز (ئەیوب سابیر) بکەم و زۆر سوپاسی بکەم...

شێنێ بۆسکانی

٢٠١٢

## نیویۆرک ۱۹۹۸

ئێستا، هاوڕێکانی دراناوەندیی بە گومـانن لـێم. ئاشـکرایە چـیرۆکی تەواوی ژیانم نازانن و نەیانبیستووە.

- "لەبەرچی (سیرالیۆن)ت جێهێشت؟"
- "لەبەر جەنگ".
- "کە هاتیتە ئێرە شایەتی ئەوەت دا؟"
- "ئەوەی لەو وڵاتە ژیابێت دەتوانێت".
- "مەبەستت ئەوەیە بە ئاشکرا خەڵکت دەبینی بە چەکەوە تەقـە لـە یەکتر بکەن؟"
- "بەڵێ، هەموو کات".
- "سەرنجڕاکێشە!"

بزەیەکم کرد.

- "پێویستە چیرۆکی ژیانی خۆتمان بۆ باس بکەیت".
- "بەڵێ، پێویستە...".

# یەک

چەندەها جۆر چیرۆکی شەڕ و کوشتارمان بۆ دەگێڕدرایەوە. چیرۆکەکان وا•دەردەکەوتن لە وڵاتانی دوور لە ئێمە و جیاواز ڕوویان دابێت. تا ئەوکاتەی ئاوارە و پەنابەرەکان هاتنە شارۆچکەکەی ئێمە، ئەوکات زانیمان ئەو چیرۆکانەی بۆمان گێڕدرابوونەوە، خەریکە دەبنە ڕاست و بەشێك لە ژیانی وڵاتەکەمان. ئەو خێزانانەی چەندین میل ڕێیان بڕیبوو بۆیان باسکردین چۆن یاخیبووەکان ماڵ و حاڵیان گرتێبەرداون و خێزانەکانیان کوشتوون. هەندێ لە خەڵکی هەستی بەزەییان بەرامبەریان خرۆشا و جێی مانەوەیان پێدان، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون، چونکە دەیانوت هەر زوو جەنگ شارۆچکەکەی ئێمەش دەگرێتەوە. منداڵەکانیان سەیریان نەدەکردین. دەچوونە سەربانە بە کانزا رووپۆشکراوەکان و بازیان هەڵدەدا و دەنگیان لەو وردە تەختە و بەردانە دەهێنا کە لە چەڵەمی منداڵانەوە کەوتبوونە خوارەوە. پیرەکانی شارۆچکەکەم قسەیان لەگەڵ ئاوارەکان دەکرد، لە کاتێکدا ئەوان لەناو منداڵەکانیاندا نوقمی خەیاڵ بووبوون. بێ خۆراکی و لەش داهێزرانیان نیشانە بوو بۆ ئەو دیمەنانەی بینیبوویان، چەند دیمەنێك کە جێی باوەڕ نەبوو، گەر پێمان بوترایە. هەندێك جار پێم وابوو ئەو چیرۆکانە دوور لە ڕاستی و پێوەنراون. تەنها جەنگ من بینیبێتم لە فیلمەکانی ڕامبۆ و فێست بلەد بوو، یان ئەو چیرۆکانەی لە خوێندنگە بیستبوومن.

پێشتر له هەواڵەکانی "BBC" چەند شتێکم دەربارەی لایبریا-ی دراوسێ بیستبوو، بەڵام خەیاڵی مێشکێکی تەمەن دە ساڵان توانای تێگەیشتنی شتگەلێکی نەبوو کە خۆشبەختی ئاوارەکانی فڕاندبوو.

***

بۆ یەکەمین جار بە شەڕ ئاشنابووم، تەمەنم دوانزە ساڵ بوو. مانگی جانیوەری ۱۹۹۳. ئەو کات لەگەڵ براکەم جوونیەر و هاوڕێکەمان تالۆی، کە هەردووکیان ساڵێك لە من گەورەتر بوون، ماڵەوەمان جێهێشت تا بچینە شارۆچکەی (ماتروجۆنگ) و بەشدار بین لە فێستیڤاڵی پیشاندانی بەهرەکان، ئەو ساڵە هاوڕێیەکمان تێیدا بەشداربوو. محەمەد کە خۆشەویستترین و نزیکترین هاوڕێم بوو، نەیتوانی لەگەڵمان بێت، ئەو ڕۆژە پێویست بوو یارمەتی باوکی بدات بۆ چاککردنەوەی قامیش و زەل و پووشی سەقفی موبەقەکەیان.

ئەوکاتەی تەمەنم هەشت ساڵان بوو، ئەو چوارەمان گرووپێکی گۆرانی ڕاپمان پێکهێنابوو. باوکم لە کۆمپانیایەکی ئەمریکی لە مۆبیمبی کاری دەکرد، مۆبیمبی جێی ژیانی ئەو بێگانانە بوو کە بۆ کۆمپانیاکە کاریان دەکرد، باوکیشم یەکێك بوو لەوان... زوو زوو دەچووین بۆ شوێنی کارەکەی تا سەیری تەلەفزیۆنە گەورە ڕەنگاوڕەنگە بکەین و لە مەلەوانگەکەدا مەلە بکەین و خەڵکە سپی پێستەکان ببینین کە شوێنی حەوانەی میوانەکانیان قەرەباڵغ کردبوو. ئێوارەیەکیان لە کلیپێکی گۆرانی

ژمارەیەك كوڕی ڕەش پێستی پیشان دا، كە زۆر بە خێرایی دەدوان. هەرچوارمان دەورمان لێدا و مەراقمان بوو بزانین چی دەڵێن.

لە كۆتایی گۆرانییەكە چەند نووسینێك لە خوارەوەی شاشەكە دەركەوت "شوگەهیلّ گانگ، ڕاپەرس دیلایت". جوونیەر بە خێرایی لەسەر پارچە كاغەزێك نووسی. پاش ئەوە، هەموو هەفتەیەك دەچووین بۆ (مۆبیمبی) تا ئەم جۆرە گۆرانییانە ببینین. ئەوكاتە نەماندەزانی ناوی ئەجۆرە گۆرانییانە چین، بەلاّم سەرم لەو ڕاستییە سوڕمابوو كە ئەو ڕەش پێستانە ئینگلیزییەكی خێرا قسە دەكەن لەسەر ڕیتمی گۆرانییەكە.

دواتر، پاش ئەوەی جوونیەر چووە خوێندنگەی ناوەندیی، هاوڕێیەتی چەند كوڕێكی كرد، كە ئەوان شارەزای گۆرانی و سەمای بیانی بوون و جوونیەریشیان فێركرد. بە درێژایی كاتی پشوو كاسێتی بۆم دەهێنایەوە و من و هاوڕێكانی فێری سەما دەكرد، كە دواتر پێی ناشنا بووین. پێی دەوترا هیپ-هۆپ. دڵخوازی ئەو جۆرە سەمایە بووم، جگە لەوە چێژم لە وشەكان وەردەگرت، وشەی ناو گۆرانییەكان هاندەرێكی باش بوون تا ئینگلیزییەكەم باشتر بێت و وشەی نوێ فێربم. دوانیوەڕۆیەك، باوكم گەڕایەوە ماڵەوە لەوكاتەدا من و محەمەد جوونیەر و تالۆی فێری دێڕێك لە گۆرانی ئێریك بی& راكیم دەبووین. باوكم لەتەنیشت دەرگای خانووە خۆنەگرە گڵێنەكە و سەقف ئاسنینەكەمانەوە وەستابوو، پێدەكەنی و پرسی "خۆتان تێدەگەن لەوەی دەیڵێن؟" پێش ئەوەی جوونیەر وەلاّم بداتەوە،

باوکم ڕۆیشت و لەسەر جۆلانەکە لـەژێر درەختـەکانی مـانگۆ و گواڤـا* و پرتەقاڵ دانیشت و ڕادیۆکەی خستە سەر هەواڵەکانی BBC.

پاشان لە حەوشەکەوە هاواری کرد "ئەمە ئینگلیزییەکی چاکە، ئەمە ئەو جۆرە ئینگلیزییەیە کە پێویستە گوێی لێ بگرن".

کاتێك باوکم گوێی لە هەواڵەکان دەگـرت، جوونیـەر فێـری دەکـردین چۆن قاچەکانمان لەگەڵ ڕیتمی گۆرانییەکـە بجـوڵێنین. لـە پێشـدا قاچـی چەپمان و دواتر قاچی ڕاستمان بۆ پێشەوە دەبرد، هەمان شتمان بە قۆڵمـان دەکرد، بەشی سەرەوی لەشمان و سەرمان لەگەڵیدا ڕادەوەشـاند، جوونیـەر وتی: "ئەم جووڵەیە بە (پیاوی ڕاکردوو) ناسراوە". پاشان ئەو گۆرانییانەی لەبەرمانکردبوون دەمانوتنەوە و لە هەمان کاتدا سەماکەیمان دەکرد.

دەمەو ئێوارە، پێش ئەوەی دەست بە کارەکانمان بکەین، کە بریتی بوون لە ئاوهێنان و پاککردنەوەی چراکان، بۆ ماڵئـاواییکردن ئـەو وشـانەمان بەکاردەهێنا کە لە گۆرانییەکانەوە فێری ببـووین. لـە دەریشـەوە دەنگـی گۆرانیوتنی سیسرکەکان و باڵندەکان دەستی پێدەکرد.

***

ئەو بەیانییەی بەرەو (ماتروجۆنگ) بەڕێکەوتین، جانتاکانمان پڕ پـەڕاو کرد، کە تێکستی گۆرانییەکانمان تیایاندا نووسیبوونەوە. گیرفانەکانمان پـڕ شریتی ڕاپ کرد. ئەو ڕۆژانە پانتۆڵی کاوبۆی دەڵب و شۆڕمان لەبـەردەکرد

---

*گواڤا: درەختێکە بەرەکەی لە هەرمێ دەچێت. ڕاستەوخۆ دەخورێت، یان دەکرێت بـە مرەبا.

و لەژێریشەوە شۆرتی یاریی فووتبۆڵ و گۆرەویمان لەپێدا بوو. لەژێر بلوزە قۆڵ درێژەکانمان فانیلە و تیشێرت و پاشان بەسەریاندا تیشێرتی فووتبۆڵمان لەبەر دەکرد. سێ جووت گۆرەویمان لەپێ دەکرد و لەناو کالەکانمان تۆپەڵمان دەکردن تا فش دەربکەون. کاتێك بە ڕۆژ گەرم بووایە، هەندێك لە جلەکانمان دادەکەند و بەسەر شانمانەوە هەڵمان دەخستن. ئەو ڕۆژانە لەبەرکردنی ئەم جۆرە جلوبەرگە باو بوو.

نەماندەزانی ئەم جۆرە جلوبەرگە نامۆیە سوودمان پێدەگەیەنێت. ئەو ڕۆژەی بەرەو (ماتروجۆنگ) بەڕێکەوتین، ماڵئاواییمان لە کەس نەکرد، وامان دانابوو بۆ ڕۆژی دوایی دەگەڕێینەوە، بەڵام نەمانزانی دوای جێهێشتنمان هەرگیز ناگەڕێینەوە.

تا پارەکانمان بەفیڕۆ نەدەین، بڕیارمان دا شانزە میل بە پێ ببڕین بەرەو (ماتروجۆنگ). ڕۆژێکی خۆشی هاوین بوو، تیشکی خۆر زۆر گەرم نەبوو، هەستمان بە دووروودرێژی ڕێگاکەش نەدەکرد. دەربارەی هەموو شت دەمانوت پێدەکەنین و گاڵتەمان دەکرد، یەکترمان ڕاوەدنا. هەریەکەمان دارلاستیکمان بەدەستەوە بوو نیشانەمان لە باڵندەکان دەگرتەوە و مەیموونەکانمان ڕاودەنا، کە لە هەوڵی پەڕینەوەدا بوون بەسەر ڕێگا سەرەکییە قووڕاوییەکە. لە چەند ڕووبارێك لامان دەدا بۆ مەلەکردن. لە ڕووبارێك کە پردێکی بەسەرەوە بوو، گوێمان لە دەنگی ئۆتۆمبێلێکی گواستنەوە بوو لەوپەڕی پردەکەوە، هەرزوو هاتینە دەرەوە لە ئاوەکە تا دەستی لێڕاگرین و بەخێرایی بمانگەیەنێت. لەپێش جوونیەر و تالۆی لە ئاوەکە هاتمە دەرەوە و بەخێرایی جلەکانیانم هەڵگرت و ڕامکردە سەر

پردەکە. ئەوانیش بەدوامدا ڕایانکرد وایانزانی دەمگرنەوە، مەحاڵ بوو، ڕایانکردەوە ناو ڕووبارەکە، هێشتا لە ناوەڕاستی پردەکە بوون کە ئۆتۆمبێلەکە گەیشت، کچەکانی ناو ئۆتۆمبێلەکە پێدەکەنین و شۆفێرەکەش دەستی کرد بە هۆڕین لێدان. ڕۆژێکی پێکەنینئامێز بوو، بەدرێژایی گەشتەکە لە هەوڵی تۆڵەسەندنەوەدا بوون، بەڵام نەیانتوانی.

نزیکەی کاژێر دووی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە کاباتی، ئەو دێیەی نەنکمی تیا دەژییا. نەنکم بە مامیی کپانا ناسرابوو. ژنێکی باڵابەرز بوو، دەموچاوە درێژەکەی لەگەڵ ڕوومەتە جوانەکانی و چاوە گەورە قاوەییەکانی گونجابوو.

هەمیشە بەوەستانەوە دەستەکانی لە پشتییەوە دادەنا، یان دەیخستنە سەر سەری. هەرکات سەیرم دەکرد دەمزانی دایکم ئەو ڕەنگە جوانەی پێستی لەگەڵ دانە سپییەکانی لە کێ وەرگرتووە، ئەویش کتومت وەك نەنکم چەند چرچییەك لە ملیدا هەبوو.

باپیرەم یان کامۆر- واتە مامۆستا، هەموو کەس بەو ناوە بانگی دەکرد. مامۆستای ناوداری زمانی عەرەبی بوو، لەهەمان کاتدا تیمارکەریش بوو لە گوندەکە و دەوروبەری.

لە کاباتی، نانمانخوارد و کەمێك پشوومان دا و بڕیاربوو دەرچین. نزیکەی شەش میل ڕێ مابوو تا بگەینە (ماترجۆنگ). نەنکم داوای لێکردین شەو بمێنینەوە، پێمان وت بۆ ڕۆژی دواتر دەگەڕێینەوە.

نەنکم بە دەنگێکی نەرمونیانی غەم ئامێزەوە پرسی "باوکتان لەگەڵتان چۆنە؟ لەبەر چی دەچن بۆ (ماتروجۆنگ) ئەگەر بۆ خوێندن

نییە؟، یان بۆ ئەوەندە لاواز دێیتە بەرچاو؟" بەردەوام بوو لە پرسیارکردن، بەڵام خۆمان لە پرسیارەکانی دەرباز کرد. تا کۆتایی قەراغ گوندەکە لەگەڵمان هات. پاشان ڕاوەستا و چاودێری کردین تا بە گردەکەدا هاتینە خوارەوە، گۆچانەکەی گواستەوە بۆ دەستی چەپی و دەستی ڕاستی ڕاوەشاند و ماڵئاوایی لێکردین.

دوای دوو کاژێر گەیشتینە (ماتروجۆنگ). لەوێ چاومان بە چەند هاوڕێیەکی کۆنی خۆمان کەوت. گابریلا، کالۆکۆ و خالیلۆو.

ئەو شەوە چووین بۆ شەقامی (بۆ). لەوێ دووکاندارەکان تا درەنگ خواردەمەنییان دەفرۆشت. فستقی کولاومان کڕی و دانیشتین و باسی پلانەکانمان کرد بۆ ڕۆژی دواتر تا فریای فێستیڤاڵەکە و مەشقکردنیش بکەوین. ئەو شەوە لە دالآنەکەی ماڵی خالیلۆو ماینەوە. ژوورێکی بچووکی تیا دروستکرابوو، لەگەڵ چرپایەکی بچووك کە هەرچوارمان لەسەری خەوتین (گابریلا و کالۆکۆ گەڕابوونەوە ماڵەوە). بە ئاستەم جێمان دەبووەوە، بەخواری ڕاکشابووین و قاچەکانمان بەرزکردبووەوە. لەبەر ئەوەی من بچووکتر و کورتتر بووم لە کوڕەکانی تر، توانام هەبوو قاچەکانم بجولێنم.

ڕۆژی دواتر، من و جوونیەر و تالۆی لە ماڵی خالیلۆو ماینەوە و چاوەڕێی هاوڕێکانی ترمان بووین تا لە خوێندنگە بگەڕێنەوە. کاژێر دوو، کاتی گەڕانەوەیان بوو، بەڵام ئەوان زوو گەڕانەوە. من سەرقاڵی پاککردنەوەی کالەکانم بووم، هاوکات جوونیەر و تالۆی شناویان دەکرد و منیش بۆم دەژماردن، پاشان گابریلا و کالۆکۆش هاتنە دالآنەکە و

ئەوانیش دەستیان پێکرد. تالۆی کە هەناسەی سواربوو بـوو بـە هێواشـی پرسی، بۆ وا زوو گەڕاونەتەوە. گـابریلا ڕوونـی کـردەوە کـە یاخیبووەکـان هێرشیان کردووەتە سەر شارۆچـکەکەی ئێمـە (مۆگبویمـۆ)، لەبـەر ئـەوە خوێندنگـە ڕاگـیاوە تـا ڕاگەیاندننامەیـەك بلاوەکرێتـەوە. هـەر ئـەم قسەیەمان بیست هەموومان کارەکانمان وەستاند.

بەپێی وتەی مامۆستاکان، یاخیبووەکـان ئـەو دوانیوەڕۆیـە هێرشـیان کردبووە سەر ئەو ناوچانەی کانزاکاریی تێدا دەکرێت. دەنگی زرمەی تەقـە وای لە خەڵکەکە کردبوو وەك تیر پڕ بسەنن و لەپێناو ژیانیاندا بە هەموو لایەکدا بۆی دەرچن. باوکان لەسەر ئیشەکانیان بە ڕاکـردن بـەرەو ماڵـەوە ڕایانکردووە تا لەبەردەم خـانووە چـۆڵەکانیان بوەسـتن، بـێ ئـەوەی بـزانن خێزانەکانیان بەرەو کوێ ڕۆیشتوون. دایکان بە گریانەوە بەرەو خوێندنگە و ڕووبارەکان ڕۆیشتوون بە شوێن مندالەکانیان. منداڵـەکان بـەرەو ماڵـەوە ڕایانکردووە، هاوکات دایك و باوکیان لەسەر شەقامەکان بەدوای ئەوانـدا گەڕاون. هەر دەنگی تەقە نزیکبووەتەوە، خەڵکی وازیان لە گەڕان بە دوای کەسە نزیکەکانیان هێناوە و ڕایانکردووەتە دەرەوەی شارۆچکەکە.

گابریلا خۆی لەسـەر زەوییـە چـیمەنتۆکە بـەرزکردەوە و وتـی: "ئـەم شارۆچـکەیەش سـەرەی هـاتووە". مـن و تـالیۆ و جوونیـەر جانتاکانمـان کۆکردەوە و لەگەڵ هاوڕێکانمان چووینە کەنار ڕووبارەکـە. لـەوێ خـەڵکی لەو ناوچانەی هێرشکرابووە سەریان، بـە کەشـتی دەهاتنـە مـاتروجۆنگ. هەندێکمان دەناسین، بەڵام نەیانتوانی هیچ هـەواڵێکی خێزانـەکانمان پـێ

بلێین، ئەوان وتیان هێرشەکە ئەوەندە لە هێکرا و پەشێو بوو، خەڵکەکەی سەرلێشێواو کردبوو، هەریەکەو بەلایەکدا ڕایدەکرد.

نزیکەی سێ کاژێر لە کەنارەکە ماینەوە. چاوەڕێی خێزانەکانمان، یان بیستنی هەواڵێکیان بووین، بەڵام هیچ هەواڵێك نەبوو، دوای ماوەیەك ئەوانەی دەهاتن، دەبوونە کەسانی نامۆ و نەماندەزانی کێن. ئەو ڕۆژە زۆر ئاسایی بوو، خۆر لە پشت هەورە سپییەکانەوە سەوڵی لێدەدا فراوتێنی بوو. باڵندەکان لەسەر لقی درەختەکان گۆرانییان دەوت، درەختەکان بە ئاشەبایەکان سەمایان دەکرد. هێشتا باوەڕم نەدەکرد جەنگ ڕووی تێکردبێتین، لە دڵی خۆمدا دەموت ئەوە مەحاڵە! ڕۆژێك پێش هاتنمان هیچ ئاسەوارێکی یاخیبووەکان، یان جەنگ نەبوو.

گابریلا پرسی "بەتەمان چی بکەن؟" هەموومان بێدەنگ بووین، پاشان تالۆی بێدەنگییەکەی شکاند "پێویستە بگەڕێینەوە تا درەنگ نەبووە خێزانەکانمان بدۆزینەوە". من و جوونیەر سەرمان لەقاند و قسەکەیمان پەسەند کرد.

***

سێ ڕۆژ پێش هاتنمان بۆ (ماترجۆنگ) باوکمم بینیبوو، بە کاوەخۆ بەرەومالەوە دەگەڕایەوە. کلاوە ڕەقەکەی لە بن باڵیدا دانابوو و دەموچاوە درێژەکەی لەبەر گەرمای ئەو پاش نیوەڕۆیە ئارەقی لێدەتکا. من لە دالانەکە دانیشتبووم. ماوەیەك بوو نەمبینیبوو، باوەژنەکەم دووبارە بەینمانی تێکدابوو، بەڵام ئەو بەیانییە باوکم هەر لە قادرمەکانەوە

بزەیەکی تێگرتم. لە ڕووخسارم وردبووەوە و بە لێوەکانیدا پێدەچوو بییەوێت شتێك بڵێت، لەوکاتەدا باوەژنەکەم هاتە دەرەوە و وا خۆی نیشان دا کە من نابینێت، باوکیشم ڕووی وەرگێڕایە سەر باوەژنەکەم و هەردووکیان بە بێدەنگیی چوونە ژووری میوانەکە. زۆرم لەخۆم کرد نەگریم، لە دالآنەکە هاتمە خوارەوە و چوومە ئەو جێیەی لەگەڵ جوونیەر دەستنیشانمان کردبوو تا پێکەوە چاوەڕێی لۆرییەکە بکەین. بەڕێکەوتین بۆ بینینی دایکمان کە سێ میل لە شارۆچکەکەی تر دەژیا. پێشتر باوکمان پارەی خوێندنی بۆ دەداین، لەبەر ئەوە هەموو کۆتایی هەفتەیەك دایکمان دەبینی، بەڵام باوکمان بڕیاری دابوو چیتر پارەی خوێندنمان نەدات، بۆیە هەموو دوو یان سێ ڕۆژ جارێك سەردانی دایکمان دەکرد.

ئەو دوانیوەڕۆیە دایکمان لە بازاڕەکە بینی سەرقاڵی کڕینی کەرەسەی خواردەمەنی بوو، تا خواردنمان بۆ دروست بکات. ئێمەش دوایکەوتین. سەرەتا ڕووخساری هیچ هەستێکی تیا بەدی نەدەکرا، بەڵام هەرکات باوەشی پیاماندا دەکرد، ڕووخساری لە خۆشیدا بریسکەی دەهات. پێی وتین برا بچووکەکەم ئیبراهیم لە خوێندنگەیە و لەسەر ڕێگەکەمان دەچین بەدوای ئەویشدا. دایکم دەستی گرتین و بەڕێکەوتین. بە درێژایی ڕێگاکە زوو زوو ئاوڕی دەدایەوە تا دڵنیابێت هێشتا بە دوایەوەین.

بەرەو خوێندنگەکەی ئیبراهیم کەوتینە ڕێ، دایکم ئاوڕی دایەوە و پێی وتین: "دەبێت ببوورن، پارەم نییە تا بتانخەمەوە بەر خوێندن، بەڵام هەوڵتان بۆ دەدەم".

کەمێك وەستا، پاشان پرسی "باوکتان تەندروستی چۆنە؟"

جوونیەر هیچی نەوت، من وەڵامم دایەوە "باشە، ئەمڕۆ پێش ئەوەی بگەڕێینەوە بینیم".

دایکم چاوی بڕییە چاوەکانی جوونیەر و وتی: "باوکتان پیاوێکی باشە، ئێوەی زۆر خۆش دەوێت، ڕەنگە تەنها باوەژنێکی خراپی بۆ هەڵبژاردبێتن".

لە خوێندنگەکە، برا بچووکەکەمان بینی لە حەوشەکە لەگەڵ هاورێکانی یاریی فووتبۆڵی دەکرد. هەرچەندە تەمەنی هەشت ساڵان بوو، بەڵام زۆر باش یاریی دەکرد. هەر ئێمەی بینی بەڕاکردن هاتە لامان و خۆی هەڵدا بەسەرماندا. پاشان لە تەنیشتمەوە ڕاوەستا و خۆی دەپێوا تا بزانێت باڵای لە من بەرزتر بووە؟

دایکم دەستی کرد بە پێکەنین. ئیبراهیم ڕووخسارێکی خڕی درەوشاوەی هەبوو، نارەق بە دەموچاو و چرچییەکانی ملی کە وەك دایکم بوو، زەنگۆڵەی بەستبوو. هەرچوارمان گەڕاینەوە ماڵی دایکم. لە ڕێگا دەستی ئیبراهیمم گرتبوو، ئەویش باسی قوتابخانەی بۆ دەکردم و گرەوی بردنەوەی یاریی فووتبۆڵی لەگەڵ دەکردم.

دایکم بە تەنها دەژیا و ژیانی خۆی بۆ ئیبراهیم تەرخان کردبوو. پێی وتین ئیبراهیم چەند جارێك داوای بینینی باوکی کردووە، کاتێك من و جوونیەر لە خوێندنگە بووین، دایکیشم چەند جارێك ئیبراهیمی بردووە بۆ بینینی باوکی، هەرکات یەکتریان بینیوە، دایکم دەستی کردووە بە گریان، چونکە ئەو دووانە زۆر دڵیان بە بینینی یەکتر خۆش بووە. کاتێك دایکم ئەم باسەی دەگێڕایەوە، نووقمی خەیاڵ ببوو، جار بەجاریش زەردەیەکی دەکرد.

دوو ڕۆژ دوای ئەوەی سەردانی دایکمان کرد، بەرەو ئەو شوێنە هاتین کە ئێستا تیایدا وەستاوین. لە ڕۆخی ڕووبارەکە ڕاوەستابووین، باوکمم دەهێنایەوە بەرچاوی خۆم کە کڵاوە ڕەقەکەی لەبن باڵی هەلگرتووە و بە ڕاکردن دەگەڕێتەوە ماڵەوە، دایکیشم بە گریان ڕادەکات بۆ قوتابخانەکەی ئیبراهیم. لەم جۆرە بیرکردنەوانەدا هەستێکی پڕ لە ترسم لێنیشت.

من و جوونیەر و تالۆی بازمان هەڵدایە بەلەمێکی بچووکەوە. لە کەنارەکانی (ماتروجۆنگ) دووری خستینەوە و بە غەمبارییەوە ماڵئاواییمان لە هاوڕێکانمان کرد. گەیشتینە ئەوبەری ڕووبارەکە، خەڵکی زیاتر گەیشتن و بەپەلە پەڕینەوە. کەوتینە ڕێ، ژنێك نەعلەکانی بەسەرییەوە هەڵگرتبوو، بێ ئەوەی سەیرمان بکات قسەی دەکرد "ئەو شوێنەی بۆی دەچیت خوێنێکی زۆری لێڕژاوە. تەنانەت ڕۆحە پاکەکانیش لەو شوێنە هەڵاتوون"، بەلاماندا تێپەڕی. لەناو دەوەنەکان بە درێژایی ڕووبارەکە، دەنگی هاواری ژنان بەرزبووەوە. "ئەی خودا یارمەتیمان بدە..."، پاشان منداڵەکانیان بانگ دەکرد "یوسف... جابوو... فۆدەی..." منداڵان بە گریانەوە بە تەنها ڕایاندەکرد و تەنها جلی ژێرەوەیان لەبەردابوو، بانگی دایك و باوکیان دەکرد. چەند سەگێکیش بەناو خەڵکەکەدا ڕایان دەکرد. بۆنیان دەکرد و بەدوای خاوەنەکانیان دەگەڕان. هەستم دەکرد دەمارەکانی لەشم توند دەبنەوە.

شەش میلیی ترمان بڕی و گەیشتینەوە کاباتی. ئەو دێیەش وەك بیابانێکی دزێوی لێهاتبوو. ئەوەی جێمابوو، جێ پێیەکان بوو کە بەرەوە دارستانە چڕوپڕەکە کشابوون. کە دەکەوێتە پشتی دێیەکەوە. دەمەوئێوارە

خەڵكى زياتر لەو ناوچانەى هێرشيان كرابووە سەر، گەيشتن. دەنگى چرپە و گريانى منداڵان بەدواى دايك و باوكە ونبووەكانيان و دەنگى قيژە جەرگبڕەكانى منداڵە برسى و هيلاكەكان دەستپێكى ئەو ئێوارەيە بوون، لەبرى گۆرانى وتنى باڵندەكان و سيسركەكان.

ئەو ئێوارەيە لە داڵانە چۆڵەكەى ماڵى نەنكم دانيشتين و گوێمان دەگرت و چاوەڕێ بووين.

جوونيەر پرسى "كوڕينە پێتان چۆنە بگەڕێينەوە بۆ مۆگبويمۆ؟"پێش ئەوەى كەسمان وەڵام بدەينەوە، دەنگى ئۆتۆمبێلێك لە دوورەوە هاتە، بەرگوێمان. خەڵكەكە هەموويان ڕايانكردە نزيك دەوەنەكان، ئێمەش لەگەڵيان ڕۆيشتين، بەڵام زۆر دوور نەكەوتينەوە. هەناسەم سوار بوو، دڵم خێراتر لێى دەدا. ئۆتۆمبێلەكە لەبەردەم ماڵى نەنكم وەستا و ئەوەى لەناو ئۆتۆمبێلەكە بوو، چەكى پێ نەبوو. ئێمە و خەڵكەكە نزيكتربووينەوە، پياوێكمان بينى لە جێگاى شۆفێرەكەوە دابەزى و چووە لايەكى ڕێگەكە، خوێنى لە دەمييەوە هێنايەوە. قۆڵى خوێنى لێ دەتكا. كاتێك لە ڕشانەوە وەستا، دەستى كرد بە گريان. ئەوە يەكەمين جارم بوو پياوێك ببينم وەك منداڵ بگرى. هەستم دەكرد دەرزييەك بە دڵمدا دەچەقێنن. ژنێك چووە لاى پياوەكە و دەستى لە ملى كرد و لێى پاڕايەوە تا هەستێتەوە سەرپێ. پياوەكە هەستايەوە و بەرەو ئۆتۆمبێلەكە ڕۆيشت، دەرگاى لاى شۆفێرى كردەوە و ژنێك كە پاڵى دابوو بە دەرگاكەوە، لەگەڵ كردنەوەى دەرگاكە، كەوتە خوارەوە و خوێن لە گوێچكەى هات. خەڵكى چاوى منداڵەكانيان گرت.

پشتی ئۆتۆمبێلەکە سێ لاشەی مردووی تری تێدا بوو، لاشەی دوو کچ و کوڕێك. خوێن لەناو کوشن و سەقفی ئۆتۆمبێلەکە چۆڕاوگەی بەستبوو. دەمویست خۆم لەو دیمەنانە بەدوور بگرم، بەڵام نەمدەتوانی. قاچەکانم بێ هەست ببوون و هەموو لەشم بەستبووی. دوایی تێگەیشتین ئەو پیاوە ویستوویەتی لەگەڵ خێزانەکەی هەڵبێت، بەڵام یاخیبووەکان تەقەیان لە ئۆتۆمبێلەکەی کردووە و هەموو ئەندامانی خێزانەکەییان کوشتووە. تەنها شت کە بۆ چەند ساتێك ئارامی پێ بەخشی، ئەو کاتە بوو کە ژنەکەی هەڵیگرتەوە، بە گریانەوە پێی وت بەلانی کەمەوە دەتوانێت خۆی بیبیانێژێت و شوێنەکەیان بزانێت.

پێدەچوو ئەو ژنە لە هەموومان زیاتر شارەزای بارودۆخی جەنگ بێت.

هەوای ئەو ڕۆژە کەمبووەوە، خۆر هەر زوو بە مانگی ڕاسپارد تا جێی بگرێتەوە. هەر خۆر ئاوابوو، خەڵکی زیاتر هاتنە گوندەکە. پیاوێك بە ڕاکردن کوڕە مردووەکەی بە باوەشییەوە گرتبوو، پێدەچوو نەیزانیبێت کوڕەکەی مردووە، خۆشی بە خوێنی کوڕەکەی داپۆشرابوو. قسەی بۆ کوڕەکەی دەکرد و پێی دەوت: "هەر زوو دەتبەم بۆ نەخۆشخانە، کوڕەکەم، هەموو شتێك باش دەبێت". ڕەنگە ئەو دەمە پێویستبوایە ئەو جۆرە هیوا و پەیمانانەی بدایە، گەرچی مەحاڵ بوو، بەڵام ئەم لەماوەی هەڵاتنەکەی بەم قسانە دڵنەوایی خۆی دەدایەوە.

ژمارەیەك ژن و پیاو کە هەموویان جێی فیشەك بە جەستەیانەوە بوو، بەلاماندا ڕایان دەکرد. پێستی جەستەیان شۆڕببووەوە خوارەوە، هێشتا خوێنی تازەی پێوە بوو. هەندێکیان سەرنجی برینەکانیان نەدابوو تا

ئەوکاتەی دەوەستن خەڵکەکە ئاگاداریان دەکردنەوە. هەندێکیان یان دەرشانەوە، یان لەهۆش خۆیان دەچوون. منیش هێڵنجم دەدا و سەرم گێژی دەخوارد، هەستم دەکرد هەموو ئەوانەی لە دەوروبەرمن دەخولێنەوە و هەموو لەشم کەوتە لەرزین.

دوایەمین کارەساتی ئەو ئێوارەیە، دیمەنی دایکێك بوو، منداڵەکەی بە پشتییەوە هەڵگرتبوو. لە دواوە تنۆکی خوێن دەتکا تا خوارەوەی کراسەکەی ڕێچکەی دروستکردبوو. لەو ماوەیەی لەپێناو ژیانیدا ڕایکردبوو، منداڵەکەی بەپشتییەوە تەقەی لێکرابوو، بەڵام بەختی هەبوو گولله ناو لەشی منداڵەکەی نەبڕیبوو، ئەگینا دەمێ بوو ئەمیش بەرکەوتبوو.

هاتە جێیەکەی ئێمە و لەسەر زەوییەکە دانیشت، منداڵەکەی خستە باوەشییەوە، کچێك بوو، هێشتا چاوەکانی کراوەبوون، زەردەخەنەیەك کە بێتاوانی و پاکی دەنواند، لەسەر لێوەکانی بوون. بەشێکی فیشەکەکە بە لەشە بچووکەکەیەوە دەبینرا و لەشی ئاوسابوو. دایکی بە توندی بە خۆیەوە نووساندبوو و ڕایدەژەند، ئەوەندە لە ئازار و مەینەتییدا بوو، توانای گریانی نەبوو.

من و جوونیەر و تالۆی سەیری یەکترمان کرد و زانیمان پێویستە بگەڕێینەوە بۆ (ماتروجۆنگ)، چونکە مۆگبوێمۆ جێی ژیان نییە و ئاستەمە دایك و باوکمان لەوێ مابن. هەندێ خەڵك دەیانوت کە گوایە کاباتی لە لیستی یاخیبووەکاندایە بۆ هێرشکردن. نەماندەویست لەوێ بمێنینەوە کاتێك یاخیبووەکان دێن. تەنانەت ئەوانەی بە ئاستەم دەیانتوانی

برۆن، هەموو هەوڵێکیان دەدا لە کاباتی نەمێنن. لە کاتی گەڕانەوە بۆ (ماتروجۆنگ) وێنەی ئەو دایکە و منداڵەکەی لە مێشکمدا چەسپیبوو. خەیاڵم لای گەشتەکە نەبوو، ئەوکاتەی ناوم دەخواردەوە هەستم بە ئارامی نەدەکرد، هەرچەندە تینوو بووم. چیتر نەمەویست بگەڕێمەوە بۆ ئەو جێیەی ئەو دایکەی لێبوو. زۆر بە ڕوونی لە چاوانی ئەو منداڵە دەبینرا کە تازە هەموو شت لەدەست دەرچووە.

***

هەرکات پرسیارم دەربارەی ژیانی دوای سەربەخۆیی سیرالیۆن دەکرد، لە ساڵی ١٩٦١ باوکم پێی دەوتم: "ئەو کات تۆ تەمەنت نۆزدە ساڵی ژێر سفر بوو". سیرالیۆن لە ساڵی ١٨٠٨ەوە لەژێر دەسەڵاتی بەریتانییەکاندا بوو. دواتر میلتۆن مارگای بوو بە یەکەمین سەرەك وەزیران و پارتی کۆمەڵانی خەڵکی سیرالیۆنی دامەزراند و سەرۆکایەتیی وڵاتەکەی کرد. تا ساڵی ١٩٦٤ گیانی سپارد. ئەو کات زڕبراکەی بە ناوی سێ ئالبێرت مارگای جێی گرتەوە تا ساڵی ١٩٦٧. تا ئەوکاتەی سیاکا ستیڤنس دامەزرێنەری پارتی یەککرتنی کۆمەڵانی خەڵك، هەڵبژێردرا، پاشان کودەتای بەسەردا کرا و دووبارە ساڵی ١٩٦٨ دەسەڵاتی گرتەوە دەست. دوای چەند ساڵێك بە فەرمی ڕاگەیەنرا وڵاتەکە لەژێر دەسەڵاتی یەك پارت دەبێت ئەویش پارتەکەی سیاکا ستیڤنس بوو. وەك و باوکم هەمیشە دیوت، ئەوە سەرەتای "دەسەڵاتە بۆگەنەکە" بوو. ئەی دەبێت چی بەم جەنگەی ئێستا بڵێت کە من لە دەستی ڕادەکەم؟

وەك لە گەورەكانم بیستبوو، ئەمە جەنگی شۆڕشگێڕەكانە، لەپێناو گەندەڵی و خراپی گوزەرانیان، بەڵام چ شۆڕش و ئازادی خوازییەكە ڕێگە بە كوشت و بڕی هاوڵاتییانی مەدەنی دەدات، منداڵان، ئەو كچە بچووكە؟ كەس نەبوو وەڵامی ئەم پرسیارانەم بداتەوە، تا دەهات سەرم قورستر دەبوو بەهۆی ئەو وێنانەی تیایدا چەسپ ببوون. بە ڕێگاوە بووین سڵم لە ڕێگاكە و شاخەكان و دەوەكانی ئەملا و ئەولای ڕێگاكەش دەكردەوە.

شەو درەنگ گەیشتینە (ماتروجۆنگ). جوونیەر و تالۆی باسی هەموو ئەو شتانەیان بۆ هاوڕێكانمان دەكرد كە بینیبوومان. منیش بت ئاسا مامەوە لە بیری ئەوەدا بووم ئەو دیمەنانەی بینیبووم خەون بوو، یان ڕاستی، بەم جۆرە بیركردنەوانە خەوم لە خۆم خست. ئەو شەوە لە خەوما فیشەكیان بە كەلەكەمەوە نابوو، خەڵكیش بێ ئەوەی یارمەتیم بدەن بەلاما تێدەپەڕین و لەبیری ژیانی خۆیاندا بوون. بە گاگۆڵكێ ڕۆیشتمە جێیەكی ئارام لەناو دەوەنەكاندا، لەناكاو كەسێك كە دەموچاوی بەهۆی تیشكی خۆرەوە دیار نەبوو. چەكەكەی ئاڕاستەی كەلەكەم كرد و میلی هێنایەوە. تۆقیوانە لە خەو ڕاپەڕیم دەستم گرت بە لا كەلەكەمەوە. ترسم لێنیشت، چیتر توانای جیاكردنەوەی خەون و ڕاستیم نەمابوو.

هەموو بەیانییەك لە (ماتروجۆنگ) دەچوورینەوە بۆ ڕۆخ ڕووبارەكە تا هەواڵی خێزانەكانمان بزانین. دوای هەفتەیەك هیچ هەواڵێك نەما، هیچ پەنابەرێكیش ڕووی لە ناوچەكە نەكرد. چەكدارەكانی دەسەڵات لە ماترجۆنگدا بڵاوكرابوونەوە. خاڵی پشكنین لە هەموو جێیە

ستراتیجییەکان و تەنانەت لە کەنار ڕووبارەکـە جێگیرکـران. سـەربازەکان داوایان لێکرابوو، هەرکات یاخیبووەکان هێرشیان کرد، ئـەمان بپەڕنـەوە ئەوبەری ڕووبارەکە. سەرباز و چەك و تەقەمەنی پێویست ئامادەکرا. کاژێر ٧ی ئێوارە هاتوچۆ قەدەغە کرا، ئەوەش شەوانی سامناکتر دەکرد. هەر زوو پێویست بوو بێینە ژوورەوە، خەویش لە چاومان نەدەکەوت. بۆ ڕۆژی دواتـر گابریلا و کالۆکۆ هاتن بۆ لامان، هەر شەشمان لـە دالآنەکـە دانیشـتین و باسمان لە ڕووداوەکان دەکرد.

جونیەر وتی: "لەو بڕوایەدا نیم ئەم شێتییە تا ماوەیەکی زۆر درێـژەی هەبێت". پاشان سەیری منی کرد وەك ئەوەی پێم بلێت بە زووتـرین کـات دەگەڕێینەوە ماڵەوە. تالۆی چاوی بڕیبووە زەوییەکە و وتی: "بە بڕوای مـن تا مانگێك، یان دوو مانگ درێژەی دەبێت".

گابریلا لەبەر دوودڵی و پەرۆشیی زمانی دەیگرت و وتی: "بیستوومە سەربازەکان هەر زوو یاخیبووەکان لە ناوچەکانزاکارییەکان ڕاودەنێن".

دواجار هەموومان پێمان وابوو ئەم جەنگە لە سێ مانگ تێپەڕ ناکات و کۆتایی دێت.

من و جوونیەر و تالۆی گوێمان لە گۆرانی ڕاپ دەگرت تا خۆمان لـەو بارودۆخە قووتار بکەین. ئەو کاتـەی لە ماڵ دەرچووین، تەنها کاسـێتەکان و جلەکانی بەرمان پێبوو. ئێوارەیەکیان لە دالآنەکە گوێم لە گۆرانییـەکی هێڤـی دی- زەبـۆیز دەگـرت، سـەیری سـەمای گـەڵاکاکانم دەکـرد و دارخورماکان لە پشتیانەوە ڕاوەستابوون، وەك ئەوەی چاوەڕێی شـتێك بـن.

چاوەکانم داخستن و دیمەنی کاباتی هاتە بەرچاوم، هەوڵم دا بیر لـە کابـاتی بکەمەوە پێش ڕوودانی جەنگ.

ئەو دێیەی دایەگەورە لێی دەژیا، لایـەکی دارسـتانێکی چـڕوپڕ بـوو، لاکەی تری کێڵگەی چاندنی قاوە بوو، بەشێك لە ئـاوی ڕووبارەکـە بـەناو دارستانەکەدا هێنرابووە قەراغ گوندەکـە، بـەناو تـۆوی دارخورماکـان تـا زەلکاوەکان دەبران. لەپشت زەلکاوەکە، دار مۆزەکان سەریان لە ئاسمان گیر کردبوو. ئەو ڕێگایەی بەرەو گوندەکـە دەکشـا، پـڕ لـە چاڵوچـۆڵی بـوو، هەندێك جاڕ پڕ ئاو دەبوون و دەبوونـە شـوێنی خۆشوشـتنی مراوییـەکان. لەپشت خانووەکانەوە باڵندەکان لەسـەر درەختـەکانی مـانگۆ هێلانـەیان کردبوو.

بەیانیان، خۆر لەپشت دارستانەکەوە هەڵدەهات. سەرەتا پـێش ئـەوەی خۆی بگات، تیشکەکانی لەپێش خۆیەوە بۆ ناو گەلاکان دەنارد. پاشان بـە یارمەتی کەڵەشێرەکان و باڵندەکان بە فەرمی ڕۆژ ڕادەگەیەنرا و خۆر وەك ئاڵتوون بەسەر دارستانەکەوە دەنیشت.

ئێواران مەیموونەکان لە دارسـتانەکەوە دەبینـران، بازیـان هەڵـدەدا و دەگەڕانەوە جێ خەوتنەکانیان. لە کێڵگەی قاوەکـان، مریشـکەکان لـەناو داڵەکان، سەرقاڵی شاردنەوەی بچکۆلەکانیان بوون. دارخورماکان لەپشـت کێڵگەکانەوە گەڵاکانیان بە کزەبای ئەو ڕۆژە دەجوڵاند. بڕێـك جـار دەمـەو ئێوارە خەڵکی بەسەر دارخورماکانەوە دەبینران و پەلکی دارخورماکانیـان دەبڕییەوە تا مەی و خواردنەوەی لێدروست بکەن*.

---

* لە هەندێك وڵاتانی ئەفریقا لە پەلکی دارخورما مەی دروست دەکرێت.

ئێواران بە دەنگی خشەخشی لقی درەختەکانی دارستانەکە و ڕژکردنی برنج بۆ ناو دەسکەوانەکان کۆتایی دەهات، کە بەناو گوندەکەدا دەنگی دەدایەوە و باڵندەکانی دەتۆقاند. بۆقەکان، سیسرکەکان و کورنەپەپووەکان، هەموویان داوای هاتنی شەویان دەکرد و دەگەڕانەوە بۆ جێی خەوتنەکانیان. دووکەڵ لە موبەقە بە قامیش داپۆشراوەکان بەرز دەبووەوە، خەڵکی وردە وردە بە چراکانیانەوە، یان ئەو دارانەی بۆ ئاگرکردنەوە بڕیبوویانەوە، دەگەڕانەوە ماڵەوە.

"پێویستە کۆشش بکەین تا وەکو مانگ بین". ئەمە وتەی پیاوێکی پیر بوو لە گوندەکە، هەرکات کەسێك بەلای ماڵەکەیدا بڕۆیشتایە بۆ کێڵگەکەی، یان هێنانی ئاو، ڕاوکردن، یان بڕینەوەی گەڵای دارخورماکان بۆ دروستکردنی مەی، ئەم وتەیەی پێ دەوت. جارێك لە نەنکمم پرسی تا مەبەستەکەیم بۆ ڕوون بکاتەوە. ئەو پێی وتم مەبەستی ئەوەیە، خەڵکی پێویستە هەمیشە ئەوەیان لەیاد بێت کە هەڵسوکەوتیان باشترین بێت و لەگەڵ دەوروبەردا باش ڕەفتار بکەن. پاشان وتی، کاتێك هەتاو دێت و گەرما لەگەڵ خۆی دەهێنێت، خەڵکی گلەیی لەو بارە دەکەن، هەرکاتێکیش باران ببارێت و سارد بکات، هەر گلەیی دەکەن، بەڵام هەموو کەس دڵخوازی ڕۆشنایی مانگە. هەرکەسە و لە دیدەی خۆیەوە مانگ دەبینێت و نرخی دەزانێت. منداڵان لەبەر سێبەرەکەی یاریی دەکەن، هەندێك خەڵك کۆدەبنەوە و چیرۆك دەگێڕنەوە و بەدرێژایی شەو سەما دەکەن. کاتێك مانگ دەدرەوشێتەوە، زۆر شتی دڵخۆشکەر ڕوودەدات. هۆکار زۆرە پاڵمان پێوەنێت وەك مانگ بین.

"پێدەچێت برسی بیت، هەندێك كاساڤات* بۆ ئامادە دەكەم". بەم ڕستەیە كۆتایی بە باسەكە هێنا. دوای ئەوەی ئەنكم باسی مانگی بۆ كردم، هەموو شەوێك لە دەرەوە ڕادەكشام و بە هێمنی سەیری مانگم دەكرد. هەمیشە دەمپرسی بۆ ئەوەندە سەرنجڕاكێشە! پاشان چەند وێنەیەكم لەناو مانگدا دروست دەكرد. جارێك وێنەی پیاوێك بوو، كەمێك ڕیشی هەبوو، كڵاوێكی دەریاوانیی لەسەردا بوو. جارێكی تر، پیاوێكم بینی بە تەورێكەوە داری دەبڕییەوە. جارێكی تر ژنێك بوو منداڵەكەی بە سنگییەوە نووساندبوو. ئێستاش هەركات سەیری مانگ دەكەم وەك ئەوكاتەی شەش ساڵان بووم، وێنەی جۆراوجۆر دەبینم. بەشێك لە یادگارییەكانی ئەو ساڵانە و مانەوەیان لەگەڵمدا، هەندێك سووكنایییان بە دڵم دەبەخشی.

---

* كاساڤا: ڕووەكێكی هارشێوەی پەتاتەیە. مەركەزی سەرەكی بەرهێنانی ئەفریقایە. كاساڤا ڕەگێكی درێژی نیمچە ڕەقی هەیە. داپۆشراوە بە توێكڵێك كە توانای لێكجیابوونەوەی هەیە، تیەكەی نزیكەی ١ملم دەبێت، ڕەنگی لە دەرەوە قاوەییەكی كاڵە بەلای بێجیدا دەڕوانێت.

## دوو

بۆنی خوێن و لاشەی سووتاو شارۆچکەکەی پڕ کردووە، منیش پاڵ بە دەستگیرێکی ژەنگاوییەوە دەنێم. هەوا دەنگی قیژەی ئەو کەسانە لەگەڵ خۆی دەهێنێت، کە دوایەمین هەناسەیان لە جەستە شێواوەکەیانەوە دەردەچێت. بەناو چەند کەسێکدا دەڕۆم کە قاچ و دەستیان لەدەست داوە، ئەندامەکانی ناو هەناویان کەوتووەتە سەر زەوییەکە و کێمی ناو مێشکییان لە لووت و گوێیانەوە پرژاوە. مێشەکان ئەوەندە دڵخۆشن لە دواجاردا مەست دەبن و دەکەونە حەوزی پڕ خوێناوەوە و دەمرن. لاشەکان چاوییان سوورتر لە خوێن دەنوێنێت. پێدەچێت ئێسکەکانیان لە چاوتروکاندنێکدا لە دەموچاوە جەڕێنراوەکانیانەوە تێکبشکێن. ڕوو وەردەگێڕمە سەر زەوییەکە تا سەیری کالەکانی پێم بکەم کە لە خوێندا گەوزاون، پێدەچێت ئەو خوێنەش لە پانتۆڵە سەربازییەکەمەوە ڕۆبچێتە ناویانەوە. ئەوەی ئازار بێت هەستی پێ ناکەم، لەبەر ئەوە دڵنیا نیم گەر برینداربم یان نا. تەنها جار بەجار هەست بە گەرمی (ئەی-کەی) یەکەی سەر شانم دەکەم، بە بیرم نایەت دوایەمین جار کەی بوو فیشەکێکم پێی تەقاندووە. هەست دەکەم دەرزییەك دادەچەقێنن بە مێشکمدا. ناستەمە شەو و ڕۆژ لەیەك جیابکەمەوە. ئەو دەستگیرەی پاڵی پێوەدەنێم، لاشەیەکی لەسەرە، کە لە چەند پارچە چەرچەفێکی سپییەوە پێچراوە و

بەرەو گۆڕستان دەبرێت. نـازانم لەبەرچـی تـەنها ئـەم لاشـەیە دەبـەم بـۆ گۆڕستان.

گەیشتمە گۆڕستان، ئێستا لاشەکە هەڵدەگرمە سەر زەوی، بەڵام چۆن؟ را دەردەکەوێت نەیەوێت بێتە خوارەوە، بەرەنگارم دەبێتەوە. هەرچۆنێك بێت بە باوەش هەڵیدەگرم و بەدوای جێیەکی گونجاودا دەگەڕێم تا بینێژم.

هەموو لەشـم تێکشـکاوە، لەگـەڵ جولاّنـدنی هـەر قاچـێکم تـەزووە نازارێك لە پەنجەکانی قاچمەوە تا بڕبڕەی پشتم دەسەپاچەم دەکات. لەگـەڵ هەڵگرتنی لاشەکە خۆم بەزەویدا دەکەوم. لاشەکە هەڵدەگرم و پەڵە خوێنی سوور بەسەر چەرچەفە سـپییەکانەوە بازنـەیی دەردەکـەون و چەرچـەفەکە دادەپۆشن. لاشەکە لەسەر زەوییەکە دادەنێم و دەسـت دەکـەم بـە لابردنـی چەرچەفەکە. سەرەتا لە قاچەکانییەوە دەست پێدەکەم، پاشان تا لای ملی، هەمووی جێی فیشەکە. فیشەکێك نراوە بە قورگییەوە و تا ئەودیوی ملـی بڕیوە. پارچە چەرچەفەکە لەسەر ڕووخساری لادەبەم، دراجـار دەبیـنم ئـەوە لاشەی خۆمە!

***

لەسەر جێخەوەکەم کەوتبوومە خوارەوە. پێش ئەوەی گلۆپەکە هەڵکەم، چەند دەقەیەك لەسەر زەوییە تەختە ساردەکە، نـارەقم دەردابـوو، هێشـتا ڕاکشابووم و دەمویست بەتەواوەتی خۆم لە دنیای خـەون بـەتاڵ بکەمـەوە. ئازارێکی جەرگبڕ بە پشتمدا هاتوچۆی بوو. بۆ ماوەیەك چاوم بڕییە دیوارە لە خشت دروسـتکراوەکە و گـوێم ڕادێـرا بـۆ ئـەو گۆرانییـە ڕاپـەی لـە

ئۆتۆمبیلێکی دەرەوە دەهات. موچوڕکەیەك هەموو لەشمی تەنییەوە. هەوڵم دا بیر لە ژیانە نوێیەکەم بکەمەوە لە (نیویۆرك) کە ماوەی مانگێکە تێیدا دەژیم، بەڵام مێشکم لە ئەمریکاوە بە زەریای ئەتڵەسییەوە بەرەو سیرالیۆن هەڵاتبوو. وێنەی خۆم دەهێنایەوە پێش چاوم کاتێ بە (ئەی. کەی) یەکەم لەگەڵ سوپاکەم کە پێکهاتبوون لە چەند کوڕێکی منداڵ و چەند پیاوێك بەناو کێڵگەیەکی قاوەدا دەڕۆیین تا هێرش بکەینە سەر شارۆچکەیەکی بچووك، کە خواردەمەنی و تەقەمەنی لێیە. هەرکات کێڵگەی قاوەکەمان تێدەپەڕان، لەناکاو دەچووینە مەیدانی فووتبۆڵەکە و هێرشمان دەکردە سەر گرووپە چەکدارەکەی تر و ئەو جێیەی ڕۆژێك لە ڕۆژان گوند بووە، وێرانترمان دەکرد. تا دوایەمین لاشە بە زەویدا نەکەوتایە، لە تەقەکردن نەدەوەستاین. پاشان بەناویاندا دەڕۆیشتین، دەستخۆشیمان لەیەکتر دەکرد و لەسەر لاشەکانیان دادەنیشتین و خواردەمەنییەکانیانمان دەخوارد. ئەوانیش وەك ئێمە چەند کوڕێکی منداڵ بوون، بەڵام بەلامانەوە گرنگ نەبوو. چەك و تەقەمەنییەکانیانمان دەبرد بۆ خۆمان. لە هەموولایەکەوە خوێنی تازە لە شوێنی فیشەکەکانەوە جۆگەلەی دەبەست.

هەستامە سەرپێ. خاولییەکی سپیم هێنا و بە پەرداخێك ئاو تەڕم کرد و لەسەرمەوە بەست. دەبترسام بخەومەوە، هەرچەندە بەخەبەریشبوومایە، جگە لە یادگاریی تاڵ، هیچ نەبوو خۆی بە مێشکمدا بکات. ئەو یادگارییانەی خۆزگەم دەخواست بییانسڕمەوە. هەرچەندە دەزانم ئەوانە بەشێکی گرنگی ژیانمن. بەشێکن کە منیان کردووە بەو مرۆڤەی

ئێستا. ئەو شەوە تا بەیانی نەخەوتم. بە پەرۆشەوە چاوەڕێی هەڵهاتنی خۆر بووم، تا دووبارە ژیانە نوێیەکەم دەست پێ بکەمەوە، ئەو ژیانەی لە منداڵییەوە بەدوایدا دەگەڕام، ئەو خۆشییەی لە منداڵییەوە بەدوایدا وێڵ بووم، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە مانەوە بە زیندوویێتی ببوە ئاساییترین ئەرك، ئێستا ژیانم لە سێ جێگە دەگوزەرێنم: خەونەکانم، ئەزموونی ژیانە نوێیەکەم، هەموو ئەمانەش یادگارییەکانی ڕابردووم دەورووژێنن، دەمگەڕێننەوە بۆ ئەو ژیانە.

# سێ

زیاتر لەوەی وێنامان دەکرد لە (ماتروجۆنگ)ماینەوە. هیچ هەواڵێکی خێزانەکەمان نەبوو، نەماندەزانی چی بکەین جگە لە چاوەڕوانی و خۆزگە بۆ ئەوەی خێزانەکانمان باش بن. بیستبوومان یاخیبووەکان لە (سومبویا) نیشتەجێن، ئەو شارۆچکەیەی نزیکەی بیست میل لە باکووری ماتروجۆنگەوە دوورە. یاخیبووەکان بەو کەسانەدا نامەیان دەنارد کە لە کوشتارگەکەی (سومبویا) قووتار ببوون و نەمردبوون. لە نامەکاندا داوایان دەکرد خەڵکی (ماتروجۆنگ) بە گەرمی بەخێرهاتنیان بکەن، چونکە ئەوان لەپێناو ئێمەدا دەجەنگن. یەکێك لە پەیامنێرەکان، پیاوێکی گەنج بوو. هەموو پەنجەکانی بڕدرابووەوە جگە لە پەنجە گەورەی. هەروەها بە شیشی گەرم لەسەر لاشەی (ئار. یو. ئێف) کێشرابوو، کە بە مانای (بەرەی یەکگرتووی شۆڕشگێڕان) دێت.

ئەم پەنجە بڕینەوەیە، لای یاخیبووەکان بە مانای دەربڕینی خۆشەویستی و ئاشتی دەهات. پێش جەنگ، خەڵکی لە بۆنە و مەراسیمەکان لە کاتی گوێگرتن لە گۆرانی ڕێگەی* پەنجە گەورەیان بۆ یەکتر بەرز دەکردەوە.

---

* ڕێگەی: مۆسیقایەکی باوی ناو جامایکاییەکانە.

دوای ئەوەی خەڵکی ئەو پەیامانەیان لەو پیاوە قووڕبەسەرەوە بیست، هەر ئەو شەوە خۆیان لە دارستانەکە حەشار دا، بەڵام دایك و باوکی خالیلۆو داوایان لێکردین ئەو شەوە لەگەڵیان بین و یارمەتییان بدەین لە هەڵگرتنی شتومەکەکانیان، گەر هات و بارودۆخ خراپتر بێت و کەڵکی گەڕانەوەی نەبێت، لە دارستانەکە دەمێنینەوە. ئەو شەوە بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا بۆم دەرکەوت کە پێشتر جموجۆڵی خەڵکی، ڕۆحی بە شارۆچکەکەدا کردبوو. هەر لەگەڵ ونبوونی خەڵك، ئەو شارۆچکەیە سامناك دەینواند، شەو تاریکتر و بێدەنگییەکەش تا دەهات ئارامی لێهەڵدەگرتین. جاران، سیسرکەکان و باڵندەکان دەمەو ئێوارە پێش خۆر ئاوابوون دەستیان بە گۆرانیوتن دەکرد، بەڵام ئەمجارە ئەوانیش دەمکوت ببوون. دنیا زووتر تاریکتر بوو و هەوایەکی توندوتیژی هەبوو، مانگ بە ئاسمانەوە نەدەبینرا. پێدەچوو سروشت خۆشی سڵ لەو بارودۆخە بکاتەوە.

زۆربەی دانیشتووانی گوندەکە بۆ ماوەی هەفتەیەك خۆیان حەشاردابوو. لەگەڵ ناردنی هەر پەیامنێرێك، خەڵکی زیاتر خۆیان حەشاردەدا، بەڵام یاخیبووەکان ئەو ڕۆژە نەهاتن کە پێشتر ئاماژەیان پێکردبوو، بۆیە خەڵکەکەش وردە وردە گەڕانەوە ماڵەکانیان. دوایین پەیامنێر سەرەك قەشەیەکی کاسۆلیکی بەناوبانگ بوو لەوکاتەی سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی پەیامی ئاینی بووە، بەرەو لای یاخیبووەکان رایکردووە. خۆشبەختانە هیچییان لێ نەکردبوو، بەڵام هەڕەشەیان لێکردبوو گەر سەرکەوتوو نەبوو لە ناردنی پەیامەکەی، ئەوا بەتایبەتی بەدوایدا دەگەڕێن. دوای ئەم پەیامە، دووبارە خەڵکی بەرەو بەشە

جیاجیاکانی دارستانەکە ڕایانکردەوە. ئەمجارەش بە تەنها بەجێماین، نەك بۆ هەڵگرتنی شتومەك، چونکە لەمەوپێش هەموو شتێکمان گواستبووەوە، بەڵکو بۆ چاودێریکردنی خانووەکەی خالیلۆو و کڕینی هەندێك خوێ و بیبەر و برنج و ماسی تا بیانبەین بۆ خێزانەکەی خالیلۆو کە لەناو دەوەنەکاندا خۆیان حەشاردابوو.

دە ڕۆژی تر خۆمان حەشار دا، هێشتا هەواڵێکی یاخیبووەکان نەبوو، دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە نایەن. شارۆچکەکە دووبارە گەڕایەوە دۆخی ئاسایی. خەڵکی گەڕانەوە سەر کاروباریان. قوتابخانەکان کرانەوە. پێنج ڕۆژ بە ئارامی تێپەڕی. تەنانەت سەربازەکانیش کەمێك پشوویان دا.

***

بڕێ جار نێواران، بەتەنها پیاسەم دەکرد. دیمەنی ئەو ژنانەی نانی نێوارەیان ئامادە دەکرد، هەمیشە ئەو کاتانەی بەبیر دەهێنامەوە کە سەیری دایکمم دەکرد کاتێك نانی ئامادە دەکرد. ئەو کات قەدەغە بوو بۆ کوڕان کە بچنە موبەقەکانەوە، بەڵام دایکم ڕێگەی بە من دەدا و دەیوت: "گەر ڕۆژێك تاك و تەنها ژیایت، پێویستە بزانیت چۆن خواردن بۆ خۆت ساز دەکەیت". پاشان بێدەنگ دەبوو و ماسییەکی وشککراوی دەدایە دەستم و پێی دەوتم: "بۆ ماوەیەکی زۆر بەتەنها مەمێنەرەوە، پەلەی بینینی کوڕەزاکەمم".

لەم بیرکردنەوەیەدا بووم، بەردەوام بووم لە پیاسەکەم بەناو ڕێگە باریکە پڕ بەردەکانی (ماترجۆنگ)دا و فرمێسك چاوەکانی تەڕ کرد.

ئەوكاتەی یاخیبووەکـان گەیشـتن، مـن سـەرقاڵی چێشـتلێنان بـووم. برنجەکە دەمی کێشابوو، شلەی بامیێکـەش ئەوەنـدەی نـەمابوو پێبگـات. لەناکاو دەنگی زرمەی تەقـە بـەرزبووەوە و بـەناو شارۆچـکەکەدا دەنگـی دایەوە. جوونیەر و خالليۆو كالۆكۆ و گابریلا کە لە ژوورەکـەی تـر بـوون، ڕایانکردە دەرەوە و سەرسامانە لە یەکتریان پرسـی "گوێتـان لـەو دەنگـە بوو؟" لە جێی خۆمان وشك بووین و گوێمان ڕادێرا بەشـکم سـەربازەکانی شارۆچکەکە تەقەیان کردبێت. دوای دەقەیەك سێ فیشـەکی تـری جیـاواز تەقێندرا. ئەم جارە تەواو پەرێشان بووین. یەکێك لـە هاوڕێکـان دڵنیـای کردینەوە "تەنها سەربازەکانن چەکەکانیان تاقی دەکەنەوە".

شارۆچکەکە زۆر بێدەنگ بوو، تا پانزە خولەك دەنگی هـیچ نەبیسـترا. گەڕامەوە موبەقەکە و برنجەکەم ڕۆکردە نـاو قاپەکانـەوە، ئـەمجارە ڕێژنـەی گوللە دەستی پێکردەوە، هەروەك هەورە بروسکە بیدات بە سەربانێکی بـە تەنەکە داپۆشراو. دەنگی تەقەکان ئەوەنـدە بـەرز بـوو، هـەموو خـەڵکی سەرلێشێواو کرد. کەس کاتی نەبوو بیربکاتەوە لە میانەی چرکەساتێکدا ئاپۆرەی خەڵك بە هەموو لایەکدا ڕووژمیان هێنا. هەریەکەیان بەلایەکدا ڕای دەکرد پاڵیان بەیەکترەوە دەنا، هەرکەس بکەوتایەتە سەر زەوی، دەبـوو بەژێر دەست و پێوە. کەس کاتی ئەوەی نەبوو هیچ شـتێك لەگـەڵ خۆیـدا ببات. هەموو کەس لە بیری ژیـانی خۆیـدا بـوو. دایکـان منداڵـەکانیان لەدەست دەدا، ئەوانیش سەرلێشـێواو ببـوون، دەنگـی گریـانی جـەرگبڕ و زرمەی تەقە هاوکات بوون. خێزانەکان لەیەکتر دادەبڕان و خەڵکی ئـەوەی لە ماوەی ژیانیاندا کاریان بـۆ کردبـوو، هـەوڵیان بـۆ دابـوو، لـە چـەند

خولەكێك هەموویان لەدەست دا. دڵم تا دەهات خێراتر لێی دەدا، دەنگی زرمەی تەقە و ترپەی دڵم ئاوێزانی یەك ببوون.

یاخیبووەكان فیشەكەكانیان ڕووەو ئاسمان دەتەقاند، هاواریان دەكرد و بە شێوەیەكی نیوە بازنەیی بەرەو ناو شارۆچكەكە كشان. دوو ڕێگە هەیە بۆ هاتنە ناو شارۆچكەكە، یەكێكیان بە پەڕینەوە بەناو ڕووبارەكەدا و ئەوی تریان ڕێگەیەكی گڵە. یاخیبووەكان لە ڕێگا گڵینەكەوە هاتنە ناوەوە، هێرشیان كرد و خەڵكیان ناچاركرد خۆیان تورهەڵدەنە ڕووبارەكەوە، هەندێك لە خەڵك تۆقیوانە خۆیان هەڵدەدایە ڕووبارەكە و توانای مەلەكردنیان لەدەست دەدا و دەخنكان. سەربازەكان دەیانزانی ژمارەیان كەمترە لە یاخیبووەكان، بۆیە هەر زوو شارۆچكەكەیان جێهێشتبوو. ئەمە بووە مایەی شۆك بۆ هەموومان، پێمان وابوو كاتی ڕوودانی جەنگ بەرەو بارەگای سەربازەكان ڕادەكەین. لەجێی خۆمان وەستاین لەبەردەم چەند كیسەیەكی لەسەریەك هەڵچنراوی لم، واقمانوڕما بێ ئەوەی بزانین بۆ كوێ بڕۆین. دووبارە بەرەو ئەو جێیە ڕامانكرد كە كەمترین دەنگی تەقەی لێوە دەبیسترا. تەنها ڕێگەیەك هەبوو بۆ دەربازبوون، حەشاماتی خەڵكی بەرەو ئەوێ دەكشان. دایكان ناوی منداڵە ونبووەكانیان دەهێنا. منداڵەكانیش بێسوود دەگریان.

تا دەرباز بین، پێویست بوو زەلكاوێكی پڕ قوڕ و لیتە تێبپەڕێنین كە نزیك گۆدۆلكەیەكی بچووك بوو. لە هەوڵی ئەوەدا بووین لە یەكتر جیا نەبینەوە. لە زەلكاوەكە بەناو كەسانێكدا ڕۆیشتین كە نوقم دەبوون چەند كەسانێكی پەككەوتە، بگرە كەم ئەندامیش، كە بەهیچ كلۆجێك یارمەتی نەدەدران. هەركەسی یارمەتی ئەوانی دابا، ژیانی خۆی لەدەست دەدا.

ئەوکاتەی زەلکاوەکەمان تێپەڕاند، ئەوەی لێی دەترساین، ڕوویدا. ئەم جارە لەبری تەقە بە ئاسماندا بکرێت، تەقە لە خەڵکەکە کرا، تا بکشێنەوە بۆ ناو گوندەکە، نەیاندەویست مەدەنییەکان شارۆچکەکە چۆڵ بکەن، تا دوایی بتوانن لە دژی سەربازەکان بەکاریان بهێنن.

پاش ئەوەی گەمارۆی شارۆچکەکەیان دا، ئامانجی سەرەکییان بریتی بوو لە هێنانی مەدەنییەکان بۆ ناو ڕیزەکانیان. بەتایبەتی منداڵەکان و ژنەکانیان، بەم شێوەیە دەسەڵاتییان زیاتر دەچەسپا.

گەیشتینە لوتکەی گردۆلکەیەکی چڕوپڕ لەپشت زەلکاوەکەوە، پێش ئەوەی بگەیتە ڕێگای دەرچوون. خەڵکەکەمان دەبینی لە هەوڵی چوونە دەرەوەدا بوون. یاخیبووەکان بە ئار. پی. جی و ئەی کەی ٤٧ و جی ٣، هەموو جۆرە چەکێك تەقەیان لە خەڵك دەکرد.

پێویست بوو هەر زوو دەربازبین، کوڕە گەنجەکان مانەوەیان مەترسیدارتر بوو وەك لە دەربازبوونیان. هەر زوو دەکرانە یەکێك لە یاخیبووەکان و نیشانەی (ئار. یوو. ئێف)یان لەسەر جەستەیان بە خەنجەری گەرم دەکێشا.

ئیدی بە درێژایی تەمەنیان ئەو نیشانەیە دەمێنێتەوە، نەك تەنها ئەوە، بەڵکو دەربازبوون لێیان مەحاڵە، چونکە ڕاکردن بەو نیشانەیەوە داواکردنە بۆ مەرگی خۆت، گەر سەربازەکان و مەدەنییەکان ئەو نیشانەیە بناسنەوە، بێ یەك و دوو دەیانکوژن.

***

دەوەن بە دەوەن ڕێگامان بڕی تا گەیشتینە لایەکی تر، بەڵام ئەوە دەسپێکی بارودۆخێکی سامناکتر بوو. دوای دەنگی تەقینەوەیەك، هەستاینەوە سەرپێ و سەرمان دانەواند و بەناو لاشە تازە کوژراوەکان و درەختە سووتاوەکاندا ڕامانکرد. ئەوەندەمان نەمابوو بگەینە ڕێگای دەرچوون، نارنجۆکێکی تر هەڵدرا. هەنگاوەکانمان خێراتر کرد و خۆمان هەڵدایە ناو دەوەنەکانەوە پێش ئەوەی نارنجۆکەکە بکەوێتە سەر زەوی و بەدوایدا چەند فیشەکێك تەقێندرا... ئەوانەی لە دوامانەوە بوون وەکو ئێمە بەختیان نەبوو. هەرزوو بوونە قوربانیی گوللەکان. یەکێکیان کە تەقەی لێکرابوو، دەستی کرد بە گریان و هاوارکردن و دەیوت کە کوێر بووە. کەس کاتی ئەوەی نەبوو بگەڕێتەوە و یارمەتی بدات، پاشان نارنجۆکێکی تری بەرەو ڕوو هەڵدرا، خوێن و پارچەکانی لەشی بارانناسا ڕژانە سەر زەوی، هەموو ئەمانە زۆر بە خێرایی ڕوویان دا.

هەر گەیشتینە ڕێگای دەرچوون، یاخیبووەکان هەندێ لە پیاوەکانیان نارد تا ئەو کەسانە دەستگیر بکەن کە بۆ ناو دارستانەکە ڕایانکردووە. دوامانکەوتن و بە دواماندا دەستیان کرد بە تەقەکردن. نزیکەی کاژێرێك زیاتر بێ وەستان ڕامانکرد. جێی باوەڕ نەبوو چەند خێرا ڕێگایەکی دووروودرێژمان بڕی. تارەقم دەر نەدا و هەستم بە هیلاکیش نەدەکرد. جوونیەر لە پێش منەوە بوو. تالۆی-یش لدوامەوە پەیتا پەیتا جوونیەر بانگی دەکردم تا دڵنیابێت هێشتا بەدوایەوەم. هەرکات بانگی دەکردم هەستم بە غەمناکی دەکرد لە دەنگیدا. هەرکاتێك وەڵامم دەدایەوە، دەنگم دەلەرزی. کالۆکۆ، خالیلۆو، گابریلا لە دوامەوە بوون. گوێم لە دەنگی

هەناسەیان بوو، یەکێکیان هەنسکی دەدا و هەوڵی دەدا نەگری. تالیۆ زۆر خێرابوو لە ڕاکردن، هەمیشە بە منداڵیش خێراترین بوو، بەڵام ئەو ئێوارەیە هەموومان پێی گەیشتینەوە، دوای کاژێرێک یان زیاتر، یاخیبووەکان چیتر بەدوامانەدا ڕایان نەکرد و گەڕانەوە بۆ (ماتروجۆنگ). ئێمەش بەردەوام بووین.

# چوار

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك هەر شەشمان بە کوێرەڕێیەکدا دەڕۆیشتین، نزیکەی پێیەك پان بوو، ئەمبەر و ئەوبەری بە درەخت و دەوەن دەورە درابوو. جوونیەر لە پێشمەوە بوو، ئەو کاتانەی لە خوێندنگە دەهاتەوە، هەر لە حەوشەکەوە جۆلانێی بە قۆڵەکانی دەکرد، بەڵام ئێستا قۆڵەکانی شۆڕ بۆ خوارەوە بەدوای خۆیدا پەلکێش دەکات. دەمویست قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام دیار بوو بیری لە شتێك دەکردەوە. هەموویان بێدەنگ بوون، نەمدەزانی چۆن ئەو بێدەنگییە تێك بشکێنم. بیرم لە خێزانەکەم دەکردەوە، داخوا جارێکی تر بیانبینمەوە؟ هیوام دەخواست سەلامەت بن و لە غەمی من و جوونیەردا نەبن. فرمێسك لە چاوانم زەنگۆڵەیان بەست، بەڵام ئەوەندەم برسی بوو، توانای گریانم نەبوو.

ئەو شەوە لە دێیەکی چۆڵکراو لەسەر عەرزە ڕەقەکە خەوتین، بە هیوای ئەوەی بۆ سبەینێ شتێك جگە لە کاساڤای کاڵ، بدۆزینەوە و بیخۆین. چووینە ناو دێیەك کە داری گوێزی هندی و پرتەقاڵ و مۆزی تێدا بوو، خالیلۆو لە هەموومان باشتر بەسەر داردا سەردەکەوت، بەسەر هەموو درەختەکاندا سەرکەوت و چەندی توانی لێی کردنەوە. مۆزەکان پێ نەگەیشتبوون، بەڵام کەمێك دارمان خستە سەر ئەو ئاگرەی لە یەکێك لە موبەقەکاندا کرابووەوە، پێدەچوو یەکێك پێش ئێمە لە گوندەکە بووبێت و ئەوکاتەی ئێمەی چاوکردووە هەڵاتبێت. بەهەرحاڵ مۆزەکانمان خستنە سەر

ئاگرەکە، هەرچەندە تـامی نـاخۆش بـوو، چـونکە نـە خـوێ، یـان هـیچ وشکەبەرێکی ترمان پێ نەبوو تا پێوەیان بکەین. وەك ئەوەی لە دەسـتمان رابکات قەپاڵمان لێدەگرت، پێویست بـوو گـەدەمان تێـر بکـەین. دواتـر کەمێك پرتەقاڵ و گوێزی هندیمان خوارد. شتێکی ئـەوتۆ نـەبوو بیخـۆین رۆژ بە رۆژ برسیتر دەبووین. بەرچاومان تەڵخ بـوو بـوو، گـەدەمان ئـازاری دەداین. تەنها رێگەچارە بریتی بوو لە گەڕانەوە بۆ (ماتروجۆنگ). لەگـەڵ چەند کەسێك لەسەر رێگاکە بینیبوومانن. بە هیوای ئەوەی ئەو پارەیـەی هەمانبوو، لەوێ مابێت و کەمێك خواردنی پـێ بکـڕین. لەسـەر رێگـای گەڕانـەوە بـۆ شارۆچـکە بێـدەنگ و خاپوورکراوەکـە، کـە بـە ئاسـتەم دەناسرایەوە. مەنجەڵی پڕ خواردەمەنی بۆگەن و کەڕوواوی و لاشەی مردوو، کەلوپەلی ناو مـاڵ و جلوبـەرگ کـەوتبوون. هـەموو جـۆرە کەلوپـەلێك پەرتەوازە ببوون لەسـەر زەوییەکـە. لەسـەر دالآنـی خانوویـەك پیـاوێکی پیرمان بینی لەسەر کوورسییەك دانیشتبوو، پێدەچوو خەوی لێکـەوتبێت، بەڵام فیشەك بە ناوچەوانییەوە نرابوو. کـەمێك بـەولاتر دوو پیـاو لەسـەر زەوییەکە کەوتبوون، ئەندامی نێرینـەیان و دەسـت و پێیـان بـە تـەوراس بڕابووەوە و لای ئەندامە کەلەکەبووەکانی تری جەستەیان دانرابـوون. ئـەو دیمەنەم بینی هێڵنجم دا و ڕشامەوە. سەرتاپام داخ بوو، بەڵام پێویست بـوو بـەردەوام بـین لـە ڕۆیشـتن. بەسـەر نـووکی پێـوە بـە خێراییـی شـەقامە سـەرەکییەکەمان تێپەڕانـد و لەپشـت دیـواری خانووەکـەوە بـە وردی چاودێریی ڕێگای نێوان خانووەکانمان دەکـرد، پـێش ئـەوەی بچـینە پشـت خانووەیەکی تر.

له ناکاو دەنگی پێی چەند کەسێك هات، ئەو جێیە گونجاو نەبوو بۆ خۆحەشاردان، بۆیە دەستبەجێ چووینە دالآنی یەکێك لە خانووەکان لە پشت ڕیزێك لە دیوارە چیمەنتۆکانەوە خۆمان حەشاردا. لەنێوان درزی دیوارەکەوە سەیرمان کرد، دوو یاخیبوومان بەرچاو کەوت. پانتۆڵی کاوبۆی دەڵب و شۆڕیان لەبەردا بوو لەگەڵ تیشێرتی سپی و پارچە پەڕۆیەکی سووریان لەسەریان بەستبوو، جووتێ نەعلیان لەپێدابوو. چەکەکانیان خستبووە پشتییانەوە. چەند ژنێکیان ڕاپێچ کردبوو تا کەلوپەلەکانیان لە مەنجەڵی پڕ برنج و دەسك و دەسکەوان، بۆ هەڵگرن. چاودێریمان کردن تا بەتەواوی لەبەر چاو ون بوون، پاشان بەردەوام بووین. دواجار گەیشتینە خانووەکەی خالیلۆو. هەموو دەرگاکان تێکشکێنرابوون. ئەم خانووەش وەك هەموو ئەوانەی تر تالآن کرابوو، جێگەی فیشەك بە دەرگاکانەوە دیاربوو، شووشەشکاوی بیەی جۆری (ستار)، کە ئەو کات جۆرێکی ناسراو و پڕفرۆشی شارەکە بوو، بە زەوییەکەدا بڵاو ببووەوە.

لەسەر دالآنەکەش پاکەتی بەتاڵی جگەرە کەوتبوو. هیچ شتێك بەجێ نەمابوو تا مرۆ سوودیان لێوەربگرێت. ئەوەی مابووەوە فەردەیەك برنج بوو، ئەوەش بە ئێمە هەڵنەدەگیرا، جگە لەوە خاوی دەکردینەوە لە ڕۆیشتن. خۆشبەختانە پارەکە لەناو سەتڵێکی پلاستیکی بچووکدا لەژێر قاچی جێ خەوەکەی خالیلۆو مابوو، پارەکەم هەڵگرت و خستمە ناو لایەکی کالەکانمەوە و بەرەو لای زەلکاوەکە بەڕێکەوتین. هەر شەشمان و ئەو خەلکەی لەگەڵمان گەڕابوونەوە بۆ شارۆچکەکە، هەموومان لای زەلکاوەکە کۆبووینەوە. بڕیارمان دا بە سێ دەستە بپەڕینەوە. من لە دووەم

دەستەدا بووم لەگەڵ تالۆی و کەسێکی تر. دەستەی یەکەم کە ڕێگاکەیان تێپەڕاندبوو، هێمایان بۆ دەکردین و ئێمەش بە گاگۆڵکێ دەستمان بە ڕۆیشتن کرد.

لە نیوەی ڕێگاکە ئیشارەتیان کرد تا تەخت لە زەوییەکە بکەوین. پاشان هێمایان کرد بکەوینەوە جووڵە. لاشەی مردوو لە هەموو لایەك کەوتبوون. مێشەکان لە هەمولایەکەوە بەسەر خوێنە خەستبووەوەکانیانەوە جەژنیان بوو. لە نزیك ڕێگای تێپەڕ بوون، چەند یاخیبوویەك لەسەر بورجێکی بەندەرەکە کە بەسەر هەموو ناوچەکەدا دەیڕوانی، چاودێرییان دەکرد. دووەمین دەستە، جوونیەر و دوو کەسی تر بوون. لە نیوەی ڕێگاکە شتێك لە گیرفانی یەکێك لە پیاوەکاندا کەوتە خوارەوە بەسەر تاوەیەکی ئەلەمنیۆم دەنگەکەی سەرنجی یاخیبووەکانی ڕاکێشا و بەرەو ئەولایە هاتن کە دەنگەکەی لێوەهاتبوو. وامدەزانی مشتێك لە ئازار لە دڵمی دا کاتێك براکەمم بینی لەسەر زەوییەکە ڕاکشاوە و خۆی وەك یەکێك لە مردووەکان نیشان دەدات. چەند دەنگی چەند فیشەکێك لە شارۆچکەکە بەرزبووەوە. بەمەش یاخیبووەکانی لەو ناوچەیە دوورخستەوە. دواجار جوونیەر و دوو پیاوەکەی تر گەیشتن. دەموچاوی جوونیەر بە خۆڵ و قوڕ سواغ درابوو، تەنانەت بەینی ددانەکانیشی قوڕی تێدا بوو.

بە توندی هەناسەی دەدا و قۆڵەکانی توند گرتبوو. یەکێك لە پیاوەکان کە لە دەستەی سێیەم بوو، ئەوەندەی شت کۆکردبووەوە لە ماڵەکەی تەواو هێواش ببووەوە لە ڕۆیشتن. دواجار یاخیبووەکانی سەر بورجەکە بینیانن و

دەستیان کرد بە تەقەکردن. ئەو یاخیبووانەی لە خوارەوەی بورجەکـە بـوو. بەدواماندا ڕایانکرد و دەستیان کرد بە تەقەکردن. بـە چـرپە ئاگادارمـان کردەوە تا کەلوپەلەکانی دابنێت، بەڵام گوێی لـێ نـەگرتین، ئاوڕمدایـەوە بینیینم جانتاکەی لە بەینی لقی درەختێکدا بەگیر هاتووە. بە هەموو هێزی خۆمان ڕامانکرد ئەو ناوچەیەمان تێپەڕانـد. بـە هـەموو هێـزی خۆمـان ڕامانکرد تا یاخیبووەکانمان ون کرد. خۆر ئاوا بـوو، ئـەو ئێوارەیـە لەبـەر خۆری سوور و ئاسمانی بێ جووڵە لە چاوەڕوانی تاریکیدا، ڕێگامـان بـڕی. ئەو کوڕەی یاخیبووەکانی لێئاگادارکردینەوە، نەیتوانی لەگـەڵمان بگاتـە ئەو گوندەی پڕخەڵك بوو.

ئەو شەوە بۆ ماوەیەکی کاتیی دڵمان خۆش بوو کە پارەمان هەیـە. بـە هیوای ئەوەی بۆ نانی ئێـوارە کـەمێك بـرنج و کاسـاڤا و گـەڵای پەتاتـە بکڕین. دەستخۆشیمان لە یەکتر کرد و بـەرەو بـازاڕی گوندەکـە ڕۆیشـتین. گەدەمان پڕ بوو لە بۆنی ڕۆنی دارخورما، کە لە خانۆچکەکانەوە دەهـات. کاتێك گەیشتین تەواو بێ ئومێد بووین، هەندێکیان خواردەمەنییـەکانیان هـەڵگرتبوو نـەوەك بـارودۆخ خـراپتر بێـت، هەنـدێکیان خواردەمـەنییان نەدەفرۆشت بەهۆی هەندێك هۆی تایبەت بـە خۆیـان. دوای ئـەو هـەموو نەهامەتییەی بەسەرماندا هات تا بڕێك پارە بهێـنین، هـەمووی بێسـوود بوو. ئەو کات کەمتر برسیمان دەبوو ئەگەر لە گوندەکـە بووینایـە و ئـەو هەموو میلەمان نەبڕییایە بۆ (ماترۆجۆنگ).

دەمویست لە تووڕەییدا لە خۆوە گلەیی لە یـەکێك بکـەم بـۆ ئـەوەی بەسەرماندا هاتبوو، بەڵام کـەس نـەبوو گلـەیی لـێ بکرێـت. بڕیـارێکی

لۆجیکی درابوو و لە ئەنجامدا گەیشتین بەو شەوە. ئەوەی لە جەنگدا بێـت بێ شك دووچاری ئەو ساتانە دەبێت. شتەکان لـە میانـەی چرکەسـاتێکدا دەگۆڕان و هەموو ئەمانەش هەڵەی کەس نەبوو. جگـە لـەوە دەبـوو هـەر فێری فێڵی مانەوە ببین بە زیندوویەتی. ئەو شـەوە لەبرسـان خواردەمـەنی خەڵکەکەمان دزی کاتێك ئەوان خەوتبوون. ئەوە تەنها ڕێگە بـوو تـا ئـەو شەوەی پێ بەرینە سەر.

# پێنج

ئەوەندە برسی بووین، تەنانەت ئاو خواردنەوەش ئازاری گەدەی دەداین. هەناومان وشك ببووەوە. وامان هەست دەكرد شتێك گاز لە گەدەمان دەگرێت و نـار گەدەمان دەخوات. هەموو لێومان قڵیشابوو و ماسوولكەكانمان بێ هێز ببوو و ئازاریان دەهات. هەستم بە چەمانەوەی ئێسكەكانم دەكرد هەركات دەستم بۆ دەبردن. هیچ كوێ نەبوو ڕووی تێكەین تا شتێك بۆ خواردن پەیدا بكەین. ئێوارەیەكیان هەر شەشمان دوای كوڕێكی بچووك كەوتین كە دوو قراش گەنمەشامی پێبوو، بە تەنها بۆ خۆی. تەمەنی پێدەچوو ٥ساڵان بێت، خۆشی لە خواردنەكەی دەبینی و بە هەردوو دەست توند گرتبووی. دەیخولاندەوە و خێرا خێرا قەپاڵی لێدەگرت. كە ئەو دیمەنەمان بینی دەستبەجێ بێ ئەوەی یەكتر ئاگاداربكەینەوە، یان سەیری یەكتر بكەین، بەرەو ڕووی ڕامان كرد. بێ ئەوەی بزانێت چی لە دواوە ڕوو دەدا بە یەك چاو تروكاندن گەنمە شامییەكەمان لە دەستی فڕاند و لەناو خۆماندا دابەشمان كرد. هەریەكەو بەشەكەی خۆمان دەخوارد، لە كاتێكدا ئەو بە گریانەوە ڕایكردەوە بۆ لای دایك و باوكی. ئەوان هیچیان پێ نەوتین، دەیانزانی ئەگەر برسێتی زۆری بۆ نەهێنابێتین، هەر شەشمان باز هەڵنادەینە سەر كوڕەكەیان بۆ دوو پارچە گەنمەشامی. دواتر ئەو ئێوارەیە، دایكی كوڕەكە سەرو گەنمەشامی بە هەر شەشمان دا. بۆ چەند خولەكێك پەشیمانی دایگرتم لەو كارەی بەرامبەر بە

کوڕەکەی کردمان، بەڵام کاتی ئەوەش نەبوو هەست بە پەشیمانی بکەم. نازانم ناوی ئەو دێیە چی بوو، ئەوکاتەش بەلامەوە گرنگ نەبوو بپرسم. ئەوەی لەبیریدا بووم ئەوە بوو بتوانم گیان بەدەر بەرم لە ماوەی ئەو هەموو کوێرەوەرییەی دەهاتە ڕێمان.

شارەزای گوند و شارۆچکەکانی تریش نەبووین، نەمانـدەزانی چ ڕێگەیەك دەمانگەیەنێتە چ ناقارێکی دی. هەرچۆنێك بێت برسێتی دووبارە هەڵیپێچاینەوە بۆ ماتروجۆنگ. هەرچەندە دۆخەکە سامناك بوو، بەڵام ئەوەندە لە غەمی خواردندا بووین گوێمان بە دۆخ نەدا. وەرزی هاوین بوو، وەرزێکی تەواو وشك. دارستانە کەسکەکانیش گژوگیا زەردباوەکانیان قووت دابوو. بەناو گژوگیاکەدا بە یەك ڕیز دەڕۆیشتین. تیشێرتەکانمان داکەندبوو، دابوومان بەسەر شان، یان سەرماندا. لەناکاو ٣ کەس لە یاخیبووەکان لە پشت گژوگیا وشکبووەکانەوە دەرکەوتن و چەکەکانیان ئاراستەی گابریلا کرد کە لە پێشمانەوە دەڕۆیشت. دەنگی پەلەپیتکەیان لە تفەنگەکانیان هێنا و یەکێکیان سەری تفەنگەکەی بە توندی لەژێر چەناگەی گابریلادا جێگیر کرد و بە قاقا پێکەنینەوە بە دووانەکەی تری وت: "ئەوەندە دەترسێت لە مەیموونی نوقوم بوو دەچێت لە ئاود!"

دووانەکەی تر بەلامدا تێپەڕین، دەستبەجێ سەرم داخست. نەمدەویست چاوم بکەوێتە سەر چاریان. یەکێکیان کەمێك منداڵتر بوو، بە خەنجەرەکەی کە هێشتا لە ناو کێلانەکەی دەری نەهێنابوو، چەناگەمی پێ بەرز کردەوە، بە گرژییەوە لە ڕووخسارمی دەڕوانی. پاشان خەنجەرەکەی لە کێلانەکە دەرهێنا و بەستی بە لوولەی تفەنگەکەوە و ئاراستەی کردم.

بە جۆرێ گیانم کەوتە لەرزین، تەنانەت لێوەکانیشمی گرتەوە. ئەویش بزەیەکی بێ هەستی بەڕوومدا کرد. پێدەچوو کەسیان تەمەنیان لە بیستویەك ساڵ زیاتر نەبن. بەهەرحاڵ ڕاپێچیان کردین بۆ ناو ئەو گوندەی بەلایدا تێپەڕیبووین. یەکێکیان تیشێرتێکی بێ قۆڵی سەربازی و پانتۆڵێکی کاوبۆیی و پەڕۆیەکی سووری لەسەرییەوە بەستبوو. دووانەکەی تر چاکەتی کاوبۆیی و پانتۆڵ و کالەی تازەی ئەدیداس* و کڵاوی بەیس بۆڵ، یان پاش و پێش لەسەرکردبوو. سەرنجم دا هەرسێکیان کاژێری گرانبەهایان لەدەستدا بوو. هەموو ئەمانە لە خەڵك سەندرابوون، یان لە ماڵ و دووکانەکان دزرابوون.

بە ڕێگەوە زۆر شتیان وت. هەر وشەیەکیان هەڕەشەیەك بوو بۆ سەرمان، ئەوماوەیە گوێم بۆ قسەکانیان نەگرت، تەنها لەبیری مردندا بووم. زۆرم لە خۆم دەکرد تا بڕ بکەم و لە هۆش خۆم نەچم.

هەر نزیکبووینەوە لە گوندەکە، دووانیان لە پێشمانەوە ڕایانکرد و یەکێکیان لەگەڵ هەر شەشماندا مایەوە. بۆ ماوەیەك بیرم لەوە کردەوە ڕابکەین، یان هێرشی بکەینە سەر، بەڵام ئەو یاخیبووەی لەگەڵ ئێمە بوو، شەست تیرێکی نیو ئۆتۆماتیکی پێ بوو، ڕەشاشێکی پڕ لە گوولەشی لە ناوقەدییەوە بەستبوو. پاشان داوای لێکرین بە دوو ڕیزی سێ کەسی بڕۆین و دەستمان بخەینە پشت سەرمان "ئەوەی تەنها جووڵەیەك بکات هەمووتان لەناو دەچن، وریا بن زۆر بە توندیش هەناسە نەدەن ڕەنگە دوا هەناسەتان بێت". پاشان قاقایەکی ئەوەندە بەرزی لێدا، تا دارستانەکەی

* کارگەیەکی بەناوبانگی جلوبەرگ و کاڵای وەرزشییە.

ئەوبەرەوە دەنگی دایەوە. لە دڵی خۆمدا دەپاڕامەوە براکەم یان ئەوانی تر جووڵەیەك نەکەن، تەنانەت شوێنێکیشیان نەخورێنن. پشتی سەرم گەرم داهات هەستم دەکرد هەرچی زووترە دەبمە قوربانیی گوولەیەك. کاتێك بە تەواوی گەیشتینە ناو دێیەکە، ئەو دووانەی لە پێش ئێمەوە ڕایانکرد، نزیکی زیاتر لە پەنجا کەسیان کۆکردبووەوە، زۆربەیان کوڕی منداڵ بوون، چەند کچێك و پیاوێکی تێدا بوو. هەموومان بە تێکەڵی و نزیك خانوویەکی لای دەوەنەکەوە وەستاین. دنیا بەرەو تاریکی دەڕۆیشت. ئەوانیش ڕووناکی تفەنگەکانیان داگیرساند و لەسەر چەند دەستکەوانێکی برنج هاڕین دایاننا تا چاویان لێمان بێت. لەو کاتەدا گوێمان لە دەنگی پێی پیاوێکی پیر بوو کە وەختی خۆی لە (ماتروجۆنگ) ڕایکردبوو، بەسەر پردێکی تەختەی ڕزیودا داهاتەوە بۆ ناو دێیەکە. یەکێك لە یاخیبووەکان کە پێدەچوو لە هەموویان منداڵتر بێت، بەرەو لای پردەکە ڕایکرد و چاوەڕێی پیاوەکەی کرد تا بگات. هەر پیاوەکە گەیشت دەستبەجێ چەکەکەی ئاڕاستە کرد و هێنایە بەردەمان. پیاوەکە پێدەچوو تەمەنی لە شەستەکاندا بێت، لەتاو برسێتی و ترس دەموچاوی چرچ و بێ هێز دەینواند. پاڵێکی توندی پێوەنا و کەوت بە زەویدا. پاشان چەکەکەی ئاڕاستە کردەوە و داوای لێکرد هەستێتەوە سەر پێ. زۆری لەخۆی کرد هەستێت، بەڵام لەتاو لەرزین نەیدەتوانی، ئەوانیش دەستیان کرد بە قاقا لێیان. چەکەکانیان ئاڕاستە کردین تا ئێمەش پێ بکەنین. من قاقام لێدەدا، بەڵام لە ناخەوە دەگریام، دەمویست بە هەموو هێزی خۆم هاوار بکەم. دەست و قاچەکانم کەوتنە لەرزین. هەموو ئەوانەی لەگەڵم بوون

چەکیان ئاراستە کرابوو سەیری یاخیبووەکانیان دەکرد، کە پرسیاریان لە پیاوەکە دەکرد. یەکێك لە یاخیبووەکان کە لە خەنجەرەکەی ورد دەبووەوە، لێی پرسی: "لەبەرچی (ماتروجۆنگ)ت جێهێشت؟" پاشان خەنجەرەکەی لە رێکی ملییەوە پێوا "وابزانم لەگەڵ درێژی ملتدا گونجاوە"، خەنجەرەکەی بە ملیدا هێنا "ئێستا وەڵام دەدەیتەوە، یان نا؟" هەر کە پیاوەکەی بینی کە هێشتا دەلەرزێت، ناوچەوانی گرژ بوو، ئەوەندە تووڕە بوو کە چاوەکانی سوور دەیاننواند. پیاوەکە تەنانەت پێڵووی چاوەکانیشی هاتبووە لەرزین. پێش جەنگ، منداڵ، یان گەنج نەیدەوێرا هەڵسوکەوتێکی نەشیاو بەرامبەر پیرەکان، یان لەخۆیان گەورەتر بنوێنن. لە کۆمەڵگەی ئێمە رەفتارکردن بە رێزەوە نەریتێکی باو بوو، بەتایبەتی بەرامبەر لەخۆ گەورەتر. گەنجەکانیش تا رادەیەك پێوەی پەیوەست بوون.

پیاوە پیرەکە هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو بە دەنگێکی تۆقیوانە وەڵامی دایەوە "(ماتروجۆنگ)م جێهێشت تا خێزانەکەم بدۆزمەوە". ئەو یاخیبووەی فەرمانی کرد بە دوو ڕیزی سێ کەسی بووەستین، لەو کاتەدا پاڵی بە درەختێکەوە دابووەوە و جگەرەی دەکێشا، هەرکە گوێی لە قسەی پیاوە پیرەکە بوو، بە تووڕەییەوە بەرەولای هات و چەکەکەی ئاراستەی نێوان قاچەکانی کرد و شێت ئاسا بە ڕوویدا هەڵشاخی "ئێرەت جێهێشت، چونکە رقت لە ئێمەیە، وانییە؟" پاشان چەکەکەی خستە سەر ناوچەوانی و بەردەوام بوو "ئێرەت جێهێشت، چونکە ئەو ڕاستییەت پێ قبوڵ ناکرێت کە ئێمەی حەقپەرست لەپێناو ئێوەدا دەجەنگین؟"

پیاوەکە لەترسا چاوەکانی توند نوقاند و دەستی کرد بە هەنسکدان. چ هۆکارێکە لەپێناویدا دەجەنگن؟ تەنها ئازادی کە هەمبوو ئەوەبوو، دەمتوانی لە هزری خۆما بدوێم. پاش ئەوەی لە پرسیارکردن لێبوونەوە، دەستیان کرد بە نووسینی (ئار. یو. ئێف). لە هەموو شوێنێکی گوندەکە، دیوارەکان، درەختەکان. ئەوە نارێکوپێکترین نووسین بوو کە بینیبێتم. ئەو کەسەی دەینووسی، پێدەچوو تەنها (ئار. یو. ئێف) لە پیتەکانی تر جیابکاتەوە. دوای ئەوەی لە نووسین تەواو بوون، گەڕانەوە بۆ لای پیاوە پیرەکە و چەکەکەیان خستەوە سەر ناوچەوانی "دوا وشەت چییە بیڵێیت؟" پیاوەکە ئەوەندە دەترسا تەنانەت زمانیشی لەگۆ چووبوو. لێوەکانی دەلەرزین، بەڵام نەیدەتوانی تەنها وشەیەك بڵێت. یاخیبووەکە میلی هێنایەوە، شریخەیەك هات و تیشکێکم لە لولەی چەکەکەوە بەرچاو کەوت، دەستبەجێ چاوم خستە سەر زەوییەکە تا خۆم لەو دیمەنە بە دوور بگرم. دڵم تا دەهات توندتر و خێراتر لێی دەدا، هەموو گیانم دەلەرزی. پیاوە پیرەکە وەك سەگێك کە بەدوای مێشی سەر کلکی خۆیەوە بێت، بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە و دەستی کرد بە هاوارکردن "ئای سەرم... ئای مێشکم..." یاخیبووەکانیش پێدەکەنین. پاشان پیاوە پیرەکە وەستا و وەك یەکێك کە گومانی لە ڕووخساری خۆی هەبێت و بە دوودڵییەوە سەیری ئاوێنە بکات، دەستی برد بۆ ڕووخساری. "هەموو شتێك دەبینم... هەموو شتێك دەبیستم..."، پاشان دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە تا لەهۆش خۆی چوو. یاخیبووەکان بۆ کەیفخۆشی و گاڵتەوگەپی خۆیان فیشەکێکیان نزیك لە سەرییەوە تەقاندبوو. ڕوویان تێکردین و ئاگاداریان

کردینەوە، پاشان هاواریان کرد بەسەرماندا، کە پاش ماوەیەکی تر چەند کەسێك هەڵدەبژێرن تا بهێنرێنە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە. هەریەکە لە ژن و منداڵ و پیاو لە چەند ڕیزێك خۆیان ڕێکخست. بەناوماندا گەڕان، یەکەمین کەس خالیلۆ پاشان من و چەند کەسێکی تر هەڵبژێردراین و ئەوانەی هەڵبژێردرابوون داوایانلێکرا بەرامبەر ئەوانەی دوایانەوە بوەستن. جوونیەر هەڵنەبژێردرا. منیش لە گرووپەکەی تر بەرامبەری وەستام. سەیرم کرد، بەڵام ئەو نەیدەویست سەیرم بکات و سەری داژەند. چەند سەیر بوو، وا دەردەکەوت هیچ پەیوەندییەکی برایەتیمان نەبێت. خۆشبەختانە یاخیبووەکان بڕیاریان دا دووبارە هەڵبژاردن بکەنەوە، لەبەرئەوەی هەموو جەستەمان دەلەرزی، پێیان وابوو شایستەی جەنگ نین و چەند کەسێکی ژنانین. "ئەندامی بەهێزمان دەوێت، نەك ئەم ترسنۆکانە".

پاڵیان پێوەناین بەرەو لایەکی تری قەرەباڵغییەکە. لە تەنیشت جوونیەرەوە وەستام، بە هێواشی دانەیەکی پیامدا کێشا، سەیرم کرد، سەری لەقاند و دەستی بەسەرمدا هێنا. یەکێك لە یاخیبووەکان هاواری کرد "ڕێك بوەستن ئەمە دوایەمین جارە هەڵدەبژێردرێن". جوونیەر دەستی لەسەرم لابرد. ئەمجارە جوونیەر هەڵبژێردرا ئیتر ئەوانی تر گرنگ نەبوون، ناچارکراین بەدوای ئەوانەی هەڵبژێردراون، بڕۆین بۆ لای ڕووبارەکە. یەکێك لە یاخیبووەکان تا ئاگادارمان بکاتەوە دەستی ڕاوەشاند و وتی: "فێرتان دەکەین چۆن بجەنگن و ڕووبەڕوو ببنەوە. ئێستا ئەم چەند کەسە دەکوژرێن لەبەر چاوی خۆتاندا، تا خوێنتان پیشان بدەین و بەهێزتان

بکەین، هەرگیز ئەم کەسانە نابینینەوە، مەگەر بڕواتان بە ژیانی دوای مردن هەبێت". دانەیەکی کێشا بە سنگی خۆیدا و دەستی کرد بە پێکەنین. ئاوڕم دایەوە و سەیری جوونیەرم کرد، ئەوەندە زۆری لەخۆی کردبوو نەگری، چاوەکانی سوور ببوون. توند قۆڵەکانی خۆی گرتبوو تا نەهێڵێت دەستەکانی بلەرزن. دەستم کرد بە گریان و لەناکاو سەرم گێژی خوارد، یەکێك لە کوڕەکان هێڵنجی دا و ڕشایەوە. یاخیبووەکان بە قۆناغە تفەنگەکانیان کەوتنە سەروچاوی تا لە خوێندا گەوزا و ناچاریان کرد بێتە ڕیزەکەی ئێمەوە و لەگەڵماندا بڕوات. یەکێك لە یاخیبووەکان بە پێکەنینەوە وتی: "خەمتان نەبێت کوشتنی ئەمجارە نۆرەی ئێوەیە"، پاشان فەرمان کرا بکەوینە سەر زەوی و دەستمان بخەینە پشت سەرمان. لەناکاو دەنگی چەند فیشەکێك لە دوورەوە بیسترا، دووانیان بەپەلە چوونە لای درەختێکەوە و بە وردی کەوتنە چاودێریکردن، ئەوی تریان خۆی دا بە زەویدا و چەکەکەی ڕووەو ئاراستەی دەنگی فیشەکەکان کرد. یەکێکیان پرسی: "ئێوەش پێتانوایە ئەوە دەنگی. ..." دەنگی چەند فیشەکێکی تر قسەکانی پێ بڕی، تا دەهات دەنگەکە نزیکتر دەبووەوە. یاخیبووەکان دەستیان کرد بە تەقەکردن و خەڵکەکەش تۆقیوانە بەرەو دەوەنەکە ڕایانکرد، کاتێك زانییان ڕادەکەین، بەدوامانـدا دەستیان کرد بە تەقەکردن. بەهەموو هێزی خۆم ڕامدەکرد. پاشان لە پشت کۆتەرە دارێك تەخت لە زەویدا کەوتم. دەنگی فیشەکەکان نزیکتر دەبوونەوە، بۆیە زیاتر خۆم خزانە ناو دەوەنەکەوە، چەند فیشەکێك نرا بە درەختێکی بەردەمم و لقێکی لێبووەوە و کەوتە تەنیشتم. وەستام و هەناسەی خۆمم گرت. گوللە

سووره‌کانم له تاریکی شه‌ودا چاوکرد. دڵم ئه‌وه‌نده خێرا لێی ده‌دا، زۆر به‌باشی گوێم له ده‌نگی ترپه‌که‌ی بوو. ده‌نگی هه‌ناسه‌دانیشم تا ده‌هات به‌رزتر ده‌بوو، بۆیه توند ده‌م و لوتی خۆمم گرت تا ده‌ستی به‌سه‌ردا بگرم. ده‌نگی هاوار و پاڕانه‌وه‌ی ئه‌و که‌سانه ده‌هات که گیرابوون. دڵنیا نه‌بووم گه‌ر له‌به‌ر ئه‌شکه‌نجه هاوار بکه‌ن، یان هه‌ر ئازارێکی تر بێت. ناڵه‌ی ژنێك سه‌رتاپای دارستانه‌که‌ی گرتبووه‌وه. هاواری ترسناکیزی وه‌ك تیر هه‌موو ده‌ماره‌کانی له‌شمی پێکا و هه‌ستم کرد ته‌نانه‌ت ددانه‌کانیشم ئاوساون و ئازاریان دێت. زیاتر خۆم ترنجانده ناو گژوگیاکه‌وه و بۆماوه‌ی چه‌ند کاتژێرێك بێ جووڵه مامه‌وه. یاخیبووه‌کان هێشتا له گونده‌که بوون و به تووڕه‌ییه‌وه ته‌قه‌یان ده‌کرد و نه‌فره‌تیان ده‌کرد. پاشان واخۆیان نیشاندا که له‌وێ نه‌مابن، یه‌کێك له پیاوه‌کان هه‌ستا و گه‌ڕایه‌وه بۆ ناو دێیه‌که، به‌ڵام له‌لایه‌ن یاخیبووه‌کانه‌وه گیرا، ده‌ستیان کرد به لێدانی و گوێم له ده‌نگی هاوار و گریانی بوو. چه‌ند فیشه‌کێکی تر ته‌قێندرا، به‌دوایدا دووکه‌ڵێکی ڕه‌نگ خۆڵه‌مێشی ئه‌ستوور به‌ره‌و ئاسمان کشا. گونده‌که به‌و ئاگره‌ی که‌وتبووه‌وه، ڕووناك بووه‌وه.

نزیکه‌ی کاژێرێك تێپه‌ڕی، ده‌نگی ته‌قه‌ی یاخیبووه‌کان نه‌ما، هێشتا له جێی خۆم نه‌جولام. بیرم ده‌کرده‌وه چی بکه‌م، له‌ناکاو له دوامه‌وه ده‌نگی چرپه ده‌هات. ترسم لێنیشت، دواتر ده‌نگه‌کانم ناسییه‌وه. جوونیه‌ر و کوڕه‌کانی تر بوون. هه‌ر یه‌که‌یان به یه‌ك ئاڕاسته ڕایانکردبوو. هێشتا دڕدۆنگ بووم. که‌مێکی تر گوێم ڕادێرا تا دڵنیا بم. "وابزانم ڕۆیشتوون". گوێم له چرپه‌ی جوونیه‌ر بوو، ئه‌مجاره ئه‌وه‌نده دڵنیابووم ده‌نگم بێ ویستی

خۆم بە خێرایی پێشم کەوت. "جوونیەر... تالۆی... کالۆکۆ... خالیلۆو... گابریلا... ئەوە ئێوەن؟" پاشان بێدەنگ بوون. دووبارە بانگم کردنەوە.

-"جوونیەر گوێت لێمە؟"

-"بەڵێ...! ئێمە لای ئەم کۆتەرەدارە بۆگەنەوەین!"

هەرچۆنێك بێت بەرەولای خۆیان هێنام. پاشان هەموومان بە گاگۆڵکێ چووینەوە ناو گوندەکە. هەر گەیشتینە ڕێگاکە، گەڕاینەوە بۆ ناو ئەو دێیەی کە زۆربەی ڕۆژەکانمان بە برسێتی تێیدا بەسەربردبوو. لە ڕێگا، من و جوونیەر نیگامان گۆڕییەوە و ئەویش بزەیەکی بەڕوومدا کرد کە دیاربوو لەو کاتەی ڕووبەڕووی مەرگ دەسەوەسان ببووین، هەڵیگرتبوو.

دەمزانی بە ڕێگادا دەڕۆم، بەڵام هەستم بە قاچەکانم نەدەکرد لەسەر زەوییەکە. گەشتێکی بێ سرپە بوو. کەس قسەی نەدەکرد. گەیشتینە ناو دێیەکە هەریەکەمان بەدەوری ئاگرێکدا تا سەحەر وچانمان دا. تەنها وشەیەك نەوترا. پێدەچوو هەریەکێك لە جیهانی تایبەت بەخۆی بێت، یان بە قوڵی بیر لە شتێ بکاتەوە. ئەو شەوەمان بە هێمنی بەڕێکرد، کەس قسەی نەدەکرد پێدەچوو هەریەکەمان لە جیهانێکی تایبەت بە خۆی بێت.

بۆ ڕۆژی دوایی، هەموو لەگەڵ یەکتر قسەمان دەکرد وەك ئەوەی تازە لە خەوێکی ناخۆش بەئاگا هاتبێتینەوە. هەرچەندە جێگەو ئەنوایەکی دەستنیشانکراو نەبوو، بەڵام بڕیارمان دا ئەو نارچەیە جێبهێڵین بەرەو لایەکی تر بڕۆین کە ژیانمان تیایدا پارێزراو بێت. جێیەك دوور لەو گوندەی تێیدا بووین.

جلەکانمان داکەند و شتمانن، هەرچەندە پاکەرەوەیەك نەبور، بەلام لەئارمان هەلکێشان و لەبەر خۆر هەلمانخستن و بەرووتی لای دەوەنەکەوە دانیشتین و چاوەڕێ بووین تا وشك ببنەوە، بڕیاربور رۆژی داهاتور بەیانی زوو بەرێ بکەوین.

# شەش

شەش کەس پێکەوە لە یەك شوێن لە قازانجی ئێمە نەبوو، بەڵام باشتر بوو لەو ڕۆژە دژوارانەدا بەیەکەوە هەڵبکەین. خەڵکی لە کوڕی وەك ئێمە و هاوتەمەنی ئێمە تۆقیبوون. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە کوڕی هاوتەمەنی ئێمە ناچاردەکرێن ببنە یاخیبوو و خێزانەکانی خۆیان بکوژن و گوندەکانی خۆیان بسووتێنن، ئەم منداڵانە هەرییەکەیان لە چەند یەکەیەکی تایبەتی چاودێر بوون. تا گوندنشینی بێتاوان بکوژن و پەلیان ببڕنەوە، خەڵك زۆر هەبوون کە برینەکانی سەر جەستەیان شایەتی ئەم ڕاستییە بوون. هەر جێیەك دەڕۆیشتین، ئەو کوشت و بڕەمان بە بیری خەڵك دەهێنایەوە و ترس و بیممان دەخستە دڵیانەوە. ئەوانیش بەرەنگارمان دەبوونەوە تا ژیانی خۆیان و خێزانەکانیان و کۆمەڵگاکەیان بپارێزن. لەبەر ئەم هۆکارانە بڕیارمان دا لە نزیك دەوەنەکانەوە ڕێ بکەین. بەم جۆرە لە ئاژاوەنانەوە بە دوور دەبووین، جگە لەوە جێیەکی بێ مەترسی بوو بۆ خۆشمان. ئەمەش یەکێك بوو لە سزاکانی جەنگی ناوخۆ، کە خەڵکی چیتر متمانەیان بەیەکتر نەدەکرد، هەموو بێگانەیەك دەبووە دووژمن لێیان. تەنانەت ئەوانەش کە دەتناسن بە وریاییەوە مامەڵە، یان قسەت لەگەڵ دەکەن.

ڕۆژێك کە دارستانی دێیەکمان جێهێشت، چەند پیاوێکی کەڵەگەت لە دەوەنەکانی بەرامبەر، نزیکبوونەوە. تەور و تفەنگی ڕاوەکانیان بەرزکردەوە و داوایان لێکردین بوەستین. ئەو کات زانیم ئەمانە خۆبەخشانە چاودێری

گوندەکەیان دەکەن و لەلایەن سەرۆکەکەیانەوە فەرمانیان پێکراوە تا دوامان بکەون و بمانگەڕێننەوە بۆ ناو گوندەکە. حەشاماتی خەڵك لای جێگای سەرۆکەکە چاوەڕێمان بوون، پیاوەکان لە بەردەمی خەڵکەکە پاڵیان پێوەناین و دەستەکانمان توند لە دواوە و قاچەکانیان بەستینەوە. ئەوەندە توند قۆڵیان بەستبووینەوە، ئانیشکەکانمان دەیدا لە یەك و قەفەزەی سنگمان دەرپەڕیبوو، ئەوەندەم ئازار هەبوو، دەستم کرد بە گریان. دەمویست بکەومە سەر پشت، بەڵام زیاتر ئازاری دەدام.

سەرۆکەکە گۆچانەکەی داچەقاند بە زەوییەکەدا و پرسی "یاخیبوون، یان جاسووسن؟"

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وەڵامان دایەوە "نەخێر".

سەرۆك بەمە تووڕە بوو و نەڕاندی بەسەرماندا. "ئەگەر ڕاستیم پێ نەڵێن، بەم پیاوانە دەڵێم بەرد بە لاشەتانەوە ببەستن و هەڵتان بدەنە ناو ڕووبارەکەوە، پێتان چۆنە؟" پێمان وتن کە ئێمە تەنها خوێندکارین و ئەوان بەهەڵە لێمان گەیشتوون، خەڵکەکە دەستیان کرد بە هاوارکردن "یاخیبووەکان نوقوم بکەن..." پیاوەکان بە دەورماندا هاتن و دەستیان کرد بە پشکنینی گیرفانەکانمان. یەکێك لە پیاوەکان کاسێتە ڕاپەکەی لە گیرفانمدا دەرهێنا و بردی بۆ سەرۆکەکەی، سەرۆك فەرمانی کرد تاقیبکرێتەوە.

گۆرانییەکی ڕاپ تاقیکرایەوە، سەرۆکەکە گۆرانییەکەی وەستاند و ڕیشی خوراند کەمێك بیری کردەوە. "پێم بڵێ" پاشان ئاوڕی دایەوە و ڕووی تێ کردم "ئەم جۆرە گۆرانییە بیانییەت لەکوێ دەستکەوتووە؟"

پێم وت پێشتر گۆرانی ڕاپمان وتووە، بەڵام نەیدەزانی ڕاپ چییە، بۆیە هەموو هەوڵی خۆمم خستەگەڕ تا بۆی ڕوون بکەمەوە "وەك گێڕانەوەی سەرگوزەشتەیەك، بەڵام بە زمانی سپی پێستەکان". بە کورتی بڕانمەوە.

پاشان پێم وت، ئەوکاتەی لە ماتروجۆنگ بووین گرووپی سەمای هیپ-هۆپ و گۆرانی ڕاپمان هەبوو لە خوێندنگە. پاشان وتی: "ماتروجۆنگ؟" پیاوێکی بانگ کرد کە خەڵکی ئەو گوندە بوو. پیاوەکە هێنرایە بەردەم سەرۆك. سەرۆك پرسیاری لێکرد گەر لەمەوپێش ئێمەی بینیبێت و پشتڕاستی بکاتەوە ئەگەر ئێمە بە زمانی سپی پێستەکان سەرگوزەشتەمان گێڕابێتەوە. پیاوەکە ناوی هەموومانی لە یادگە مابوو، چونکە لە چالاکییەکانماندا بەشدار ببوو. ئێمە نەماندەناسی، بەڵام بە گەرمی بزەیەکمام بەڕوویدا کرد وەك ئەوەی ئێمەش بیناسین. ژیانی ڕزگار کردین.

پاشان دەست و قاچیان کردینە و کاساڤا و ماسی برژاویان داینێ. نانمان خوارد و سوپاسی گوندنشینەکانمان کرد و ئامادەبووین بۆ ڕۆیشتن. سەرۆکەکە و ئەو پیاوانەی دەست و قاچیان بەستینەوە، داوایان لێکردین لەو گوندە بمێنینەوە. سوپاسی میهرەبانیی ئەوانمان کرد، سووربووین لەسەر ئەوەی بڕۆین، چونکە دەمانزانی یاخیبووەکان دەگەنە ئەو جێیەش.

*** 

بەناو دارستانێکی چڕ بەهێواشی دەڕۆیشتین، گەڵای درەختەکان بە نەسیمی ئەو ڕۆژە دەشەنینەوە. ئاسمان خۆڵەمێشی دەینواند و خۆری بێ

ڕەنگ کردبوو. نزیکی خۆرئاوابوون گەیشتینە دێیەکی چۆڵکراو، شەش خانووی لەگڵ دروستکراوی تێدا بوو. لەسەر عەرزی دالآنی یەکێك لە خانووەکان وچانمان دا. سەیری جوونیەرم کرد ئارەق بەڕووخسارییەوە بوو، ماوەیەك بوو زۆر بێدەنگ و هێمن بوو. سەیری کردم و بەزۆر بزەیەکی تێگرتم و دووبارە دەموچاوی نائارام و بێزار دەرکەوتەوە. هەستا و ڕۆیشتە حەوشەی ماڵەکە. بێ جووڵە، چاوی بڕییە ئاسمان تا خۆر بە تەواوی لەبەر چاو ون بوو. گەڕایەوە بۆ سەر دالآنەکە و بەردێکی گرت بە دەستییەوە و بەدرێژایی ئەو ئێوارەیە یاریی پێدەکرد. بەردەوام سەیرم دەکرد بەهیوای ئەوەی سەیرم بکات، یان باس لەو شتانە بکات کە لە مێشکیدا بوون و بیری لێدەکردنەوە، بەڵام بەردەوام یاریی بە بەردەکەی دەستی دەکرد و چاوی بڕیبووە زەوییەکە. جارێکیان جوونیەر فێری کردم چۆن بەردی بچووك بەسەر ڕووی ئاوی ڕووبارەکە هەڵبدەم. کاتێك چووین بۆ ڕووبارەکە تا ئاو بهێنین، پێی وتم کە ئەو فێری جادوویەك بووە، کە دەتوانێت بەردەکان بە جۆرێك هەڵبدات، بەسەر ئاوەکەدا بڕۆن. بەرەو لا خۆی چەماندەوە و بەهەموو هێزی خۆی بەردێکی هەڵدا کە چەند جارێ بەسەر ئاوەکەدا هەڵبزووقا، هەر یەکێکیشیان زیاتر لەوەی پێشوو بەسەر ئاوەکەوە دەڕۆیشت، بەڵام من توانام نەبوو وەك ئەو بکەم، ئەویش پەیمانی دا بۆ جاری داهاتوو ئەو جادووەم فێر بکات. لەسەر ڕێگای گەڕانەوە پێم هەڵنووت و بوتڵە ئاوەکان لەسەر سەرم بوون، کەوتنە خوارەوە، جوونیەر دەستبەجێ ئەوانەی خۆی دا بە من و بووتڵەکانی منی بردەوە لای ڕووبارەکە و پڕی کردنەوە. پاشان گەڕایەوە ماڵەوە و لێی پرسیم، ئێستا

باشم؟ ئایا ئازارم پێگەیشتووە یان نا... پێم وت کە هیچ نەبووە و ئازارم پێ نەگەیشتووە، بەڵام ئەو خێرا خێرا سەرنجی قۆڵ و ئەژنۆکانمی دەدا و تیماری دەکردن. دوای ئەوەش دەستی کرد بە ختووکەدانم. ئەو ئێوارەیەش لە داڵانی خانووی گوندێکی نەناسراوا دانیشتبووم و سەیرم دەکرد حەزم دەکرد وەك ئەوکاتە لێم بپرسێت، کە باشم، یان نا. خالیلۆو کوڕەکانی تر سەیری درەختەکانیان دەکرد کە پانتایی دێیەکەیان داگیرکردبوو. گابریلا چەناگەی خستبووە سەر ئەژنۆکانی، دەنگی لوشکە لوشکی لووتی دەهات. کاتێك هاناسەی دەدایەوە، هەموو لەشی دەجوڵایەوە. تالۆی بە بەردەوامی پێیەکانی دەکێشا بە زەوییەکەدا وەك ئەوەی بییەوێت خۆی لەو دەمە قووتار بکات. کالۆکۆ نائارام بوو، جێی بەخۆی نەدەگرت و ناوبەناو بە هەموو لایەکدا ئاڕاستەی دەگۆڕی. خالیلۆو لە پەنایەکدا بە هێمنی هەڵتروشکابوو، پێدەچوو تەنها بە جەستە بوونی هەبێت. دەمویست بزانم جوونیەر چۆنە، بەڵام کاتێکی گونجاوم نەبوو تا ئەو بێدەنگییە تێکبشکێنم، بریا بمتوانیایە.

بۆ بەیانی داهاتوو، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بەلامانـدا تێپەڕین، ژنێکی ناسیاوی گابریلا لەناو ئەو چەند کەسەدا بوو، پێی وت کە پووری هێشتا لەو گوندە ماوە و نزیکەی ٣٠ میل دوورە و ڕێی دێیەکەی پیشاندایـن. خۆمان کۆکردەوە و چەند پرتەقاڵکی پێنەگەیشتوومان هەڵگرت، کە هێشتا تامی ترش بوو. گیرفانەکانمان لێ پڕ کرد، ئەوە تەنها سەرچاوەی خواردەمەنی بوو بۆمان، پاشان بەڕێکەوتین.

کاماتۆر زۆر لە (ماتروجۆنگ)ەوە دوور بوو. یاخیبووەکان لەو ناوچەیە دەسەڵاتیان هەبوو. دێنشینەکانی ئەوێش چاودێرییان دەکرد، خۆیان ئامادەکردبوو لە هەرساتێکدا ڕابکەن. لەپێناو جێی خەوتن و نانخواردن بڕیارمان دا ئێمە وەك چاودێر لە گوندەکە کاربکەین. نزیکی ٣ میل لە گوندەکەوە، گردێکی گەورە هەبوو. لەوێ تا بەرەبەیان چاودێریمان دەکرد، بۆماوەی مانگێك ئەوە پیشەمان بوو، بەڵام هیچ ڕووی نەدا. دەمانزانی یاخیبووەکان لەهەر کاتێکدا بێت دەردەکەون، بەڵام ئەوەندە جدی نەبووین لە چاودێریکردندا.

وەرزی چاندن و کشتوکاڵ نزیکبووەوە، یەکەمین باران داباری و گڵی نەرم کردەوە. باڵندەکان هێلانەیان لەسەر درەختی مانگۆکان کردبوو. هەموو بەیانییەك ئاورنگ بە هێواشی دەکشا بەسەر گەڵاکان و گڵی زەوییەکەی بە تەڕی جێدەهێشت. لە نیوەی ڕۆژدا بۆنی زەوییە شێدارەکە تەواو تیژ بوو، دەمویست لەسەر زەوییەکە پاڵبکەوم و خول بدەم. بە بیرم دەهات مامێکم هەمیشە بەگاڵتەوە دەیوت کە دەیەوێت لەو وەرزەی ساڵدا گیان بسپێرێت. خۆر زووتر لە کاتی ئاسایی بەدیاردەکەوت و ڕەنگی کاڵتر لە ئاسمانی شینی بێ هەور دەینواند. گژوگیاکان لە لایەك سەوز و لەلایەك وشك و نیوە کەسك بوون. مێروولەکان لە هەموو لایەك لەسەر زەوییەکە دەبینران خواردنیان دەگواستەوە بۆ ناو کونەکانیان. هەرچەندە هەوڵمان دا باوەڕ بە خەڵکەکە بهێنین کە یاخیبووەکان لەهەرکاتێك بێت هێرش دەکەن، بەڵام بەلایانەوە گرنگ نەبوو، داوایان لێکردین لەسەر گردەکە بێینە خوارەوە و واز لە چاودێریکردن بهێنین و دەست بکەین بە چاندن،

کارێکی ئاسان نەبوو. لە ماوەی هەموو ژیانمدا تەنها چاودێری کارە کشتوکاڵییەکان و هونەری چاندنم دەکرد. هەرگیز بە بیرما نەهاتبوو چەند کارێکی ئاستەمە تا ئەو چەند مانگەی ساڵی ۱۹۹۳، کە ناچاربووم یارمەتییان بدەم لە چاندندا. ئەوانەی لە گوندەکە دەژیان هەموویان جووتیار بوون، ڕێگەیەك نەبوو بۆ خۆقوتارکردن لەو چارەنووسە. لە پێش جەنگ کاتێ سەردانی داپیرەمان دەکرد لە وەرزی دوورینەوە، تەنها کار کە پێم دەکرا، ڕژاندنی مەی بوو بەسەر گڵی دەوری کێڵگەکەدا بۆ سوپاسکردنی خواکان و ڕۆحی پێشینان، بۆ خاکی بەپیت و بەرهەمی برنج و تێپەڕبوونی ساڵێك لە کشتوکاڵ بەسەرکەوتوویی.

لە کاماتۆر، یەکەمین کار کە پێمان سپێردرا، سافکردنی زەوییەکە و پاککردنەوەی بوو لە گژوگیا. گەورەیی پارچە زەوییەکە بەقەد یاریگایەکی تۆپی پێ دەبوو. کاتێ سەیرمان کرد گژوگیا پانتاییەکی گەورەی داگیرکردووە، زانیم ڕۆژانێکی سەختمان لە پێشە. دەوەنەکان چڕ بوون و درەختی دارخورمای زۆری لێبوو کە پەلکەکانی لەگەڵ درەختەکانی تردا بەناویەکدا چووبوون. ئاستەم بوو لەیەکتر جیابکرێنەوە و ببڕدرێنەوە. زەوییەکە پڕ ببوو لە گەڵای وشکبوو، کە ڕەنگی گڵەکەیان لە قاوەییەوە گۆڕیبوو بۆ ڕەش. لەژێر گەڵا ڕزیوە بۆگەنبووەکان دەنگی خشەی زیندەوەری وەك مۆرانە دەهات. هەموو ڕۆژێك بۆ چەند کاژێرێك بێ وەستان درەختی دارخورما و درەختەکانی ترمان دەبڕییەوە و کورتمان دەکردنەوە تا دووبارە سەر هەڵنەدەنەوە و بەروبوومەکانی تر بشێوێنن.

کێشی تەور و داسەکان ئەوەندە قورس بوون، هەرکات بەکارمان دەهێنان، بەپەلە ڕاماندەکردەوە ناو دەوەنەکان و کەمێك ڕادەکشاین و لەتاو ئازار دەستمان دەکرد بە شێلانی شانمان. مامی گابریلاش سەری ڕادەوەشاند و پێی دەوتین "ئای کوڕە شارییە تەمەڵەکان...".

یەکەمین بەیانی پاککردنەوەی زەوییەکە، مامی گابریلا یەکی پارچە زەوییەکی بۆ دیاری کردین تا درەختەکانی ببڕینەوە و پاکیان بکەینەوە، ئێمە سێ ڕۆژمان پێچوو، لەکاتێکدا ئەو بە کەمتر لە سێ کاژێر تەواوی کرد. هەرکات خەنجەرەکەم دەگرت بە دەستەوە. مامی قاقای پێکەنین دایدەگرت، پاشان فێری دەکردم چۆن بەکاری بەرم. چەند خولەکێکی دەویست تا بە هەموو هێزی خۆم خەنجەرەکە بە قەدی درەختێکدا بێنم، لەکاتێکدا ئەو بە تەنها یەك جار دەیبڕییەوە. دوو هەفتەی یەکەم لە کارکردن، تەواو بەئازار بوو. پشت و ماسولکەکانم ئازاریان دەدام و لەوەش خراپتر، پێستی لەپی دەستم هەڵی دابوو. چیتر توانای هەڵگرتنی تەور و داسم نەمابوو.

کاتێك زەوییەکە پاککرایەوە، چاوەڕێمان دەکرد تا وشك بێتەوە و پاشان ئاگرمان تێبەردەدا و سەیری دووکەڵەکەیمان دەکرد کە بەرەو ئاسمانی شینی ئەو هاوینە دەکشا.

دواتر پێویست بوو کاساڤا بچێنین، بۆ ئەمەش چەند کونێکی بچووکمان بە پاچەکۆڵە هەڵکەند، ئەمەش پێویستی بە چەند کاژێرێك چەمانەوە هەبوو. پاشان لاسکەکانمان دەهێنا و بۆ چەند پارچەیەکی بچووکتر دەمانبڕین پاشان دەمانخستنە کوونەکانەوە. تەنها دەنگ کە

گوێمان لێی بوو، دەنگی جووتیارە بەئەزموونەکان بوو کە لەبەر خۆیانەوە ئاوازی گۆرانییان دەوتەوە.

ڕۆژ بریتی بوو لە دیمەنی باڵەفڕکێی چۆلەکەکان، جووتیارەکان کە سڵاویان لە یەکتر دەکرد لە کاتی گەڕانەوە بۆ ناو گوندەکە، یان چوونە ناو کێڵگەکانی خۆیان و سەمای لقی درەختەکان. هەندێ جار لە کۆتایی ڕۆژدا، لەسەر کۆتەرە دارێك لە لایەکی گوندەکە دادەنیشتم و سەیری کوڕەکانم دەکرد کە خەریکی یاری و زۆرانبازی بوون، یەکێك لە منداڵەکان کە تەمەنی نزیمەی ٧ ساڵان دەبوو، هەمیشە دەستی دەکرد بە زۆرانبازی و شەڕ نانەوە و دایکی بە گوێچکە ڕاکێشانەوە ڕاپێچی دەکردەوە. کەسایەتی خۆمم لەو منداڵە دەبینییەوە. منیش منداڵێکی ئاژاوەگێڕ بووم، هەمیشە خۆم تووشی شەڕ دەکرد لە قوتابخانە و لای ڕووبارەکەش. تەنانەت بەردم دەگرتە ئەو کەسانەش کە دەمزانی ناتوانم ڕووبەڕوویان بوەستم. لەبەر ئەوەی من و جوونیەر دایکمان نەبوو لە ماڵەوە، ئەوە نیشانەیەکی لەسەرمان جێهێشت کە بچووکترینی شارۆچکەکە لەبارەمانەوە دەیزانی. ببووینە هەوێنی قسەی خەڵکی "ئەو کوڕە داماوانە..."، هەندێکیان دەیانوت: "تەنانەت بە باشیش ناتوانن بەخێو بکرێن..."، ئەم قسانەیان تووڕەی دەکردم، تەنانەت زۆرجار هەڵم دەکوتایە سەر منداڵەکانیان لەپشت بینای قوتابخانەکەوە. بەتایبەتی ئەو منداڵانەی بە ڕووخسارییاندا دیاربوو لە ماڵەوە دایك و باوکیان باسمان دەکەن.

***

بۆ ماوەی سێ مانگ لە کاماتۆر سەرقاڵی کشتوکاڵ بووین هێشتا پێی ڕانەهاتبووم. تەنها کات کە چێژم لێدەبینی، کاتی دوای نیوەڕۆ بوو کە پشوومان هەبوو. دەچووین بۆ ڕووبارەکە و مەلەمان دەکرد. لەوێ لەسەر لمەکە دادەنیشتم، ڕێگەم دەدا شەپۆلەکان بەرەو لای خۆیان ڕامکێشن. منیش دووبارە دەهاتمەوە سەرەوە. پاشان جلە پیسەکانم دەدا بە شانمدا و دەگەڕامەوە ناو دێیەکە. ئەوەی جێی داخ بوو ئەوەبوو، هەموو ئەوانەی کارمان بۆ کردبوو بەهەدەر چوو، دوای ماوەیەك یاخیبووەکان گەیشتن و دێنشینەکانیش ڕایانکرد. کێڵگەکان جێهێڵدرا تا دووبارە پڕ ببنەوە لە گژوگیای بێ سوود. هەموو ئەوانەی چاندبوومان، دەبوونە خۆراکی ئاژەڵەکان. ئەو کاتەی یاخیبووەکان هێرشیان کردە سەر کاباتۆر، ئەو کاتە بوو کە من و هاوڕێکانم لەیەکتر جیابووینەوە. ئیتر ئەوە دوایەمین جار بوو جوونیەری برام ببینم.

# حەوت

هێرشەکە زۆر کتوپڕ لە شەوێکدا ڕووی دا. تەنانەت دەنگوباسی ئەوە نەبوو کە یاخیبووەکان ٥٠ میل لە کاماتۆرەوە دوور بن. لەناکاو تەوقی شارەکەیان دا. نزیکەی کاژێر ٨:٠٠ی ئێوارە بوو، خەڵکەکە خۆیان ئامادەکردبوو، دوایەمین نوێژی ڕۆژەکە بەجێبهێنن. ئیمامەکەش هیچی لەبارەی هێرشەکەوە نەدەزانی تا ئەو کاتەی یاخیبووەکان گەیشتن. بەهەرحاڵ، ئیمام چووست و چالاك ڕووەو ڕۆژهەڵات وەستا و سوورەتێکی دووردرێژی خوێندەوە. هەرکات نوێژ دەستی پێ دەکرد، هیچ کەس بۆی نەبوو باس لە شتێك بکات لە دەرەوەی چوارچێوەی نوێژەکە. کالۆکۆ بەشداری نوێژ بوو، بەڵام من ئەو شەوە نەڕۆیشتنم. دواتر بۆی گێڕامەوە ئەو کاتەی زانراوە یاخیبووەکان لە گوندەکەن، هەموو خەڵکەکە لە دواوە بە هێواشی مزگەوتەکەیان جێهێشتووە و ئیمامەکە بە تەنها ماوەتەوە و سوورەتی خوێندووە. هەندێ کەس هەوڵیا داوە بە چرپە ئاگاداری بکەنەوە، بەڵام ئەو گوێی بە هیچ کەسێك نەداوە. پاشان یاخیبووەکان دەستگیریان کردووە و زۆریان لێکردووە تا پێیان بڵێت خەڵکەکە لە چ بەشێکی دارستانەکە خۆیانیان شاردووەتەوە، بەڵام ئیمامەکە هیچ شتێکی نەدرکاند، بۆیە دەست و قاچیان بە وایەر بەستەتەوە و کارەبایان لە جەستەی دا تا جەستەی بسووتێنن. هەرچەندە بەتەواوی نەیانسووتاند، بەڵام ئەو بەرگەی ئاگرەکەی نەگرت و گیانی دەرچوو. لاشە

نیوەسووتاوەکەی لەلایەکی دێیەکەدا کەوتبوو، کالۆکۆ هەموو ئەمانەی لەپشت دەوەنەکانەوە بینیبوو. بە درێژایی هێرشەکە جوونیەر لە ژوورێکی دالآنەکەدا بوو، کە جێی خەوتنی ئێمە بوو. من لە دەرەوە لەسەر قادرمەکان دانیشتبووم. ئەوەندە کتوپڕ هێرش کرایە سەرمان، لە بیری ئەوەدا نەبووم بگەڕێمەوە ژوورەوە بۆ لای، بەپەلە خۆم کرد بە ناو دەوەنەکاندا. ئەو شەوە بە تەنها خەوتم. پاڵم دایەوە بە درەختێکدا. بۆ بەیانییەکەی کالۆکۆم بینی و پێکەوە گەڕاینەوە بۆ گوندەکە. لاشەی نیوە سووتاوی ئیمامەکە هەر وەك ئەوەی کالۆکۆ بۆی باسکردبووم، لە لایەکی گوندەکە کەوتبوو. هەستم کرد چەند ئازاری کێشاوە بە جۆرێك کە ددانەکانی دەرکەوتبوون.

هەموو خانووەکان سووتێنرابوون. هیچ هێمایەکی ژیان لەو ناوچەیەی نەدەبینرا، بەناو دارستانە چڕەکەدا بە دوای جوونیەر و هاوڕێکانی ترماندا گەڕاین، بەڵام نەماندۆزینەوە، چووینە لای خێزانێك کە لەمەوپێش دەماننناسین، ئەوان ڕێگەیان داین لەگەڵیان بمێنینەوە. نزیکەی دوو هەفتە لەگەڵ ئەواندا لە نزیك زەلکاوەکە خۆمان حەشاردا. دوو هەفتەکە وەك چەند مانگێك وابوو. ڕۆژ زۆر بەخاوی دەڕۆیشت، منیش خۆم بە بیرکردنەوە لە کۆتایی ئەم شێتییە و هەمووشتانەی کە ڕەنگە لێم بەسەربێن، سەرقاڵ دەکرد. ئایا هیچ داهاتوویەك بۆ من هەیە لە پشت ئەم دارستانەوە؟ بیرم لە جوونیەر و گابریلا و ئالۆی و خالیلۆو دەکردەوە، تۆ بڵێی لە هێرشەکە دەرباز بووبن؟

هەموویانم لە دەست دابوو. خێزانەکەم، هاوڕێکانم.

بـەبیرما هـات ئەوکاتـەی لەگـەڵ خێزانەکەمـدا تـازە چـووبووینە (مۆگبوعـۆ). بـاوکم مەراسـیمێکی بەبۆنـەی پیرۆزکردنـی خـانووە نوێیەکەمانەوە، ڕێکخست. دراوسێ نوێیەکانمان بانگهێشـت کـران. بـاوکم لەکاتی مـەراسیمەکەدا لەناو خەڵکەکەدا هەستایە سـەرپێ و وتـی: "لـە خودا و ڕۆحی پێشینانمان دەپاڕێمەوە خێزانەکەم بۆ هـەتا هەتایـە پێکـەوە بهێننەوە".

سەیری ئێمەی کرد، دایکم برا بچووکەکەمی بـە باوەشـییەوە گرتبـوو. من و جوونیەریش لە تەنیشت یەکەوە وەستابووین و شـیرینیمان دەخـوارد. پیاوێکی پیر هەستایە سەرپێ و درێژەی بە قسەکانی باوکم دا "هیوام وایە خودا و ڕۆحی پێشینان ئاگـاداری خێزانەکـەت بـن، تەنانـەت ئەوکاتـەی یـەکێکتان دەپەڕێتـەوە بـۆ دنیـای ڕۆحـەکان. بـۆ خێزانـەکان و کۆمەڵگەکەمان"، ئەمەی وت و دەستی بەرەو ئاسمـان بـەرزکردەوە. بـاوکم هاتە لای دایکمەوە و داوای لە من و جونیـەر کـرد نزیـك بینـەوە. بـاوکم دەستی لە ملمان کرد و خەڵکەکە چەپڵەیان لێدا، وێنەگرەوەکـەش چـەند وێنەیەکی گرتین.

پەنجەم خستە سەر پێڵووی چاوەکانم تـا ڕێ لـە فرمێسـکەکانم بگـرم، خۆزگەم دەخواست جارێکی تر لەگەڵ خێزانەکەم کۆببووینایەتەوە.

هـەموو سـێ ڕۆژ جارێـك دەچـووینە کامـاتۆر، تـا بـزانین خـەڵك گەڕاونەتەوە یاخود نا، بەڵام هەموو هەوڵەکانمان بێ سوود بـوون، چـونکە هیچ هێمایەکی زیندوو لەو جێیە نەمابوو. سامم لە بێدەنگی ئـەو گونـدە دەکردەوە، لە دەنگی بایەکـە کـە سـەربانە بـە تەنەکـە داپۆشـکراوەکانی

دەجووڵانـدەوە. هەسـتم دەکـرد لـە جەسـتەم هاتوومەتـە دەرەوە و بـەرەو شوێنێکی تر دەڕۆم. جێ پێی هیچ کەسێك دیار نەبوو.

تەنانـەت مارمێلکـەکانیش لـەناو دێیەکـەدا هاتوچـۆیان نـەبوو. باڵندەکان و سیسرکەکان گۆرانییان نەدەوت. دەنگی ترپەی دڵم نزمتر بـوو لە پێیەکانم. هەرکات بگەڕاینایەتەوە بۆ دێیەکە هەمیشە جێ پێیـەکانمان گسك دەدا تا دوامان نەکەون، کاتێ دەگەڕێینەوە بۆ جێیە نهێنییـەکانمان. دوایەمین جار من و کالۆکۆ گەڕاینەوە بۆ دێیەکە سەگەکان جەژنیان بـوو بە دەوروخولی لاشەی ئیمامەکە. سەگێك قۆڵەکـەی بـە دەمـەوە گرتبـوو ئەوەی تریان قاچی. بەسەرییەوە سیسـرکەکان باڵـەفڕکێیان بـوو، خۆیـان ئامادە دەکرد تا ئەوانیش بەسەر لاشەکەوە بنیشـنەوە. تـەواو وەڕس ببـووم لەو ژیانە. وەك ئەوە وابوو هەمیشە لە چاوەڕوانی مردندا بم. بۆیە بڕیارم دا بچمە جێیەك، هەرچۆنێك بێت کەمێك بێ مەترسی بێت. کالۆکۆ دەترسـا ئەوێ جێبهێڵێت، پێی وابوو چوونە ناو دارسـتانەکە چـوونە نـاو مەرگـە. بڕیای دا لای زەلکاوەکە بمێنێتەوە.

هیچ شتێك نـەبوو لەگـەڵ خـۆمی بـەرم. چـەند پرتـەقاڵێکم خسـتە گیرفانەکانمەوە، قەیتانی کالە دڕاو و کۆنەکانم توندکردەوە، ئامادە بووم بـۆ ڕۆیشتن. ماڵئاوایم لە هەمووان کرد و بەرەو خۆرئاوا کەوتمە ڕێ. هـەر ئـەو جێیەم جێهێشت، چوومە سەر ڕێگـە سـەرەکییەکە و هەسـتم دەکـرد لـە بەتانییەکی غەماوی پێچراومەتەوە، دەستم کـرد بـە گریـان. نەمـدەزانی لەبەرچی، ڕەنگە لەبەر ئەوە بێـت کـە نەمـدەزانی چـیم لـێ بەسـەردێت.

کەمێك لە قەراغ ڕێگەکە دانیشتم تا فرمێسکەکانم وشکبوونەوە، پاشان بەڕێکەوتم.

بە درێژایی ڕۆژ بەڕێگەوە بووم و بۆ لای هیچ کەسێك لەوانەی لەسەر ڕێگاکە یان گوندەکان دەمبینین، نەدەڕۆیشتم. جێی هیچ پێیەك نەدەبینرا و تەنها دەنگ دەمبیست، دەنگی هەناسەکانم و پێیەکانم بوون.

بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ لە بەرەبەیانەوە تا خۆرئاوابوون بەڕێگەوە بووم، هیچ کاتێك لەگەڵ کەسدا قسەم نەدەکرد. شەوانە لە دێیە چۆڵکراوەکان دەخەوتم و بەیانیانیش چارەنووسی خۆمم هەڵدەبژارد و ڕێگەیەکم دەگرتە بەر. ئەوەی بەلامەوە گرنگ بوو ئەوە بوو دووبارە بەهەمان ڕێگا نەڕۆمەوە کە لێی هاتووم. هەر یەکەم ڕۆژ پرتەقاڵم لێبڕا، بەڵام لەهەر گوندێك کە لێی دەخەوتم، کەمێکی ترم کۆدەکردەوە. هەندێك جار بە کێڵگەکانی کاساڤا تێدەپەڕیم. هەندێکیانم لێدەکردنەوە و هەر بە کاڵی دەمخواردن. ئەوەی لە زۆربەی گوندەکان دەستم دەکەوت، گوێزی هیندی بوو، بەڵام نەمدەزانی چۆن بەسەریدا سەرکەوم. هەوڵم دەدا، بەڵام مەحاڵ بوو. تا ڕۆژێك گەیشتمە گوندێك، ئەوەندە برسی و تینوو بووم. هیچ شتێك نەبوو تا بیخۆم، ئەوەی هەبوو تەنها چەند گوێزی هیندییەك بە لقەکانەوە خۆیان شۆڕکردبووەوە وەك ئەوەی بیانەوێت گاڵتەم پێ بکەن و داوام بکەن ئاستەمە ڕوونی بکەمەوە چۆن، بەڵام بەخێرایی بەسەر دارەکەدا سەرکەوتم. لەوکاتەدا بیرم لە بێ ئەزموونی خۆم دەکردەوە لەم جۆرە کارانەدا. چەند دانەیەکم لێکردەوە. بە خێرایی هاتمەوە خوارەوە بەدوای شتێکدا دەگەڕام تا پێی بشکێنم. خۆشبەختانە داسێکی کۆنم پەیدا کرد و دەستم کرد بە

لەتکردنی. پاش ئەوەی تەواوبووم لەسەر جۆلانەیەك کەمێك پشووم دا. پاش ئەوەی کەمێك هێزم تێگەڕا. هەستامە سەر پێ و هەستم دەکرد ئەمجارەیان هێزی زیاترم هەیە تا چەند دانەیەکی تر لێبکەمەوە، بەلام مەحاڵ بوو! هەرچەند بازم هەڵدەدا خلۆر دەبوومەوە بۆ خوارەوە. چەندین جار هەوڵم دا، بەلام تا نیوەی سەردەکەوتم و دەکەوتمەوە خوارەوە. هەرجارەو ناستەمتر بوو لە جاری پێشوو. ماوەیەکی زۆر بوو پێنەکەنیبووم، بەلام ئەمجارە بە جۆرێك پێدەکەنیم کە توانای دەستبەسەرداگرتنیم نەبوو. دەمتوانی ڕاپۆرتێکی زانستی لەسەر ئەو ئەزموونەم پێشکەش بکەم!

ڕۆژی شەشەم بوو کە قسەم لەگەڵ خەڵك کرد، پاش ئەوەی گوندەکەم جێهێشت و بەدوای گوندێکی تردا وێڵ بووم. گوێم لە دەنگی چەند کەسێك بوو. بە وریاییەوە نزیکتربوومەوە. ئاگاداری بەر پێی خۆم و گەلا وشکەوەبووەکان بووم تا دەنگێکیان لێوە نەیەت. لەپشت دەوەنەکانەوە وەستام و سەیری ناو ڕووبارەکەم کرد، هەشت کەسی تێدا بوو مەلەیان دەکرد. چوار کوڕ پێدەچوو تەمەنیان وەك من دوانزە ساڵ بن. دوو کچ و ژن و پیاوێك، بۆماوەیەك چاوەڕێم کرد تا دڵنیابووم کە بێ مەترسین. بڕیارم دا نزیکتر بمەوە و منیش بچمە ڕووبارەکەوە بۆ مەلەکردن. بۆ ئەوەی نەیانترسێنم، گەڕامەوە و سەرلەنوێ بەرەو ڕوویان ڕۆیشتم. پیاوەکە یەکەم کەس بوو کە بینیمی. "کووشی-وۆ. سلاوت لێبێت بەڕێز" سلاوم لێکرد و بزەیەکم کرد. لە ڕووخسارە بزەئامێزەکەم ورد بووەوە. هیچی نەوت. وامدەزانی زمانی کریۆ نازانێت، بۆیە بە زمانی خێڵەکەی خۆم کە مێندی بوو، سلاوم لێکرد. "بو-واه. بی گا هوین یی نا". هێشتا وەلامی نەبوو.

جلەکانم داکەند و بازم هەڵدایە ناو ئاوەکە. کاتێک هاتمەوە سەر ڕووی ئاوەکە، هەموویان لەناو ئاوەکەدا بوون، بەڵام کەسیان مەلەیان نەدەکرد. پیاوەکە کە پێدەچوو باوك بێت، پرسی "خەڵکی کوێیت و بۆ کوێ دەچیت؟" بە زمانی مێندی پرسی، بەڵام کریۆشی زۆر باش دەزانی. "خەڵکی ماتروجۆنگم، نازانم بۆ کوێ دەچم". ڕووخساری خۆمم سڕی و بەردەوام بووم "ئەی تۆ و خێزانەکەت بۆ کوێ دەچن؟" بەڵام پشتگوێی خستم و وا خۆی نیشان دا کە گوێی لێم نەبووە. بەردەوام بووم، پرسیارم لێکرد دەربارەی نزیکترین ڕێگا تا بگەیەنێتە بۆنتێ. دورگەیەکە لە باشووری سیارا لیۆن ئەو کاتە یەکێك بوو لە جێیە هەرە بێ مەترسییەکان. جاربەجار خەڵکم دەدۆزییەوە کە ڕوونکردنەوەی باشتریان هەبوو کە چۆن دەتوانم بگەمە ئەو دورگەیە.

بە تۆنی دەنگی پیاوەکەدا بۆم دەرکەوت کە نایەوێت چیتر نزیکیان بم و متمانەی پێم نەبوو. سەیری ڕووخساری پڕ گومانی ژن و منداڵەکانم کرد. پێم خۆش بوو خەڵکی تر ببینم، لە هەمان کاتدا دڵگران بووم بەهۆی جەنگەوە چیتر ناسینی خەڵکانی تر چێژ بەخش نەبوو. تەنانەت کوڕێکی تەمەن دوانزەساڵیش متمانەی پێ نەدەکرا. لە ئاوەکە هاتمە دەرەوە و سوپاسی پیاوەکەم کرد و بەرەو ئەولایە ڕۆیشتم کە ئەو بۆی دەستنیشانکردم. بەداخ بووم ناوی ئەو گوندانەم نەدەزانی کە ئەو کاتە خواردنیان پێدەدام و لەناویاندا بۆ خەوتن دەمامەوە. کەس نەبوو تا پرسیاری لێبکەم، لەو وڵاتەش هیچ هێمایەك بۆ ناوی گوندەکان هەڵنەدەواسرا.

# هەشت

دوو ڕۆژ بێ ئەوەی بخەوم، درێژەم بە ڕێگا دا. تەنها بۆ ئاو خواردنەوە لای جۆگەلەکانەوە وچانم دەدا. هەستم دەکرد کەسێك دوام کەوتووە. زۆرجار سڵم لە سێبەری خۆشم دەکردەوە و ترس بۆ چەند میلێك ڕاوی دەنام. هەموو شتێك زۆر دڕندانە دەهاتە بەرچاو. تەنانەت پێدەچوو ڕەشەباکەش بیەوێت هێرشم بکاتە سەر و ملم بشکێنێت. دەمزانی بەڕاستی برسیم، بەڵام هێزم نەبوو بەدوای خواردندا بگەڕێم، نەفسم نەدەچووە سەر هیچ شتێك. بەلای گوندێکدا تێپەڕیم کە لاشەی ژن و پیاو و منداڵ لە هەموو تەمەنێك، وەك گەڵا دوای ڕەشەبایەکی بەهێز، پەخش ببوون. لە چاوەکانیاندا ترس بەدی دەکرا، پێدەچوو مەرگیش نەیتوانیبێت لەو شێتییە ئازادیان بکات. سەرم دەبینی کە بە خشت پان کرابووەوە. چەند کەسێك بە مشار سەریان لە جەستەیان جیاکرابووەوە. ڕووبارەکە پڕ خوێن ببوو، چیتر شەپۆلی نەدەدا. هەرکات ئەو دیمەنانەم دەهاتەوە بەرچاو، خێراتر هەنگاوم دەنا، چاوەکانم توند لێك دەنان تا چیتر بیر نەکەمەوە، بەڵام دیاربوو چاوەکانی ناو مێشکم دانەدەخران هەر زوو زوو بە وێنەی ئەوانەی بینیبووم هەراسانی دەکردم. ترس هەموو لەشی ڕادەتەکاند و سەرم گێژی دەخوارد. گەڵاکانم دەبینی بەسەر لقەکانەوە کەوتبوونە سەما، بەڵام هەستم بە بوونی با نەدەکرد. لە سێیەم ڕۆژدا، خۆم لەناو دارستانێکی چڕوپڕدا دۆزییەوە، خۆم لەژێر چەند درەختێکی گەورەدا دۆزییەوە کە لقەکانی

بەسەرمدا شۆڕ ببوونەوە. دیمەنی ئاسمانیان لێشاردبوومەوە. بەبیرمدا نەدەهات چۆن گەیشتوومەتە ئەو جێیە. وەخت بوو شەو دابێت، هەر زوو درەختێکم دۆزییەوە کە زۆر بەرز نەبوو بۆ سەرکەوتن. لقەکانی بەناو یەکدا چووبوون و شێوەی جۆلانەیەکیان پێکهێنابوو. ئەو شەوە لەنێوان زەوی و ئاسمان لە باوەشی ئەو درەختە، خەوم لێکەوت.

بۆ بەیانی، پشتم ئازاری زۆر بوو، بەهۆی ئەو جێیە دوێنێ شەو تێیدا خەوتبووم، بەڵام بە پرۆش بووم هەر زوو بکەومە ڕێ. لەسەر ڕێگاکە لای کانیاوێکەوە دانیشتم کە بەژێر بەردێکی گەورەدا دەڕۆیشت. سەرنجی مارێکی ڕەشم دا کە لەپشت دەوەنەکەوە گەڕایەوە دواوە، هەر زوو لقە دارێکم بەدەستەوە گرت تا بەرگری لە خۆم بکەم. دانیشتم و دەستم کرد بە یاریکردن بە گەڵاکان تا خۆم لەبیرکردنەوە بەدوور بگرم. مێشکم بەردەوام ئازاری دەدام، هەموو هەوڵێك بۆ خۆ بەدوورگرتن لەو بیرکردنەوانە بێسوود بوو.

بڕیارم دا پیاسە بکەم، بەو لقەدارەی پێم بوو، بە زەوییەکەمدا دەکێشا. بە درێژایی ئەو ڕۆژە تا ئێوارە پیاسەم دەکرد و لە کۆتاییدا خۆم لە هەمان شوێن بینییەوە کە دوێنێ شەو تێیدا خەوتبووم. دواجار دانم پێدا نا کە ونبووم، ماوەیەکی زۆرم دەوێت تا دێمە دەرەوە. بڕیارم دا کەمێك ماڵە نوێیەکەم بۆ خۆم خۆش بکەم، چەند گەڵایەکم کۆکردەوە، خستمە سەر جێی خەوتنەکەم تا چیتر پشتم ئازارم نەدات. بەدەوری دارستانەکە دەخولامەوە تا شارەزای ڕێگاکە بم. هەر بە تەواوی جێی خەوتنەکەم شارەزا بووم، زەوییەکەم لە گەڵای وشکەوەبوو پاککردەوە، دەستم کرد بە هێڵ

کێشان لە جێی خەوتنەکەم تا ئەو کانییەی کە بۆ یەکەمین جار دراوسێ نوێیەکەمم تیا بینیبوو. ئێستا مارێکی تر بوو، ئاوی دەخواردەوە، هەر منی بینی بێ جوولە وەستا. من بەردەوام بووم لە کارەکانم، ئەویش بە ئەسپایی لێم دوورکەوتەوە. ئەو هێلانە یارمەتی دەدام شارەزای جێی خەوتنەکەم، تا ڕێی کانییەکە بم. پاش ئەوەی بە تەواوی ئەو ناوچەیە شارەزا بووم، دانیشتم و هەوڵم دا بیربکەمەوە کە چۆن ڕێگای دەرچوون دەستنیشان بکەم، بەڵام پێدەچوو ئەم هەنگاوەم ئاسان نەبێت، خۆم لە بنەڕەتدا لە بیرکردنەوە دەترسام. بۆیە وازم هێنا، هەرچەندە هەستم دەکرد ونم و تەنیام، بەڵام بۆ ماوەیەکی کاتیی ئەو جێیە بۆ من باشتر بوو.

بە درێژایی ڕێگای کانییەکە چەند جۆرە میوەیەك هەبوون کە تەواو پێگەیشتوو دیاربوون، تا ئێستا نەمبینیبوون و تامم نەکردبوون. باڵندەکان دەیانخوارد. منیش بڕیارم دا کەمێکیان لێ تاقی بکەمەوە. تەنها شت بوو کە هەبێت. کەواتە یان دەبێت بیانخۆم، ڕەنگە ژەهراوی بن، یان لە برساندا دەمرم. بیرم دەکردەوە گەر باڵندەکان بیخۆن و بژین، ڕەنگە منیش زیندوو بمێنم. میوەکە شێوەی وەك لیمۆ وابوو. ڕەنگی دەرەوەی زەرد و سوور تێکەڵ بوو. ناوەکەی ڕەق و ئاودار بوو، تۆوەکانی بچووك بوون. بڕیارم دا چەند دانەیەکی لێتاقی بکەمەوە. تامی وەك مانگۆ، یان پرتەقاڵ وابوو. تامی ئەوەندە خۆش نەبوو وەك بۆنەکەی، بەڵام لە هیچ باشتر بوو. ڕەنگە نزیکەی دوانزە دانەیەکم لێخواردبێتن. پاشان کەمێم ئاوم خواردەوە و دانیشتم و چاوەڕێی ئەنجامەکەی بووم.

بیرم لەو کاتانە دەکردەوە کە مـن و جوونیـەر دەچـووین بـۆ کابـاتی و لەگەڵ باپیرەم لەدەوری کێڵگەکانی قاوەدا پیاسـەمان دەکـرد. پاشـان ئـەو گەڵاو درەختانەی پیشان دەداین کە توێکڵەکەیان گـرنگ بـوو لـە بـواری پزیشکیدا. هەر جارێك سەردانمان دەکرد، جۆرە دەرمانێکی دەداینێ کە بـۆ پاراستنی زانیاری و لەبیرچوونەوە بەسوود بوو. بە زمـانی عـەرەبی چـەند دۆعایەکی لەسەر لەوحێك دەنووسی بە مرەکەبێك، کە ئـەویش لـە جـۆرە دەرمانێکی تر دروستکرابوو. پاشان لەوحەکە دەشۆردرایەوە و ئاوەکەی کـە بە (نێسی) ناسرابوو لە بووتڵێکدا هەڵـدەگیرا. پێویسـت بـوو بـە نهـێنی بیهێڵینەوە و پێش کاتی تاقیکردنـەوە لـە خوێندنگـە دەمـانخواردەوە. بـە درێژایی قۆناغی بنەڕەتی و ناوەندی، هەموو ئەوانەم بیردەهاتەوە کە فێـری ببـووم. زۆرجـار بـە شـێوەیەك سـوودی هـەبوو کـە دەمتـوانی هـەموو تێبینییەکان و هەموو نووسراوەکانی تری ناو دەفتەرەکەم بێنمەوە بەرچاوم، بە جۆرێ هەستم دەکـرد کتێبەکـە لـە مێشـکمدا چـاپکرابێت. ئەمـەش یەکێك بوو لە سەرسووڕهێنەرەکانی ژیانی منداڵیم. تـا ئـەمڕۆش توانـام هەیـە هـەموو یادگارییـەکان ژیـانی ڕۆژانـەم بـە وردی لـە مێشـکمدا هەڵدەگرم و بیرم نەچنەوە.

***

کەوتمە گەڕان بە دارستانەکەدا بەدوای جۆرە گەڵایەك کە بـاپیرەم پێـی وتبووم بۆ لابردنی کاریگەری ژەهر، نەبا ئـەو میوەیـەی خـواردم ژەهـراوی کردبێتم، بەڵام نەمدۆزییەوە.

دوو کاژێر تێپەڕ بوو، هیچ ڕووی نەدا. بۆیە بڕیارم دا خۆم بشۆم. ماوەیەکی زۆر بوو خۆم نەشتبوو. جلەکانم پیس بوون و کالەکانم بۆگەنیان کردبوو. پێستم لەتاو چڵك لینج ببوو. هەر یەکەم جار ئاوم کرد بە لەشمدا، پێستم لینج بوو. هیچ سابوونێك نەبوو، بەڵام لە لایەکی دارستانەکە جۆرە گیایەك هەبوو وەك سابوون بەکاردەهات. لە یەکێك لە سەردانەکانم بۆ لای داپیرەم، بەم جۆرە گیایە ئاشنا بووم. کاتێك چەند گیایەکم بە دەستەکانم گووشی، کەفێکی دروستکرد و ماوەیەکی زۆر بۆنێکی خۆشی بە جەستەم بەخشی. پاش ئەوەی خۆم شت، دەستم کرد بە شتنی جلەکانم لە ئاوم هەڵکێشان و بەسەر گیاکەدا بڵاوم کردنەوە تا وشك ببنەوە، بەڕووتی دانیشتم و کەوتمە پاککردنەوەی ددانەکانم بە پارچە دارێك. لەوکاتەشدا مامزێك پەیدا بوو، پێش ئەوەی بچێتەوە بەلای کاروباری خۆیەوە، کەمێك لێمی ڕووانی، بۆ ئەوەی خۆم لە بیرکردنەوە بە دوور بگرم، گوێم بۆ دەنگی باڵندەکان دەگرت کە تێکەڵ بە قیژەی مەیموونەکان و بابوونەکان ببوون.

ئێوارە، جلەکانم هێشتا شێدار بوون. پێش ئەوەی شەو دابێت، لەبەرم کردنەوە تا گەرمی لەشم وشکیان بکاتەوە. سەرەڕای خواردنی ئەو میوەیەی ناویم نەدەزانی، هێشتا زیندوو بووم، بڕیارم دا کەمێکی تر لەو میوەیە بخۆم بۆ نانی ئێوارە، بەیانی کە لە خەو هەڵدەستام کەمێکی ترم لێدەخوارد، بۆ نیوەڕۆ کەمێکی ترم دەخوارد، ئەو میوەیە تەنها سەرچاوەی خواردن بوو بۆم. هەرچەندە میوەکە زۆر بوو، بەڵام دەمزانی هەر زوو نامێنێت، زۆرجار هەستم دەکرد باڵندەکان مۆڕەم لێدەکەن و لێم تووڕەن لەبەر ئەوەی خواردنەکانیان دەبەم.

سەختترین شت لە مانەوەم لە دارستانەکە، بریتی بوو لە تەنهایی، ڕۆژ بەڕۆژ بەرگەگرتنی ئاستەمتر دەبوو. تەنهاییش واتە زۆر بیرکردنەوە. بەتایبەتی کە شتێکی تر جگە لەوە نییە تا خۆتی پێوە سەرقاڵ بکەیت. حەزم بەوە نەدەکرد، هەوڵم دا تا خۆم لە بیرکردنەوە بەدوور بگرم، چونکە ئەوەی بە مێشکمدا گینگڵی دەخوارد، تووشی غەمی دەکردم، بەڵام پێدەچوو سوودی نەبێت... جگە لە خواردن و ئاوخواردنەوە و ڕۆژی جارێك خۆشتن، ئەوەی پێوەی سەرقاڵ بووم، جەنگ بوو لەگەڵ خوودی خۆمدا تا چیتر بیر نەکەمەوە لەو دیمەنانەی بینیبوومن، یان بیربکەمەوە چی بەسەر ژیانمدا دێت، یان هاوڕێکانم و خێزانەکەم. هەرچەند من بەرەنگاری خۆم بوومایەتەوە، ڕۆژیش ئەوەندەی تر درێژ دەبوو سەرم تا دەهات قورستر دەبوو. منیش وەڕس ببووم دەترسام گەر بخەوم ئەوەی بە ڕۆژ لە خۆمی قەدەغە دەکەم، لە شەودا بێتە خەوم.

بەناو دارستانەکەدا دەگەڕام تا شتێك بۆ خواردن پەیدا بکەم جگە لەوە ڕێگای دەرچوون بدۆزمەوە. ترسی ئاژەڵە دڕندەکانی وەك شێر و بەرازە کێوییەکان و پشیلەکانم هەبوو. بۆیە بە قەراغ درەختەکاندا دەڕۆیشتم تا بتوانم بەسەریاندا سەرکەوم و خۆم بشارمەوە. بەهەموو هێزی خۆم هەنگاوم دەنا هەرچەند دەڕۆیشتم دارستانەکە چڕتر دەبووەوە، هەرچەند خێراتر هەنگاوم دەنا، درەختەکان بەرزتر دەبوون کە کەڵکی ئەوەیان نەبوو بەسەریاندا سەرکەوم، یان لەسەریان بخەوم.

ئێوارەیەکیان بەدوای درەختێکدا دەگەڕام کە لقەکانی جیاکراوە وەك چەتاڵ بنوێنێت. لەناکاو گوێم لە چەند مرخەیەك بوو، دڵنیا نەبووم چ

جۆرە ئاژەڵێکە. دەنگەکە تا دەهات زیاتر دەبوو. بەخێرایی بەسەر درەختێکدا سەرکەوتم. بینیم چەند بەرازێکی کێویی بەڕاکردن نزیک دەبنەوە، ئەوە یەکەمین جار بوو بەرازی کێویی ببینم، ئەوەندە گەورە بوون گەر بە پێوە بوەستانایە، ڕەنگە لە من درێژتر بوونایە. بەژێر دارەکەدا هاتوچۆیان بوو، ددانەکانیان تیژ و لەژێر دەمیانەوە داچەقیبوون. یەکێکیان لەژێر درەختەکە وەستا و بەهەموو لایەکدا کەوتە بۆنکردن، وەك ئەوەی هەستی بە بوونم کردبێت. چاوەڕێم کرد تا دوورکەوتنەوە، پاشان هاتمە خوارەوە، دوو بەراز بە خێرایی دوام کەوتن، نزیکەی نیو میل بەدوامەوە بوون، تا خۆشبەختانە درەختێکم بەرچاو کەوت کە توانای سەرکەوتنیم هەبوو. بەرازەکانیش وەستان و گازیان لە بنکی درەختەکە دەگرت و بە دەنگی بەرز دەیانمرخاند، پاشان بەرازەکانی تریش گەیشتن و هەموو بە دەوری درەختەکە دەستیان کرد بە گاز گرت. تا بۆم کرا سەرکەوتمە سەرەوە تا دواجار دەستیان هەلگرت و ڕۆیشتن. پاشان سیسرکێك شەوی بانگهێشت کرد و کۆتایی بە ڕۆژ هێنا.

جارێکیان داپیرەم چیرۆکێکی بۆ گێڕامەوە دەربارەی ڕاوچییەکی بەناوبانگ کە ڕاوی بەرازە کێوییەکانی دەکرد. جادوویەکی بەکاردەهێنا تا خۆی وەك ئەوان لێبکات. پاشان ڕەوە بەرازەکانی دەبردە پانتاییەك و بە جۆرە گیایەك خۆی دەکردەوە بە مرۆڤ و تەقەی لە هەموو بەرازەکان دەکرد. ڕۆژێك بێچووە بەرازێك ڕاوچییەکە دەبینێت گاز لە گیایەك دەگرێت دووبارە دەبێتەوە بە مرۆڤ، بڕیار دەدات بە هەموو هاوڕێکانی بڵێت. پاشان هەموویان بە دارستانەکەدا دەگەڕێن و هەموو گیایە جادووییەکان لەناو

دەبەن. بۆ ڕۆژی دواتر ڕاوچییەکە بەرازەکان دەباتە پانتاییەکە. دەیەوێت گیاکە بەکاربێنێت، بەڵام نایدۆزێتەوە. دواتر بەرازەکان پارچە پارچەی دەکەن. ئیتر لەو ڕۆژەوە بەرازە کێوییەکان ڕقیان لە مرۆڤە و متمانەیان بە مرۆڤ نییە. هەرکاتێك کەسێك لە دارستانەکە ببینن، وا دەزانن بۆ تۆڵەی ڕاوچییەکە هاتووە.

***

دوای ئەوەی بەرازەکان ڕۆیشتن. بە وردی سەیری زەوییەکەم کرد و هاتمە خوارەوە. بەردەوام بووم لە ڕۆشتن، دەمویست پێش دەمەوبەیان ئەو ناوچەیە جێبهێڵم. دەترسام دووبارە بەرازەکان بێنەوە ڕێگام. ئەو شەوە کوندەپەپووەکانم دەبینی لە کونی درەختەکانەوە دەهاتنە دەرەوە چاوەکانیان دەگێڕا و خۆیان دەکێشایەوە تا بە دەوروبەر ناشنابن و خۆیان بۆ ئەو شەوە ئامادە بکەن. ئەو شەوە زۆر بە خێرایی و بە بێدەنگ دەڕۆیشتم. تا قاچم نا بە کلکی مارێکدا و کەوتە فسەفسکردن و بەرەو ڕووم هات. بە هەموو هێزی خۆم بۆ ماوەیەکی زۆر ڕامکرد.

کاتێك تەمەنم شەش ساڵان بوو، باپیرەم جۆرە دەرمانێکی خستبووە جەستەمەوە تا لە گەستنی مارەکان پارێزراو بم و بتوانم کۆنترۆڵی مارەکان بکەم، بەڵام هەرچوومە خوێندنگە پێدەچوو چیتر توانای ئەو دەرمانە لە لەشمدا نەمابێت و بەرگری مارەکانم پێ نەکرێت.

کاتێك منداڵ بووم، باوکم دەیوت: "گەر زیندوو بیت، مانای وایە شتێکی باش هەیە لە ژیانت چاوەڕێتە. ئەگەر هیچ شتێکی باش نەبوو لە

ژیانت تا ڕووبدات، ئەوە کاتی مردنت هاتووە". بە درێژایی گەشتەکەم بیرم لەم وتانەی باوکم دەکردەوە، هەر ئەوانەش وایان لێدەکردم بەردەوام بم لە ڕۆیشتن، هەرچەندە نەمدەزانی بۆ کوێ دەڕۆم، بەڵام وشەکانی باوکم وەك ئۆتۆمبێلێك ڕۆحمی بەرەو پێشەوە دەگەیاند و زیندوو دەیهێشتەوە.

بۆ ماوەی مانگێك زیاتر لە دارستانەکە بووم. پاشان تێکەڵ بە خەڵك بوومەوە. هەموو ئەوانەی تا ئێستا لەگەڵیان بووم. مەیموونەکان و مارەکان و بەرازە کێوییەکان و مامزەکان بوون کە نەدەکرا لەگەڵ کەسیان بدوێم.

هەندێك جار سەیری بێچووە مەیموونەکانم دەکرد کە لەم دار بۆ ئەو دار مەشقیان دەکرد و بازیان هەڵدەدا. یان سەیری چاوی ئاسکەکانم دەکرد کاتێك هەستیان بە بوونی من دەکرد. جەنگی لقەکان کە دەیاندایەوە بە درەختەکاندا، ببوونە مۆسیقا بۆ من. ڕۆژانێك هەبوون کە دەنگی لقی درەختەکان دەبوونە میلۆدی و بەناو دارستانەکە دەنگی دەدایەوە و چێژیان پێدەبەخشیم.

بە هێواشی هەنگاوم دەنا، لەتاو هیلاکی و برسێتی و ئازاری پشتم بەملاولادا دەکەوتم. بەرەو لای چەند کەسێك ڕامکرد کە تەمەنیان نزیکەی وەك خۆم بوون. بە ڕێگایەکدا ڕۆیشتین کە دوو ڕێگای تر یەکیان گرتبووەوە و پێکیان هێنابوو. پانتۆڵێکی دەڵبم لەبەر کردبوو، کە لە دێیەکی چۆلکراودا دۆزیبوومەوە. بە پەتێك بەستبوومەوە تا نەکەوێتەخوارەوە کاتێك بە ڕێگادا دەڕۆم. لەگەڵ کوڕەکان کەوتمە ڕێ، هەموومان بە ترسەوە لەیەکترمان دەڕوانی. زەردەیەکی کەمم کرد تا ئەو

ترس و دوودڵییەی نێوانمان نەمێنێت. شەش کوڕ بووین. سیانیان لە خوێندنگەی ناوەندی سێنتینیاڵ لە (ماتروجۆنگ) لەگەڵم بوون. کانێی، ئەلهاجی، مووسا، بەڵام زۆر نزیك نەبووین، بەڵام هەرچوارمان زۆر بە توندی تێهەڵدانمان خواردبوو لەسەر ئەوەی بە شێوازێکی ناشرین وەڵامی قوتابی چاودێرمان دابووەوە. تەوقەمان لەگەڵ یەکتر کرد.

بەهۆی ئەو هێمایانەی لەسەر ڕوومەتیان بوو، دەمتوانی خێڵەکانیان بناسمەوە. ئەلهاجی و سەیدوو سەر بە خێڵی تێمن بوون، کانیێ و جوومـا و مۆریبا و مووسا سەر بە مێندی بوون. ئەوان پێیان وتم کە دەیانەوێت بۆ گوندی پێل بڕۆن، ناوچەیەك بوو لە بۆنتێ. بیستبوویان ئەوێ جێیەکی بێ مەترسییە و لەبەر ئەوەی لەلایەن هێزەکانی حکومەتەوە کۆنترۆڵ کرابوو.

بە هێواشی لەدوایانەوە ڕۆیشتم و هەوڵم دا بیری ناوەکانیانم بکەوێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی دەموچاویان نامۆ نەبوون. لە دوایانەوە بووم و تەنها ماوەیەکی کەم لەنێوانمان هەبوو. بۆم دەرکەوت چەند بەلامەوە ناڕەحەتە لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ بم. کانییێ کە لە هەموومان گەورەتر بوو پێدەچوو شانزە ساڵان بێت، لێمی پرسی کە لەکوێ بووم. زەردەیەکم کرد و وەڵامم نەدایەوە، ئەویش بە هێواشی کێشای بە شانمدا وەك ئەوەی بزانێت چیم بەسەر هاتووە. "بارودۆخەکان دەگۆڕدرێن و هەموو شتێك بەرەو باشبوون دەڕوات، کەمێکی تر ئارام بگرە"، دووبارە دەستی خستە سەر شانم و سەری لەقاند. بە زەردەیەك وەڵامم دایەوە.

ئەمجارەش لەگەڵ کۆمەڵێك کوڕ بووم. دەمزانی دەبێتە کێشە بۆم، بەڵام ئەوەم لە تەنیایی پێ باشتر بوو. حەوت کەس بووین. هەموو ساویلکەیی و

بێتاوانی منداڵیمان لەدەست دابوو، هەموومان ببووینە ئەژدیها. هیچیش لە دەسەڵاتی ئێمەدا نەبوو. هەندێك جار دەبوو بەدوای خەڵكدا ڕابكەین و هاوار بكەین بەسەریاندا، كە ئێمە ئەو كەسانە نین كە ئەوان بیری لێدەكەینەوە. دەمانویست پرسیاری ڕێگاوبانیان لێ بكەین، بەڵام مەحاڵ بوو.

بۆ ماوەی شەش ڕۆژ بەڕێگاوە بووین. پیاوێكی پیرمان بینی كە بە ئاستەم دەیتوانی بڕوات، لەسەر داڵانەكە دانیشتبوو. لە ناوەڕاستی گوندەكە. دەموچاوی ئەوەندەی چرچ تێدا بوو، بەلامەوە سەیر بوو هێشتا زیندووە، بەڵام هێشتا ڕووخساری بریقەی دەهات و بە هێواشی دەدوا. قسەكانی لە دەمی دەچوو پاشان دەیگوت. كاتێ دەدوا دەمارەكانی ناوچەوانی بەدیار دەكەوتن.

"هەر كە هەواڵی هاتنی حەوت كوڕ گەیشت، هەموو ڕایانكرد، بەڵام من نەمدەتوانی ڕابكەم. بۆیە بە تەنها بەجێمام، كەس نەبوو هەڵمبگرێت جگە لەوە نەمدەویست ببمە مایەی عەزێت بۆ ئەوانی تر"، پێمان وت ئێمە خەڵكی كوێین و دەمانەوێت بۆ كوێ بڕۆین. داوای لێكردین ئەو شەوە لەگەڵیدا بین و بەتەنها جێی نەهێڵین.

"كوڕینە پێدەچێت برسی بن. هەندێ یامی* لێیە لەو خانۆچكەیەی ئەوێ دەتوانن هەندێك بۆ خۆتان و بۆ منیش ئامادە بكەن؟" بە ڕێزەوە داوای لێكردین. ئەوەندەی نەمابوو خواردنەكە تەواو بكەین، بە هێواشی وتی: "كوڕەكانم، ئەم وڵاتە دڵە باشەكەی لەدەست داوە. خەڵكی چیتر

---

* یام: جۆرە پەتاتەیەكی شیرینی سوورە.

متمانە بەیەکتر ناکەن. سالآنێك لەمەوبەر زۆر بە گەرمی بەخێرهاتن دەکرایت لەم گوندە. هیوام وایە هەر زوو جێیەکی ئارام بدۆزنەوە پێش ئەوەی هەموو ئەم شتانە زیانتان پێ بگەیەنن".

بە گۆچانەکەی نەخشەیەکی کێشا "بەم شێوەیە دەگەنە (پیل)".

کانییێ پرسی "ناوت چییە".

زەردەیەك گرتی، وەك ئەوەی زانیبێتی ئەم پرسیارەی لێدەکەین "پێویست نییە ناوی من بزانن. پیاوێکی پیر بووم و بەجێمابووم، کە چوویتە دێیەکەی تر بەو شێوەیە باسم بکە".

سەیری ڕووخساری کردین و بەهێواشی دەدوا، هیچ غەمێك لە دەنگیدا بەدی نەدەکرا.

"تائەو کاتەی کۆتایی بە جەنگ دێت، بێگومان من زیندوو نامێنم. دەمەوێت مێشکتان بۆ هەڵگرتنی شتگەلێکی تر بەکاربێنن وەك لە ناوی من. ئەگەر زیندوو مانەوە، هەر وەك پیاوێکی پیر با لە بیرتاندا بم، ئێستا پێویستە بڕۆن". گۆچانەکەی ئاڕاستەی ڕێگاکە کرد، هەر بە قاچ نەخشەکەی سڕییەوە و سەری لەقاند و بەدەستی ڕاستی ماڵئاوایی لێکردین. پێش ئەوەی گوندەکە بەتەواوەتی لەبەرچاومان ون بێت، ئاوڕم دایەوە تا بۆ دوایەمین جار پیاوە پیرەکە ببینمەوە. سەری دانەواندبوو هەردوو دەستی خستبووە سەر گۆچانەکەی. بە ڕووخساریدا دیاربوو دەیزانی ڕۆژەکانی بەرەو کۆتایی دەڕوات، بەڵام غەمی ژیانی خۆی نەبوو، ئەوەندەی غەمی ئێمەی بوو.

دەنگوباسێك دەربارەی ئێمە (حەوت کوڕەکە) بڵاوببووەوە. هەر جێیەك دەڕۆیشتین پیاوی بە قەڵافەت گەورە بە تەوراسەوە دەوروخولیان دەدایـن تـا دەیانزانی تەنها منداڵێکین و لەدەست جەنگ ڕامانکردووە. زۆرجار سەیری نوکی مشارەکانم دەکرد و بیرم دەکردەوە دەبێت چەند ئـازاری هـەبێت گـەر بەوە پارچە پارچە بکرێم، هەندێك جاریش ئەوەندە شەکەت و برسـی بـووم گوێم پێ نەدەدا. لەو گوندانەی زۆر خەڵکی لێبوو، شەوانە کـە دەخـەوتین چـاوێکیان لەسـەرمان بـوو، بـە ڕۆژ کـە دەچـووینە نـاو ڕووبارەکـە بـۆ مەلەکردن دایکان بە پەلە منداڵەکانیان بـانگ دەکـرد و ڕایـان دەکـردە ماڵەکانیان.

# نۆ

بەیانییەکیان دەستبەجێ دوای ئەوەی بەلای گوندێکی خاپوورکراودا تێپەڕین، گوێمان لە دەنگێك بوو وەك دەنگی مەکینەی ئۆتۆمبێل وابوو، پێدەچوو ئەلْقەیەکی کانزایی بەناو قیرێکدا ببرێت و هەورەتریشقەی لێبدات. تا دەهات دەنگەکە نزیکتر دەبووەوە. دەستبەجێ لە ڕێگەکە لاماندا و لە دەوەنەکاندا خۆمان حەشاردا و خۆماندا بە زەوییەکەدا. هەموو لەیەکتر وردبووینەوە و بەدوای ڕوونکردنەوەیەکدا بووین بۆ ئەم دەنگە. تەنانەت کانییێ کە زۆربەی جار وەلام و ڕوونکردنەوەی دەدا، ئەمجارەیان هیچ وەلامێکی نەبوو. هەموو سەیری ڕووخساریمان دەکرد کە پڕ بوو لە شپرزەیی. بە چرپە وتی: "دەبێت بزانین ئەو دەنگە چییە ئەگینا ناتوانین بەردەوام بین بۆ ییێل". پاشان بە گاگۆلکێ بەرەو دەنگەکە ڕۆیشت. بەدوایدا ڕۆیشتین و بەهێواشی خۆمان لەسەر گەلا وشکەوەبووەکان دەخشاند. هەر نزیکبووینەوە دەنگەکە زیاتر بوو، بایەکی توند درەختەکانی بەردەممانی هەژاند. تەنها ئاسمانی شینمان بەدی دەکرد و هیچی تر. کانییێ بە دوودڵییەوە هەستایە سەرپێ و لە ناوچەکە وردبووەوە.

کانیێی بەردەوام بوو لە سەیرکردن وتی: "تەنها ئاو و لم دەبینم".

ئەلهاجی پرسی: "کەواتە چی دەبێتە هۆی ئەم دەنگە؟!"

کانییێ وتی: "ئەوەی دەیبینم تەنها ئاو و لمە!"

پاشان دەستی ڕاوەشاند تا ئێمەش نزیکتر بینەوە و سەیر بکەین. هەستاینە سەر پێ و بە چواردەوری خۆماندا چاومان گێڕا. دەمانویست بزانین چی بووەتە هۆی ئەو دەنگە. کانێی بێ ئەوەی هیچ بڵێت لە دەوەنەکە هاتە دەرەوە و بەرەو لای ئاوەکە ڕۆیشت.

ئەو دەنگەی بیستبوومان شەپۆلەکانی زەریای ئەتڵەسی بوون کە لرفەیان دەهات. پێشتر ئەم زەریایەم بینیبوو، بەڵام هەرگیز بەو ڕادەیە لێوەی نزیك نەبووم و لەبەردەمیدا نەوەستابووم. چاوەکانم پڕ لە دیمەنەکە کرد. ئاسمان ئەوەندە شین بوو وا دەردەکەوت لەگەڵ شینی ئاوەکە یەکبگرێتەوە. چاوەکانم کردنەوە و زەردەیەك گرتمی، تەنانەت لە کاتی ئەو هەموو شێتییەش جوانیی سروشت سەرگەردانی دەکردم، زیاتر تێی ڕامام.

نزیکتربووینەوە و لە قەراغ ئاوەکە دانیشتین و چاومان بڕییە زەریا و پێشبڕکێی نێوان شەپۆلەکان، کە بە سێ ڕیز دەهاتن. یەکەمیان بچووك بوو، بەڵام ئەوەندەی هێز هەبوو کە قاچی یەکێکمان لێبکاتەوە، دووەمیان بەرزتر و بەهێزتر بوو لە یەکەم، سێیەمیان لە ئەندازە بەدەر بەهێز بوو زیاتر لە ئاستی خۆی بەرز دەبووەوە بەرەوڕوومان کشا و بە خێرایی لە جێی خۆمان هەستاین. بە توندی دای بە قەراغ ئاوەکە و لمی ئەو ناوەی بەرزکردەوە بۆ سەرەوە. کاتێك گەڕاینەوە سەرنجمان دا پارچەی کەشتییەکی تێکشکاوی سەرئاوکەوتووی هێنایە قەراغەکە، لەگەڵ چەندین گیانەوەری دەریایی وەك قرژاڵ کە ئەوندە هێزیان نەبوو بە قەراغەکەدا سەرکەون، بەڵام هێشتا زیندوو بوون.

به بێدەنگی بەناو لەکەدا پیاسەمان کرد، چاوەڕێی هیچ مەترسییەك نەبووین لەم بەشەی ناوچەکە. یاریی زۆرانبازی و ڕاوڕاوێنمان دەکرد لە لەکەدا. تەنانەت جلەکانی ئەلهاجیمان تۆپەڵ کرد تا تۆپێکی فووتبۆڵی لێ دروست بکەین و یاریی پێ بکەین، هەرکات ئەلهاجی گۆڵی دەکرد سەمایەکی سۆوکس*ی دەکرد، هاوارمان دەکرد و پێدەکەنین و ئەو گۆرانیانەمان دەوتەوە کە لە ناوەندیی فێری ببووین.

دەمەو سەحەر بەناو لەکەدا پیاسەمان دەکرد و سەیری خۆرمان دەکرد وردە وردە هەڵدەهات. نیوەی ڕۆژ چەند خانۆچکەیەکمان بینی و بە پێشبڕکێ بەرەو ڕوویان ڕامانکرد. هەر نزیکبووینەوە، شپرزە و دوودڵ بووین. کەس لە گوندەکە نەبوو، دەستکەوانەکان لە زەوییەکەدا کەوتبوون، برنج ڕژابوو، قتووی مرەباکان ناویان لێدەتکا. تاگریش لەژێر خانووچکەکاندا بەجێهێڵرابوو. یەکەمین شت بە مێشکماندا هات ئەوە بوو، کە یاخیبووەکان پێش ئێمە لێرە بوون، لەناکاو ژمارەیەك ماسیگر بە تۆڕ و خەنجەرەوە هاتنە ژوورەوە. ئەوەندە شپرزە بووین بیرمان نەبوو ڕابکەین، هەر زوو دەستمان کرد بە گریان و پاڕانەوە، کە ئێمە هاوڵاتی مەدەنین و مەبەستمان زیان نەبووە. بە هەشت زمانی ناوخۆیی کە هەریەکەمان دەمانزانی پێمانوتن، بەڵام ئەوان بە قۆناغە تفەنگەکانیان

---

* سۆوکس رشەیەکی فەرەنسییە و (کانگا)، یان (لینگالا)شی پێ دەوترێت: سەمایەکی بەناوبانگی وڵاتی کۆنگۆیە، لە ساڵانی ١٩٣٠-١٩٤٠ەکان بە ئەفریقادا بڵاوبووەتەوە، بەتایبەتی لە وڵاتانی خۆرئاوای کیشوەرەکە.

کەوتنە لێیانمان تا کەوتینە سەر زەوی، پاشان لە دواوە توند دەستیان بەستینەوە و بردیانین بۆ لای سەرۆکەکەیان.

لە گوندەکە دەنگۆی ئەوە بلاو ببووەوە کە یاخیبووەکان زۆربەیان کوڕی گەنجن و بەڕێگاوەن بۆ ئەو ناوچەیە. هەر ئەمەیان بیستبوو. خۆیان ئامادەکردبوو، چەکەکانیان ئامادەکردبوو. چاوەڕێ بوون تا بەرگری لە خێزانەکانیان و ماڵ و حاڵیان بکەن. ئەوە یەکەمین جار نەبوو بۆ ئێمە و سەرسام نەبووین، بەلام بیرمان لەوە نەدەکردەوە هەرگیز ئەمە لە ناوچەکە ڕوودات. هەموو وامانزانی دواجار جێیەکی ئارامان دۆزیوەتەوە و لەهەموو مەترسییەك دوورین. چەند پرسیارێکیان لێکردین. وەك خەڵکی کوێین؟ بۆ کوێ دەڕۆین؟ بۆ ئەو ڕێگەیەمان هەڵبژاردووە؟

ئەلهاجی لە هەموومان بالابەرزتر بوو، زۆرجار وایاندەزانی لە هەموومان گەورەترە، هەوڵی دەدا بۆ سەرۆکەکەی ڕوون بکاتەوە کە ئێمە تەنها بێ هیچ مەبەستێك هاتووینەتە ئێرە. پاشان پیاوەکان قۆڵ و قاچیان کردینەوە و کالە دڕاوەکانیان لە قاچ داکەندین، ڕاویان ناین، خەنجەرەکانیان بە دواماندا ڕاوەشاند و هاواریان دەکرد بەسەرماندا.

تا ئەو کاتەی لە گوندەکە دوورکەوتینەوە، نەمانزانی مەبەستی ماسیگرەکان لەو جۆرە ئازاردانە چی بوو. تا ئەو کاتەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا بوو، سەروو ۱۲۰ پلە بوو، بەپێی پەتی خۆریش دەیدا لە لەکە و داختری دەکرد، هیچ درەختێك نەبوو تا ببێتە سێبەر. ڕۆیشتن بەسەر ئەو لمە وەك ڕۆیشتن بەسەر قیرێکی تازە دروستکرا وابوو. تەنها هیوا ئەوە بوو بەردەوام بین لە ڕۆیشتن و چاوەڕێی موعجیزەیەك بین تا ڕوومان تێ بکات.

نەماندەتوانی لە قەراغ ئاوەکە بڕۆین، جگە لەوەی شەپۆلەکان مەترسیدار بوون، لەگەڵ هەر هەنگاوێکمان لمەکە قووڵ دەبووەوە. پاش ئەوەی بۆ ماوەی چەند کاژێرێك گریام قاچەکانم سڕ و بێ هەست بوون. بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن، بەڵام چیتر هەستم بە بنی پێم نەدەکرد.

تا خۆرئاوابوون لەسەر لمە گەرمە سووتێنەرەکە بەڕێگاوە بووین. تا ئەوکاتە ڕۆژێکم نەبووە هێندەی ئەو ڕۆژە دووروودرێژ بێت. وامدەزانی خۆر ئاوابوون ئازاری قاچم کەم دەکاتەوە، بەڵام هەر گەرمییەکە بەرەو نەمان چوو. بنی پێیەکانم چیتر سڕ نەبوون، هەرکات قاچم هەڵدەبڕی، دەمارەکانم توند دەبوونەوە. بە ڕوونی هەستم دەکرد کە چۆن لمەکە ڕۆدەچێتە بنی پێیە خوێناوییەکانمەوە. ڕێگاکە ئەوەندە دووروودرێژ بوو، پێم وابوو نەتوانم بە زیندوویی بێنمەوە. ئارەقم کردبووەوە و هەموو لەشم لەتاو ئازار دەسەپاچەی کردبووم. دواجار، گەیشتینە خانوویەکی بچووك، چووینە ژوورەوە و بەدەوری شوێنی ئاگرەکە دانیشتین. فرمێسك بە چاوەکانمەوە بوو، بەڵام ئەوەندە تینوو بووم، توانای گریانم نەبوو، سەیری هاوڕێکانم کرد هەموویان دەگریان. بە دوودڵییەوە سەیرێکی بنی قاچەکانم کرد. پارچە گۆشتێك شۆڕ ببووەوە و خوێنی پیادا دەهاتە خوارەوە. لمیش بە پێستەکەیەوە بوو.

وا دەردەکەوت یەکێك بەتایبەتی بە خەنجەرێك، لەبنی پێمەوە تا پەنجەکانی قاچمی بڕیبێتەوە. لە کونێکی بچووکی سەقفە بە قامیش دروستکراوەکە چاوم بڕییە ئاسمان. نەمهێشت چیتر بیر لە قاچەکانم بکەمەوە. کاتێك بە هێمنی دانیشتبووین، ئەو پیاوەی خانۆچەکەیمان

گرتبوو، هاتە ژوورەوە. لەبەر دەرگاکە وەستا و ئاوڕی دایەوە و سەرنجی برینەکانمانی دا. چاوەکانی کەوتە سەر چاوە ترساوەکانمان. مووسا لەو کاتەدا قاچەکانی بەرزکردبووەوە و لەکەی لە گۆشتی قاچی جیادەکردەوە. هەموومان ئەژنۆکانمان توند گرتبوو تا قاچمان بە زەویدا نەکەوێت. پیاوەکە هێمای بۆ مووسا کرد کە بوەستێنێت. سەری ڕاوەشاند و چووە دەرەوە.

پاش چەند خولەکێك بە سەبەتەیەکی پڕ گژوگیا هاتە ژوورەوە. بەهێواشی خستییە سەر ئاگرێکی کز و پاشان لەسەر بنی پێی عەریەکەمان دایدا. هەڵمی گیاکە ڕۆدەچووە ناو بنی پێمانەوە و ئازارەکەی کەمتر دەکردەوە. پاشان چووە دەرەوە، بێئەوەی هیچ بڵێت.

پاشان بە شۆربای ماسی سوورەکراو برنج و دۆلکەیەك ئاوەوە هاتە ژوورەوە. خواردنەکەی لەبەردەمان دانا و هێمای کرد تا بیخۆین. دووبارە ونبووەوە. ئەمجارەیان بە تۆڕێکی ماسیگرتن و گلۆپێکی دەستی و جووتێك سەوڵ، زەردەیەکی پان و پۆڕ بە ڕووخسارییەوە بوو. "یو پیکین دێم دای فیلێ بێتاه؟" پێش ئەوەی چاوەڕێی وەڵامان بێت تا بزانێت باشترین یان نا، بەردەوام بوو، پێی وتین کە ڕایەخەکان بۆ خەوتن لەکوێدایە و ئەو دەچێت بۆ ڕاوەماسی و تا بەیانی نایەتەوە. تەنانەت خۆشی عەزێت نەدا تا پرسیار لە ناوەکانمان بکات، پێم وابوو بەلایەوە گرنگ نەبوو. پێش ئەوەی بڕوات مەرهەمێکی بە هەموومان دا، تا بیدەن لەبنی پێیەکانمان پێش خەوتن. هەموومان ئەو شەوە زۆر بێدەنگ بووین، تەنها وشەیەکمان نەوت.

بۆ بەیانییەکەی، پیاوە بێناوەکە هاتەوە و زەردەخەنەیەك لەسەر لێوی بوو، وەك ئەوەی پێی خۆش بێت کە تەندروستیمان باشە. کەسمان توانای ڕۆیشتنمان نەبوو، بۆیە بەدەوری خانۆچکەکە دەستمان کرد بە گاڵتەکردن بەیەکتری تا خۆمان لە بێزاریی بەدوور بگرین.

کانێی بە خۆفشانەوە باسی لەوە دەکرد کە ئەو باشترین یاریزانی فووتبۆڵ بووە، مووسا قاوغی عەلی بابایەکی تێگرت، ئەویش ویستی شەقی تێهەڵدات، پاشان زانی کە ناتوانێت. قاچەکانی کشانەوە بەرەو دواوە بەر بەردێك کەوت، دواجار لەتاو ئازار فووی بە بنی پێیەکانی دەکرد. مووسا دەستی کرد بە پێکەنین "چ جۆرە یاریزانێکیت، کە نەتوانیت شەق لە عەلی بابایەك هەڵبدەیت؟!" هەموومان دەستمان کرد بە پێکەنین.

مووسا ڕووخسارێکی بازنەیی هەبوو، باڵاکورت و قەوارەدار بوو. جووتێك گوێچکەی بچووکی هەبوو کە لەگەڵ ڕووخساریدا ڕێدەکەوت. چاوەکانی گەورە بوون، پێدەچوو بیانەوێت ڕووخساری جێبهێڵن. هەر کاتێك بیویستایە قایلمان بکات، چاوەکانی دەدرەوشانەوە.

کانیێ ڕووخسارێکی درێژ و هێمنی هەبوو. بە پێچەوانەی مووساوە قژێکی کورتی لە ڕادەبەدەر ڕەشی هەبوو، کە هەموو بەیانییەك خەریکی دەبوو. یان هەرکاتێك لە ڕووبارێك، یان جۆگەلەیەك بوەستاینایە، دەستی تەڕی بە قژیدا دەهێنا بە ئارەزووی خۆی قژی ڕێکدەخست. ئەلهاجی بە قاقاوە لێی دەپرسی: "چییە، بەتەمایت کچێك ببینیت؟" کانێی بە دەنگی نەرم و هێشتا بەدەسەڵات، کە پێدەچوو توانای کۆنترۆڵکردنی هەموو

باروودۆخێکی هەبێت، وەڵامی دەدایەوە. هەرکات ئەلهاجی قسەی دەکرد، بەدەست هێمای دەکرد، وەك ئەوەی بیەوێت دەستە درێژەکانی بگەیەنێتە ئەوکەسەی قسەی بۆ دەکات. ئەو و جووما زۆر نزیك بوون. هەمیشە لەتەنیشت یەکەوە دەڕۆیشتن. جووما هەموو کات سەری بۆ قسەکانی ئەو دەلەقاند و پەسەندی دەکردن. جووما بە زۆری بەسەری هێمای دەکرد وەك لە دەستەکانی. لەکاتی قسەکردندا سەری بۆلای ڕاست و چەپ دەجوڵاند و هەردوو دەستی لە پشتییەوە دادەنا وەك پیاوێکی پیر. سەیدو و مۆریبا وەك من بێدەنگ بوون. هەمیشە لەتەنیشت یەکەوە دادەنیشتن، دوور لە گرووپەکە. سەیدوو جوتێك گوێچکەی گەورەی هەبوو، هەرکات قسەمان دەکرد وەك ئاسك گوێی ڕادەدێرا. مۆریبا هەمیشە پێی دەوت ڕەنگە ئەو توانای گوێگرتنی لە ڕادەی ئاسایی زیاتر بێت. هەمیشە لەکاتی ڕۆیشتندا بە توندی هەناسەی دەدا. مۆریبا زیاتر یاریی بەدەستەکانی دەکرد و لە خەتەکانی لەپی دەستی ورد دەبووەوە و بە چرپە لەگەڵ خۆی دەدوا. من بە ئاستەم وشەیەکم دەوت.

ئەلهاجی و کانیێ و مووسام لە خوێندنگە ناسیبوو، بەڵام پێشتر قسەمان نەکردبوو. ئەوکاتەش لەبارەی ڕابردوومان، یان خێزانەکانمان هیچمان نەوت. بەتایبەتی خێزانەکانمان. ئەو قسانەی دەمانکرد تەنها لەبارەی گەشتەکەمانەوە بوو. یان فووتبۆڵ، یان خوێندنگە، پێش ئەوەی دووبارە بێدەنگیی درێژەی هەبێت.

ئەو ئازارەی هەمانبوو لە پێیەکانمان بۆ چوارەم شەو ڕەوییەوە و دەستمان کرد بە پیاسەکردن بەدەوری خانووەکەدا. بەدرێژایی گەشتەکەمان

بۆم دەرکەوت کە خانۆچکەکە نزیکەی میلێـك لـە دێیـە سـەرەکییەکەوە دوورە. شەوانە دووکەڵی چێشتمان دەبینی لە خانووەکانەوە بەرزدەبوونەوە.

بۆ ماوەی هەفتەیەك لەو خانووەماینەوە، پیاوەکە شەو و ڕۆژ خواردن و خواردنەوەی پێمان دەدا. سپیترین ددانی هـەبوو کـە تـا ئێسـتا بینیبێـتم. زۆربەی کات بێ تیشێرت بـوو، بـەیانیان کـە سـەری لێـدەداین لاسـکی گەڵایەکی دەجوو. ڕۆژێـك لـەبارەی ناوییـەوە پرسـیارم لێکـرد، بەنـەرمی پێکەنی وتی: "ئەوە گرنگ نییە، بەم شـێوەیە هـەموومان بـێ مەترسـی دەبین". شەوی دواتر بڕیاری دا بمانبات بۆ قەراغ زەریاکە. بـە دەم پیاسـەوە بە قسەکردنەوە سەرقاڵی کردین. زانیمان ئەو سەر بە خێڵی (شێربرۆ)یـە. کاتێك چیرۆکەکانی ئێمەی بیست کە چۆن لە مـاتروجۆنگ-ەوە هـاتووین، باوەڕی نەکرد ئەو وتی شتی زۆری بیستووە لەبارەی جەنگەوە، بەڵام هەرگیز باوەڕی نەکردووە کە بەو شێوەیە بێت کە خەڵکی باسیان دەکات. ئەو هـەر لە گوندەکە بووە و هەرگیز لەوێ نەچووەتە دەرەوە. بازرگانەکان جلوبەرگ و داودەرمانی خواردەمەنییان دەهێنا و لەبری ماسی و خوێ دەیانگۆڕییـەوە، ئیدی پێویست نەبوو ئەم بچێتە دەرەوەی گوندەکە. پێم وایـە تەمـەنی لـە بیستەکاندا بوو، وتی مانگی داهاتوو زەماوەند دەکات و زۆریش دڵی پێـی خۆشە. پێم وت لەبەرچی خانووچکەکەی لە گوندەکەدا نییە، ئەو وتی ئەو خانۆچکەیە تەنها بۆ وشککردنەوەی ماسییەکان و دانانی کەلوپەلـەکانی بەکاردەبات.

لە قەراغ ئاوەکە دانیشتین، پێی وتین قاچمان بخەینە ناو ئاوە سوێرەکەوە سوودی دەبێت بۆ برینەکانمان، پاشان بە دووری دەگرێت لە هـەوکردن. لـە

تەنیشتمانەوە دانیشت و چاوی تێبڕین. هەرکات سەیری دەکردین زەردەی دەکرد ددانە سپییەکانی لەناو ڕووخسارە ڕەشەکەی دەردەکەوت. هەوای ئەو ناوە لەگەڵ هەوای زەریاکە تێکەڵ دەبوو، مرۆڤی خۆشحاڵ دەکرد.

دەمویست هەر چۆنێك بێت ناوی بزانم، بەڵام زۆرم لەخۆم کرد نەپرسم.

پاشان وتی: "کوڕینە پێویستە هەموو شەوێك بێنە ئێرە و قاچتان بخەنە ناو ئەم ئاوەوە، بەم شێوەیە قاچتان لە ماوەی کەمتر لە هەفتەیەك چاك دەبێتەوە".

پاشان سەیری ئەستێرەکانی کرد کە تاو تاو لەدوای هەورەکانەوە دەردەکەوتن "دەبێت ئێستا بڕۆم بەلای چاککردنەوەی بەلەمەکەمەوە، ڕەنگە باران داباریت، پێویستە بە زووترین کات بچنە ژوورەوە". بەڕاکردن گەڕایەوە ناو گوندەکە.

ئەلهاجی وتی: "خۆزگە دەخوازم ئەو پیاوە بوومایە. زۆر دڵخۆش و ڕازییە لەو ژیانەی تێیدا دەژی!"

کانییێ بە نەرمی وتی: "زۆر پیاوێکی باشە، خۆزگە ناویم دەزانی".

"بەڵێ، بەڵێ..." هەموومان وتمان هەریەکەمان لە خەیاڵی خۆماندا نقووم بووین و کتوپڕ باران لە خەیاڵی کردین.

ئەوکات بە قسەی پیاوەکەمان نەکرد، بەڵام بەپەلە گەڕاینەوە بۆ خانۆچکەکە و لە ژوورەوە بەدەوری ئاگرەکەدا دانیشتین و ماسی وشکراوەمان خوارد.

ماوەی دوو هەفتە لەگەڵ ئەو پیاوە ماینەوە. ڕۆژ بەڕۆژ تەندروستیمان باشتر دەبوو. تا بەیانییەکیان ژنێکی بەتەمەن گەورەتر لە پیاوەکە هاتە

ژوورەوە، خەبەری کردینەوە و داوای لێکردین بە زووترین کات ناوچەکە جێبهێڵین. پێی وتین کە ئەو دایکی پیاوەکەیە و گوایە چەند کەسێك لە گوندەکە لەبارەی ئێمەوە دەزانن و ناویان بیستووین و بەرێگەوەن تا دەستگیرمان بکەن. بە شێوازی ئاخاوتنیدا بۆم دەرکەوت لەمێژەوە ئێمە دەناسێت و لەبارەی ئێمەوە بیستوویەتی. کەمێك ئاوی پاك و خواردەمەنی وەك ماسی بۆ هێنابووین تا لەگەڵ خۆمان بیبەین بۆ گەشتەکە. کات نەبوو سوپاسی خۆی و کوڕەکەی بکەین بۆ چاودێرییەکەی، بەڵام بە دەنگیدا دیار بوو دەیزانی لە ناخەوە سوپاسگوزارین. ئارامی و سەلامەتی ئێمەی لە هەموو شت بەلاوە گرنگتر بوو.

"کوڕەکانم دەبێت خێرا بکەن ئێستا، دۆعاتان بۆ دەکەم..."

بە دەنگێکی لەرزۆك لە غەم دەموچاوی خۆی سڕی و چووە دەرەوە و گەڕایەوە بۆ گوندەکە.

ئەوەندە خێرا نەبووین تا لەدەستیان ڕابکەین. دوانزە پیاو بەدوای هەر حەوتمانەوە ڕایانکرد. دایانداین بە زەوییدا و دەستیان بەستینەوە.

هەر کە زانیم ناتوانم چیتر ڕابکەم، خۆم بە دەستەوە دا، دەستەکانم درێژ کرد تا بیبەستنەوە. دوای ئەوەی پیاوەکە دەستەکانمی بەستەوە، بۆ چەند چرکەیەك چاومان کەوتە سەر یەك، چاوم زەقکردەوە و دەمویست بە پیاوەکە بڵێم کە من تەنها تەمەنم دوانزە ساڵە، بەڵام لە چاوانی ئەودا ئەوەم خوێندەوە کە بەلای ئەوەوە، سەلامەتی من گرنگی نییە و ئەوەی بەلایەوە گرنگ بێت خۆی و دێیەکەیەتی.

بردیانینەوە بۆ ناو گوندەکە و لەسەر لەکە لەبەردەم سەرۆکەکەیان دایاننیشانین. لەمەوپێش ئەم ئەزموونەم هەبوو. بیرم دەکردەوە داخوا بۆ هاوڕێکانم شتێکی نوێیە؟

هەموویان هەنسکیان دەدا و دەیانویست نەگرین. تا دەهات شپرزەتر دەبووم. جاری پێشوو لای سەرۆکەکەی تر کەسێك هەبوو کە بەشداری فێستیڤاڵەکەمانی کردبوو لە (ماتروجۆنگ) و ژیانی ڕزگار کردین، بەڵام ئەمجارە زۆر لە (ماتروجۆنگ)ەوە دووربووین. ڕێگایەکی دووورودرێژ بڕابوو.

زۆربەی پیاوەکان تیشێرتیان لەبەردا نەبوو، بەڵام سەرۆکەکەیان بە ڕێکوپێکی خۆی پۆشتە کردبوو. جلی ناوخۆیی لۆکەی لەبەرکردبوو کە ئێخەکەی بە ئەتەمینی زەرد و قاوەیی زیگزاکی نەخش کرابوو. نەعلە چەرمە قاوەییەکانی نوێ دیاربوون، گۆچانێکی بەدەستەوە بوو کە سەری باڵندە و بەلەم، سەری شێر و چەند ئاژەڵێکی دی پێوەبوو.

بۆ ماوەیەك لێمان وردبووەوە، چاوی کەوتە سەر من و نیوە زەردەیەکم بۆکرد، گوێزی کۆلا* ی دەجوو، تفێکی کردەوە و هەڵیدایە سەر زەوی، پاشان بەردەوام بوو. لەبری دەستی بە گۆچانەکەی هێمای کرد و وتی: "ئێوە، ئەی منداڵان ئێستا بوونەتە شەیتانێکی بچووك، بەڵام دڵنیابن گوندێکی هەڵەتان هەڵبژاردووە...".

---

* گوێزی کۆلا: جۆرێکە لە بەرهەمی درەختی کۆلا، لە دارستانە بارانارییەکانی وڵاتانی ئەفریقا دەڕوێت، ئەم جۆرە ڕووەکە مادەی کافینی تێدایە و بۆ خواردنەوە و هەندێك جار بۆ داودەرمان بەکاردەبرێت.

"جلەکانیان داکەنن، ئەمە کۆتایی ڕێگەیە بۆ ئێوەی شـەیتان. ئێـوەی درۆزن شایەنی مانەوە نین".

ئەلهاجی بە دوودڵییەوە ویسـتی قسـە بکـات، بـەڵام سـەرۆکەکە بـە گۆچـانەکەی کێشـای بـە جێـی دانیشـتنەکەی و بـەدەنگی بـەرز وتـی: "نامەوێت تەنها وشەیەك لە شەیتان ببیستم".

پیاوەکە لەگـەڵ دایکـی لـە قەرەباڵغییەکـەدا وەسـتابوون. هـەرکات سەرۆکەکە بە شەیتان بانگی دەکردین، یان هـاواری دەکـرد بەسـەرماندا، ئەو دەستی توند دەگووشی. هەر جلەکانم لەبەر داکەندرا، شریتی ڕاپـەکان کەوتنە سەر زەوی.

پیاوەکە هەڵیگرتەوە و دایە دەست سەرۆکەکەی. سەرۆك بـە وردی لـە قەپاغی شریتەکان ورد بووەوە، بە وردی سەیری ڕووخساری توندوتیژی سێ گۆرانیبێژەکـەی دەکـرد کـە لەسـەر تاشـەبەردێکی شـکاو وەسـتابوون و ستوونێکی کارەبا لە پشـتیانەوە بـوو. سـەرۆك فـەرمانی کـرد شـریتەکە تاقیبکرێتەوە. یەکێك لە پیاوەکان بە سەرۆکەکەی وت تەنها ڕێگا کە ئەم جۆرە کاسێتە بیانییانە دەست بکەوێت، یان بە فڕاندن و دزییە، یان ڕەنگە سەربازی بەکرێگیراو بن. سەرۆکەکە یەکەم وتەی پیاوەکەی پەسەند کـرد و دووەمیانی وەك وتەیەکی بێنەقلانە لێکدایەوە.

"ئەم کوڕانە سەرباز نین، سەیریان کە!" خۆشحاڵ بووم ئـەم جـارە بـە کوڕ ناوی بردین لەبری "شەیتان"، بەڵام بە بێ جلوبەرگ لەسـەر ئـەو لـە هەستم بە بێئارامییـەکی زۆر دەکـرد. ئـەزموونێکی نـاخۆش بـوو، هـەر

بیرکردنەوە لەوەی چیم لێ بەسەردێت دوای چەند خولەکێکی تر، زیاتر ئۆقرەی لێدەبڕیم. لە ناخەوە شەڕم لەگەڵ خۆم دەکرد تا ڕووخسارم پێچەوانەی هەستەکانم دەربکەوێت.

هەرکات چاوەڕێی فەرمانی سەرۆك بووم کە ژیان، یان مردنمان بۆ دیاری بکات، ئازار ڕووخساری ڕادەتەکاندم. شریتەکە تاقیکرایەوە، گۆرانییەکی ڕاپ دەستی پێکرد. هەموو بە وردی گوێیان گرتبوو، برۆیان بەرزکردبووەوە و سەریان بە جۆرێ هێنابووە نزیکەوە، تا بزانن ئەمە چ جۆرە گۆرانییەکە. سەرۆك لەناکاو گۆرانییەکەی وەستاند، هەندێك لە خەڵکەکە سەریان لە خانۆچکە بە قوڕ دروستکراوەکە هێنابووە دەرەوە، هەندێکیان لەسەر زەوییەکە لەسەر ڕایەخەکانیان دانیشتبوون. پیاوەکان خواری پانتۆڵە تافتەکانیان هەڵکردبوو، ژنەکان سەرپۆشەکانیان ڕێك دەخستەوە و منداڵانیش چاویان لەسەرمان لا نەدەبرد، دەستیان لە گیرفانیاندابوو، یان لوتە چڵماوییەکەیان پێ دەسڕی.

سەرۆك فەرمانی کرد "هەڵیسێنن و بیهێنە نزیکەوە".

چوومە نزیکەوە و لێی پرسیم، ئەم شریتەم لە کوێ دەست کەوتووە، بە چ مەبەستێك گوێی لێ دەگرم. بۆم ڕوونکردنەوە کە ئەو جۆرە گۆرانییە (ڕاپ)ی پێدەوترێت، من و براکەم و هاوڕێکانمان- ئەم کوڕانە تا کە ئێستا لەگەڵمن. پێکەوە مەشقمان لەسەری دەکردن بۆ ڤێستیڤاڵی نیشاندانی بەهرەکان. بە ڕووخساریدا دەرکەوت کە سەرسام بووە، زیاتر هێمن بووەوە و بە پیاوەکانی وت ئازادم بکەن و پانتۆڵەکەم بدەنەوە.

"ئێستا دەبێت پیشانم بدەیت تۆ و براکەت و هاورێکانت چۆن مەشقتان دەکرد".

شریتەکەم دووبارە کردەوە، خۆشم دەمم دەجولاند و بە پێی پەتی لە لەکەدا دەستم بە سەما کرد. ئەو کات وردە وردە وشەکانم دەهاتەوە یاد. بەوردی گوێم لە مۆسیقاکە دەگرت، بە هێواشی بازم هەڵدەدا و قۆڵەکانم و قاچەکانم دەجولاند، هەرگیز ئەمەم نەکردبوو، ئەوکاتانەی گوێم لەو گۆرانییە دەگرت، وشەکانم لە دڵی خۆمدا دەوتەوە و هەستم بە ئاوازەکەی دەکرد، بەڵام ئەمجارە بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن هەڵم دەدەنە ناو زەریاکەوە و چەند قورسە مردن لەبیر بکەم. چرچییەکانی ناوچەوانی سەرۆکەکە بەرەو نەمان چوون، هێشتا زەردە نەیگرتبوو، بەڵام هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی وەك ئەوەی بزانێت کە من تەنها منداڵێکم. لە کۆتایی گۆرانییەکەدا دەستی بە ڕیشیدا هێنا و پێی وتم، کە سەرسام بووە بە سەماکەم و ئەم جۆرە گۆرانییەی بەلاوە سەرنجڕاکێشە. داوای کرد شریتێکی تر تاقی بکرێتەوە، گۆرانییەکی "ئێلّ. ئێلّ. کوولّ جەی بوو، پێویستم بە خۆشەویستییە"، لەبەرخۆمەوە گۆرانییەکەم وتەوە:

**هەندێك جار بەتەنها لە ژوورەکەی خۆمدا چاو دەبڕمە دیوارەکە...**

**لە هزریشمدا هەست بە ویژدانم دەکەم کە بانگم دەکات...**

سەرۆکەکە سەری بەملاولادا دەجولاند وەك ئەوەی هەوڵ بدات لە وشەکان بگات. سەیری ڕووخساریم دەکرد تا بزانم بەرەو خراپتر ناڕوات، بەڵام ڕووخساری سەرسام دەینواند. فەرمانی کرد هەموو هاورێکانم ئازاد بکرێن و جلەکانمان بدەنەوە، پاشان بۆ هەموانی ڕوونکردەوە کە هەڵە

تێگەیشتنێك ڕوویداوە، ئێمە تەنها منداڵین و بەدوای ئارامیدا دەگەڕێین. پاشان ویستی بزانێت کە لە خانۆچکەکە بە تەنها بووین، یان خاوەنەکەی لەگەڵمان بووە، من پێم وت کە بەتەنها بووین و هیچ کەسێك لەگەڵمان نەبووە. پێی وتین کە ئازادمان دەکات، بەڵام پێویستە بە زووترین کات ناوچەکە جێبهێڵین. شریتەکانی دامەوە، بەڕێکەوتین. لەسەر ڕێگاکە سەیری جێی بەستنەوەکانمان دەکرد لەسەر قۆڵەکانمان و پێدەکەنین تا خۆمان لە گریان بەدوور بگرین.

## ٥٥

یەکێك لـەو شـتانەی لەگەشـتەکەمدا تـا ئەوکاتـەش بـێ چارەسـەر مابووەوە، بریتی بوو لەوەی کەس نەیدەزانی کەی و لە کـوێ کۆتـایی ئـەم جەنگەیە. ئەم پرسیارە لە ڕووی دەروونی و جەستەیی، تەنانـەت هەسـت و سۆزیشەوە کاری تێکردبووم. نەمدەزانی چی لە ژیانم دەکەم، هەستم دەکرد هەمیشـە سـەرلەنوێ دەسـت پـێ دەکەمـەوە، تـا نیـوە دەبـڕم و دووبـارە دەگەڕێمـەوە سـەرەتا. هەمیشـە لـە جوولـەدا بـووم، لـە جێگەیـەك بـۆ جێکەیەکی تر. هەرکات بەرێگاوە بووینایە، بڕێ جار لە دواوە ڕێم دەکرد و بیم لە هەموو ئەمانە دەکردەوە. تەنها ئامانجی من لە ژیان بریتی بوو لـە مانەوە بە زیندوویی. ئەوەی دڵی خۆش دەکردین، ئەوەبوو، جار بـەجار لـە گوندەکان ئاوی پاك و خواردەمـەنییان دەدایـنێ، بـەڵام دەمزانـی هـەموو ئەمانە دڵخۆشی کاتین و ناتوانم بـۆ هـەتا هـەتایی دڵخـۆش بم. هەسـتی دڵتەنگیم بۆ خۆم هەڵبژاردبوو وەك لەوەی بە شپرزەیی بـەدەوری کۆمـەڵێ هەستا بخولێمەوە. هەمیشـە پێشـبینی خـراپترینم دەکـرد، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا ئومێدم هـەبوو تـا لـە گەشـتەکەم بـەردەوام بم. ئـەو شـەوانەی نەمدەتوانی بخەوم، چاوم دەبڕییە تاریکایی شەو تـا چـاوم پێـی ڕادەهـات، پاشان دەکەوتمە خەیاڵی خێزانەکەم، داخوا زیندوو بن...؟

شەوێکیان لە دەرەوەی گوندەکە دانیشتبووم. بیرم دەکردەوە چەندم ڕێگا بڕیوە، ئەی دەبێت چی لــە داهــاتوودا بێتــە ڕێــم. ســەیری ئاســمــانم کــرد و پەڵەهەورە ئەستوورەکانم بەدی کرد کە لــە هــەوڵی ئــەوەدا بــوون مــانگ داپۆشن، مانگیش جاریەجار خۆی قووتار دەکرد و بە درێژایی شەو تیشکی پەخش دەکرد. بیرم کردەوە گەشــتەکەی منــیش وەك گەشــتەکەی مانگــە، هەرچەندە پەڵەهەوری ئەستوورتر بەرەو ڕووم دەهــاتن، تــا ڕۆحــم ناشــرین بکەن. ئەو ئێوارەیەم بەبیرهاتەوە، کاتێك لەدەست هێرشێکی تــری تــەور و ڕمی گوندنیشەکان ڕامانکردبوو. جووما و مۆریبا و مووسا لــە داڵانەکــە خەوتبوون. من و ئەلهاجی و کانێی سەیدوو بەخەبــەربووین و گوێمــان بــۆ شــەو ڕادێرابــوو. هەناســە تونــدەکانی ســەیدوو کــەمێك بێدەنگییەکــەی لەبیربردبووینەوە. چەند کاژێرێك تێپەڕی، سەیدوو بە دەنگێکــی گــڕی وەك ئەوەی یەکێك لەناو ئەودا لەبری خۆی بدوێت وتی: "دەبێت چەند جاری تر لەدەست مردن ڕابکەین تا جێیەکی ئارام و بێمەترسی دەدۆزینەوە؟"

بۆ چەند دەقەیەك چاوەڕێ بوو، بەڵام کەسمان وەڵامان نەدایــەوە. پاشــان بەردەوام بوو "هەرکات خەڵکی بــەنیازی کوشــتنمان بــەرەوڕوومان دێــن، چاوەکانم دادەخەم و چاوەڕوانی مردنم، هەرچەندە زیندووم، بــەڵام هــەرکات مردن قبوڵ دەکەم، هەســت دەکــەم بەشــێك لــە مــن دەمرێــت. هــەر زوو بەتەواوەتی لەناودەچم و ئەوەی دەمێنێتەوە لاشەیەکی بەتاڵە، زۆر هێمنتر و لەسەرخۆتر لە کەسایەتی خۆم لەگەڵتاندا ڕێ دەکات".

فووی بەناو دەستەکانی کرد تــا گــەرمیان بکاتــەوە، پاشــان ڕاکشــا و هەناسە توندەکانی زیادی کرد، ئەوکات زانیم خەوی لێکەوتووە. وردە وردە

ئەلهاجی و کانێیش خەویان لێکەوت. لەسەر کورسییەکی بێ پشتی تەختە دانیشتم و پاڵم دایەوە بە دیوارەکەوە و بیرم لە وتەکانی سەیدوو دەکردەوە. ناوچەوانم گەرم داهات و فرمێسك لە چاوەکانم هەڵقولا. نەمدەویست باوەڕ بەوە بکەم کە منیش بەهێمنی لەسەر ڕێگای گەڕان بەدوای ئارامییدا، لەناودەچم. ئەو شەوە بەخەبەر بووم تا یەکەم زرنگی بەیان بایەکی هێواشی لەگەڵ خۆی هێنا و هانیدام بۆ خەوتن و ڕزگاری کردم لە بیرکردنەوە پەنگخواردووەکانم.

هەرچەندە گەشتەکەمان سەخت بوو، بەڵام جاربەجار شتێکی ئاسایی هەبوو دڵخۆشمان بکات گەر بۆ چرکەیەکیش بێت. بەیانییەك گەیشتینە دێیەك، کە پیاوەکان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ڕاو، ئێمەیان بانگهێشت کرد تا لەگەڵیان بڕۆین. ڕاو کۆتایی هات، یەکێك لە پیاوەکان هاواری کرد و پەنجەی بۆمان ڕاکێشا "ئەمشەو ئاهەنگ دەگێڕین، ئەم غەریبانەش دەتوانن بەشداربن". پاشان پیاوەکانی تر دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان و بە گۆرانیوتنەوە گەڕاینەوە بۆ ناو دێیەکە و تۆڕ و ئاژەڵەکانیان بەسەرشانەوە بوو کە زۆربەیان ئاسکی کێویی و ژیشك بوون.

هەر گەیشتینە گوندەکە، ژنان و منداڵان بە چەپڵە بەخێرهاتنیان کردینەوە. دوا نیوەڕۆ بوو ئاسمان شین بوو، ڕەشەباش ئەوەندەی نەمابوو لەجێی خۆمان هەڵمانگرێت. بەشێك لە گۆشتەکە بەخشرایەوە و ئەوی تری درا بە ژنەکان تا لێبنرێت و ئامادە بکرێت بۆ جەژنەکە. پیاوەکان گەڕانەوە بۆ سەر کێڵگەکانیان و ئێمەش ناومان دەبرد بۆ ژنەکان و یارمەتیمان دەدان.

بەناو دێیەکە پیاسەم دەکرد، لە یەکێك لە داڵانەکان جۆلانەیەکم بینی، لەسەری ڕاکشام و بەهێواشی خۆم ڕاژەند تا بیرەوەرییەکانیشم بهێنمە جووڵە. ئەوکات بیری جۆلانەکەی ناو کێڵگەکەی دایەگەورەم کەوتەوە، هەمیشە لەسەری دەخەوتم و کاتێك چاوەکانم دەکردەوە دایەگەورە بەسەر سەرمەوە چاوی تێبڕیبووم و یاریی بە قژم دەکرد، ختووکەی دەدام و پاشان خەیارێکی دەدا پێم. بەبیرم هاتەوە چۆن من و جوونیەر شەڕمان بوو لەسەر جۆلانەکە، هەرکات ئەو براوەبوایە، فێڵی خۆمم هەبوو، دەچووم تاڵی جۆلانەکەم شل دەکردەوە بۆ ئەوەی لەسەری بکەوێتە خوارەوە. ئەویش وازی دەهێنا و بەناو کێڵگەکەدا دەگەڕا تا خۆی بە شتێکی ترەوە مژۆڵ بکات.

دایەگەورە بە فێڵەکانمی دەزانی و گاڵتەی پێدەکردم و ناوی نابووم کارسیلۆی، واتە جاڵجاڵۆکە. لە چیرۆکەکانی مێندی، جاڵجاڵۆکە بە جۆرێك باس دەکرێت کە دەیەوێت بە فێڵەکانی ئەوانی تر هەڵخەڵەتێنێت، تا ئەوەی خۆی دەیەوێت بەدەستی بێنێت، بەڵام لە کۆتاییدا فێڵەکانی بە پێچەوانەی ویستی خۆی دەردەچن. لەم بیرکردنەوانەدا قوڵ ببوومەوە تا ئەو کاتەی زرم بە زەویدا کەوتم. تەمەڵی هەموو لەشمی تەنیبووەوە نەمدەویست هەستمە سەر پێ. بۆماوەیەك دانیشتم و بیرم لە جوونیەر و دایك و باوك و نەنکم دەکردەوە، خۆزگەم دەخواستم لەگەڵیان بوومایە. دەستم خستە ژێر سەرم و ڕاکشام و بەردەوام بووم. ڕووخساری خێزانەکەمم لەبیر کردبوو تا بیانهێنمەوە یادی خۆم، پێویست بوو چەند بیرەوەرییەکی تاڵ بهێنمەوە یاد. دەستە ساردوسڕ و چرچەکانی نەنکم، باوەشە توندەکانی

دایکم وەك ئەوەی بیەوێت لە دڕندەیەك بمپارێزێت، پێکەنینەکانی بارکم کاتێ یاریی فوتبۆڵمان دەکرد، یان بە تەشتێك ئاوی ساردەوە دوام دەکەوت تا خۆم بشۆم. براکەم کە لە خوێندنگە دەگەڕایەوە دەستی دەکردە ملم، یان جاربەجار ئانیشکێکی لێدەدام تا قسەیەك نەکەم کە لێی پەژیوان دەبمەوە. ئەوەندەم خەفەت خوارد، هەستم کرد ئێسقانەکانی لەشم ئازاریان دێت. چوومە لای ڕووبارەکەوە و خۆم تێ فڕێدا و لەبنی ڕووبارەکە دانیشتم، بەڵام بیرکردنەوەکانم هێشتا بەدوامەوە بوون. دەمەوئێوارە پاش ئەوەی هەموو گەڕانەوە ناو گوندەکە، خواردن ئامادەکرابوو، قاپێك بەسەر حەوت کەسدا دابەشکرا، پاش نانخواردن، لەژێر تریفەی مانگ دەستیان کرد بە تەپڵ لێدان و سەما و چەپڵە، پاش وتنی چەند گۆرانییەك، یەکێك لە پیاوەکان بە دەنگێکی گاڵتەئامێزەوە هاواری کرد "نازانم کەی، بەڵام دەبێت ئەم غەریبانە چیرۆکی خۆیانمان بۆ بگێڕنەوە تا بزانین خەڵکی کوێن". پاشان بە دەست هێمای کرد تا تەپڵ لێدەرەکان بەردەوام بن. بە درێژایی جەژنەکە، بیری یەکێك لە ئاهەنگەکانی خۆمان کردەوە، کۆتایی هەموو ساڵێك ژنەکان کۆدەبوونەوە و ئەو کێشانەی لەو ساڵەدا ڕوویان دابوو، دەیانکردە گۆرانی و ئاهەنگیان پێدەگێڕا. داخوا بتوانن کێشەکانی ئەمساڵی جەنگیش بکەنە گۆرانی؟

پاشان بیرم کردەوە لەوەی بۆ ئەم دێنشینانە ئەوەندە باشن لەگەڵمان. بەهەرحاڵ زۆرم لەخۆم کرد چێژ لە ئاهەنگەکە وەربگرم لەبری بیرکردنەوە. ئاهەنگ ئەو شەوە تەواو نەدەبوو. ئێمەش پێویست بوو بۆ بەیانی زوو بەڕێ بکەوین. هێشتا زۆربەی خەڵکەکە لە شیرین خەودا بوون کە ئێمە بەڕێ

کەوتین. کەمێك گۆشتی برژاو و گالۆنێ ئاومان پێچایەوە و بەناو پیرەکاندا ڕۆیشتین کە لە دالآنەکانیان دانیشتبوون و چاوەڕێی تیشکی خۆر بوون تا خۆیان گەرم بکەنەوە، هەر ئێمەیان بینی دەستیان ڕاوەشاند "بەهیوای ئەوەی ڕۆحی باوباپیرانمان ئاگایان لێتان بێت".

بۆ دوایەمین جار ئاوڕێکم لە دێیەکە دایەوە. هێشتا ئەو ڕۆژە لەدایك نەببوو. کەڵەشێرەکان بە دەنگیان سیرسرکەکانیان ڕاونا کە بەتەما نەبوون کۆتایی بە شەو بێنن. تیشکی خۆر بەرە بەرە بەدیار دەکەوت و سێبەری خۆی لە دالآنەکان و خانۆچکەکانەوە دروستکردبوو. دەنگی دەهۆڵیش هێشتا لە مێشکمدا دەزرنگایەوە، بەڵام هێشتا دڵخۆش نەبووم. کاتێك ڕووم لە گوندەکە وەرگێڕا مووسا و ئەوان ئەو سەمایەیان دەکرد کە دوێنێ شەو بینیبوویان.

پاشان ڕوویان تێکردم "پیشانمان بدە چی فێربوویت". دەستیان کرد بە خولانەوە و چەپڵە لێیان بەدەورمدا. ڕەتم نەکردەوە بەپێی ڕیتمی ئەو دەنگانەی دەریان دەکرد، سەمام دەکرد و ئەوانیش هاتنە ڕیزەوە و هەموو دەستمان خستە سەرشانی یەکتر و بەرەوپێشەوە ڕۆیشتین و سەمامان کرد. گۆشتە برژاوەکەم لە جانتایەکدا بەدەستەوە گرتبوو، بەرزم کردەوە بۆ سەرەوە و بەخێرایی ڕامدەوەشاند لەکاتێکدا قاچەکانمان بەملاولادا دەجولآند. ئەو بەیانییەمان بە سەما و گۆرانی بەڕێکرد، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو هەموو وەستاین و بە بیرمان هاتەوە ئەم خۆشییە درێژە ناکێشێت. ڕۆژێکی دووروودرێژمان لەبەردەمدا بوو، بۆیە بەهێواشی هەنگاومان دەنا، ئێوارە هەموو ئەو ئاوەی پێمان بوو، خواردمانەوە.

شەو داهات، گەیشتینە دێیەکی نامۆ، ڕاستییەکەی دڵنیا نەبووم کە دێ بێت. خانوویەکی گەورە لە دووری کەمتر لە کیلۆمەترێك موبەقێکی لێبوو، کە چەند قۆرییەکی ژەنگاوی تێدا فڕێدرابوو، لەگەڵ خەزێنەیەکی بچووك. ئەو خانووە بەتەنها لە چۆڵەوانییەکدا بوو. ئەلهاجی بە پێکەنینەوە وتی: "ئەمە ئاسانترین دێیە بۆ یاخیبووەکان تا داگیری بکەن".

بەو ناوچەیەدا گەڕاین تا بزانین کەسێکی لێیە؟ دیاربوو لەو جێیە ڕۆنی دارخورما بەرهەمهێنراوە، پاشماوەی تۆوی ناوکی خورما لە هەمولایەك بڵاوببووەوە. لای ڕووبارەکەوە بەلەمێك بەجێهێڵرابوو کە قەوزەی لوولپێچی لەسەری گەشەی کردبوو. پشتی خانووەکەمان وەك جێی خەوتن دەستنیشان کرد. لەبەردەم داڵانەکە لەسەر کۆتەرەدارێك دانیشتین و مووساش دەستی کرد بە گێڕانەوە، چیرۆکی جاڵجاڵۆکەی بڕا، ئەوەندەمان بیستبوو ئەو چیرۆکە، هەموو بە یەك جار داوامانکرد نەیگێڕێتەوە، بەڵام ئەو بەردەوام بوو "چیرۆکەکانی جاڵجاڵۆکەی بڕا هەمیشە باشن، گرنگ نییە چەند جارتان بیستووە". پاشان وتی: "دایکم پێی دەوتم هەرکاتێك چیرۆك گێڕدرایەوە، شایەنی ئەوەیە گوێی لێبگیرێت، جا تکایە گوێ بگرن، بە کورتی دەیبڕێنمەوە".

قوڕگی پاککردەوە و دەستی پێکرد "جاڵجاڵۆکەی بڕا لە دێیەك دەژیا کە بەدەوریدا چەند دێیەکی تر هەبوون، هەموو ساڵێك لە کۆتایی وەرزی دوورینەوە خەڵکەکە ئاهەنگیان دەگێڕا و خواردن و خواردنەوەیان

دەبەخشییە خەڵكی. خەڵك ئەوەندەی دەخوارد ڕووخساری خۆیان لەسەر گەدەی یەكتر دەبینی".

هەموومان وتمان: "چی...؟؟؟" سەرمان سووڕما لەو چیرۆكەی مووسا خۆی بۆی زیادكردبوو. هەستایە سەرپێ و وتی: "من چیرۆك دەگێڕمەوە، جا گرنگ نییە چۆن دەیگێڕمەوە، چاوەڕێ بن تا تەواو دەبم پاشان ئێوەش بۆی زیاد بكەن". دانیشت و بەردەوام بوو، هەریەك لە دێیەكان بە خواردنێك بەناوبانگ بوون، دێیەكەی جاڵجاڵۆكەی بڕا بە خواردنی شلەی بامێ و ماسی بەناوبانگ بوون مممم... مممم... دێیەكی تر گەڵای كاساڤایان دەهێنا و پەتاتە و گۆشتیان تێدەكرد. هەردێیەك بە خۆفشانەوە باسی لە تاموچێژی خواردنەكانی خۆیان دەكرد، كە چەند بەلەزەت ئامادە دەكرێت بۆ جەژنەكە. هەر دێیەكیش بانگهێشتی دراوسێكانی دەكرد تا بەشدار بن، بەڵام جاڵجاڵۆكەی بڕا دەیوسیت لە هەموو خوانەكان بەشدار بێت، بۆیە چەند مانگێك پێش جەژنەكە، لە دەوروبەری گوندەكە چەند تەنافێكی كۆكردەوە و هەموویانی پێكەوە بەست و ئامادەی دەكرد، لەكاتێكدا خەڵك دار و برنجیان ئامادە دەكرد و دەیانبردەوە بۆ لایەكی گوندەكە تا ژنەكان لە تۆز و گەڵاكان پاكی بكەنەوە و پاشان بیخەنە ناو دەستكەوانەكانەوە. جاڵجاڵۆكەی بڕاش درێژی پەتەكەی دەپێوا لە داڵانەكەی خۆیەوە و كاتێك پیاوەكان دەچوون بۆ ڕاو، ئەم بە دزییەوە پەتەكەی لە خانووەكەی خۆیەوە دەبرد بۆ هەموو دێیەكانی دەوروبەر و سەری پەتەكەی دەدا بە هەریەك لە چێشتلێنەرەكان تا بە درەختێكی نزیك لایەكی گوندەكە بیبەستنەوە و بە هەموویانی وت: "ڕۆژی جەژن دوای

ئەوەی خواردنەکە ئامادە بوو، بەخەڵکەکە بڵـێن ئـەم پەتـە ڕابکشـێن".
جاڵجاڵۆکەی برا کە بە لـووت قسـەی دەکـرد، ئـەم وتەیـەی بـە هـەموو چێشتلێنەرەکان دەوت و پاشان پەتەکەی لە ناوقەدی خۆیەوە بەسـت و تـا ڕۆژی جەژن هیچی نەخوارد. ڕۆژی جـەژن هـات و جاڵجاڵۆکـەش لەبرسـا هەموو گیانی دەلەرزی و دەمی ئاوی کردبوو، بۆنی گۆشتی برژاو و ماسی وشککراو و شلە و گۆشت لە چێشتخانەکاندا دەهات بە لوتیدا، بـەڵام بـۆ نەگبەتی ئەو، هەموو دێیەکان لەیەك کاتدا دەستیان کـرد بـە خـواردن و ئـەوکات هـەر چێشـت لێنـەرێك فـەرمانی کـرد پەتەکـە ڕاکێشـرێت، جاڵجاڵۆکەش بە هەموو لایەك ڕادەکێشرا، دەسـتی کـرد بـە هـاوارکردن، بەڵام لەبەر گـۆرانی و دەهـۆڵ کـەس گـوێی لـێ نـەبوو. منـداڵان بـەرەو ڕووبارەکە ڕایانـدەکرد و قـەپاڵیان لـە گۆشـتی بـرژاو و ماسـی دەگـرت. خەڵکی هەریەك لە جێی خۆیەوە قاپی پڕ خواردەمەنییان لەبەردەمدا بوو، پەنجەکانیان دەلێسایەوە. هەر کات جاڵجاڵۆکە پەتەکـەی شـل دەکـردەوە، چێشـتلێنەرەکان پەتەکـەیان تونـد ڕادەکێشـایەوە وەك هێمایـەك تـا بانگهێشتی بکەن. دواجار کوڕێکی بچـووك گـوێی لـە دەنگـی دەبێـت و گەورەکان ئاگادار دەکاتەوە و ڕزگاری دەبێت، بە دەنگێکی نووساوەوە داوای خواردن دەکات، بەڵام بەشـی ئـەم نـەمابوو، خەڵکەکـەش کۆتاییـان بـە ئاهەنگێڕان هێنابوو. باوباپیران دەڵێن لەبەرئەوەی زۆر بەتوندی پەتەکەیان ڕاکێشابوو، بەهۆی ئەوەوە جاڵجاڵۆکەکان ناوقەد باریکن".

ئەلهاجی خۆی کێشایەوە و وتی: "هەموو ئەو خواردنانەی باست کردن، برسیترم دەکەن. چیرۆکێکی خۆش بوو، تا ئێستا کەسم نەبینیوە بەو شێوەیە

بیگێڕنەوە"، هەمور دەستمان کرد بە پێکەنین، دەمانزانی ئەلهاجی دەیەوێت گاڵتە بە مووسا بکات بۆ ئەو زیادانەی بە چیرۆکەکەیەوەی نابوو.

هەر مووسا کۆتایی بە چیرۆکەکە هێنا، شەو داهات ڕووناکی بۆ تاریکی گۆڕی و خەوی بۆ هاوڕێکانم هێنا، گالۆنە ئاوەکە و گۆشتە برژاوەکەمان لەبەردەرگای ئەو ژوورە دانا کە بۆ خەوتن دەستنیشانمان کردبوو، ئەو شەوە تا دوا کاژێرەکانی شەو خەو نەچووە چاوەکانم، هەر لە بیری نەنکمدا بووم، شەوانە بە دیار ئاگرەوە دادەنیشتین و پێی دەوتم: "لەبەرچاوم زۆر زوو گەورە بوویت، تا ئێستاش وا دەزانم دوێنێیە کە بەشداربووم لە ئاهەنگی ناولێنانەکەت". بە ڕووەگەشەکەیەوە سەیری دەکردم و بزەیەکی دەکرد.

لەماوەی ژیانمدا بۆ زۆر لەو مەراسیمانە براوم، بەڵام نەنکم باسی ئەوەی خۆمی بۆ دەکردم.

"هەمور خەڵك ئامادەی ئاهەنگەکە بوو، خواردن بە هاوکاری هەمووان ئامادە دەکرا، بەیانی زوو پیاوەکان مەڕیان سەردەبڕی و گۆشتەکەیان دەدا بەو ژنانەی ناوبانگیان هەبوو لە دەستڕەنگینی و خواردن دروستکردندا، تا هەریەکەیان بەتامترین خواردن پێشکەش بکەن. پیاوەکان لەبەر دەرگایماڵەکە دەوەستان و بەخێرهاتنی میوانەکانیان دەکرد و دەستی یەکیان دەگوشی. هەریەکێکیش لە پیاوەکان بیێ ئەوەی قسەبکات، قوڕگی پاك دەکردەوە و کۆخەیەکی بە دەنگی بەرز دەکرد. کوڕە گەنجەکانیش کە بە دزییەوە گوێیان بۆ گوتەی پیاوەکان ڕاگرتبوو، بانگ دەکران و هەریەکەیان کارێکیان پێدەسپێردرا لەپشتی موبەقەکەوە

گۆشتی مریشکیان چاك دەکرد، یان داریـان دەبڕییـەوە دەیانهێنایـەوە بـۆ ژنـەکان. لـە خانۆچـکە بـە قـامیش دروسـتکراوەکانیش، ژنـان بـەدەم گۆرانیوتنەوە برنجەکانیان ڕۆدەکردە ناو دەسـتکەوانەکانەوە و دەسـکەکەیان هەڵدەدا و چەندین جار چەپڵەیان لێدەدا و پاشـان دەیانگرتـەوە. ئـەو ژنـە پیرانەی بە ئەزموونتر بوون لەم کارەدا لەگەڵ ئەو گۆرانییانـەی دەیـانوت، پێش ئەوەی دەسکەکە بگرنەوە هێمای سوپاسگوزاریشیان بە دەسـتەکانیان دەکرد. کیژۆڵەکانیش لە کووخەکان دادەنیشتن و بە باوەشێنێکی لە حەسیر دروستکراو یان قـاپێکی کـۆن، خـەڵوزە سـوورەکانیان دەگەشـانەوە، یـان فوویان لێدەکرد تا ئاگر بۆ ژێـر قۆرییـە گـەورەکان بکەنـەوە. کـاژێر ٩ی بەیانی خواردن ئامادە دەبوو، هەموو بە جوانترین شـێوە خۆیـان دەگـۆڕی، بەتایبەتی ژنەکان، تەنوورە و عەزی و لاپێی* ئاوریشمیان لەبـەر دەکـرد، سەرپۆشی گرانبەهایان دەدا بەسەریاندا. هەریەکە لە ئەوپـەڕی خۆشـییدا بوو، ئاهەنگ بەردەوام بوو تا نیوەڕۆ، پاشان ئیمام دەهات و خـواردنی بـۆ دەبرا و دوای نانخواردن لە ناوەڕاستی حەوشەکە دادەنیشـت، قـۆڵی کراسـە سپییەکەی هەڵدەکرد و چەند سورەتێکی قورئانی دەخوێند، پاشـان ئـاوی دەرشت تا ڕۆحی پێشینان بانگ بکات. پاشان ئیشارەتی بۆ دایکت دەکـرد تا تۆ بەرێت. ئەوە یەکەمین جارت بوو بهێنرێیتـە دەرەوە، دایکـت لەسـەر ئەژنۆ دانیشت و تۆی دا بەو. ئیمامیش ئاوی بە ئاوچەوانتدا دەکرد و چەند دۆعایەکی خوێند کە لە کۆتاییدا ناوی تۆی دەهێنا.

---

* لاپێی: قوماشێکی گەورەی لە لۆکە دروستکراوە، ژنان لە ئاوقەدییانەوە دەیبەستن.

پاش تەواوبوون، ژنان دەستیان دەکرد بە سەما و گۆرانیوتن، دایکیشت تۆی دا بە باوکت و ئەویش بەرزی دەکردیتەوە و تۆی بەناو هەموو میوانەکاندا دەگێڕا، تا لەباوەشت بگرن. ئیتر لەو کاتەوە بوویت بە ئەندامێکی کۆمەڵگەکە و کەسێك بوویت هەموو ئاگایان لێت بوو و بایەخیان پێ دەدایت.

پاشان خواردن هێنرایەوە دەرەوە لەسەر سینییەکی گەورە دادەنرا. کوڕەکان لەپێش کچان و ژنەکان بەشی خۆیان تێدەکرد. لەکاتێکدا ئاهەنگ بەردەوام بوو، تۆیان دەدایە دەست ژنێکی پیر کە توانای سەماکردنی نەبوو، ئەویش سەیری دەکردیت، هەرکات پێبکەنیتایە دەیوت: "دیارە زۆر حەزت لە چیرۆکە، لە کاتێکی گوونجاودا هاتوویت"، پاشان دەستی دەکرد بە گێڕانەوەی چیرۆك.

لەکاتێکدا ئەنکم ئەم چیرۆکەی بۆ دەگێڕامەوە، سەیرم کرد و بە گەرمی بزەیەکم بە ڕوویدا. ئەویش سەیری کردم دەستی کرد بە پێکەنین.

***

لەم بیرکردنەوەیەدا بووم، کوڕەکان دەستیان کردبوو بە پرخەپرخکردن. منیش تا دەهات چاوەکانم قورستر دەبوون.

بەیانی کە هەستاین، بینیمان گۆشتەکە هیچی نەماوە. پاشان بوو بە شەڕ لەناو یەکتردا، کانیێ لە لێوەکانی مووسا وردبووەوە و ئەویش پاڵێکی پێوەنا و شتیان لە یەك دەگرت، هەوڵم دا لەیەکیان بکەمەوە. سەیدوو ئیشارەتێکی کرد و وتی: "ئەمەیە جانتاکە؟ سەیرکەن هێشتا گرێدراوە،

هیچ کەس لە ئێمە نەیخواردووە. دڵنیام ئەوەی بردوویەتی هێشتا لەم دەوروبەرەیە" لقە دارێکی گرت بەدەستییەوە و چووە دەرەوە دەستی کرد بە گەڕان. مووسا بە تورەییەوە بە کانێیی وت: "پێم وتی من نەبووم!"

مۆریبا لە جێ پێکانی سەر زەوییەکە وردبووەوە و وتی: "ڕەنگە ئاژەڵێك بووبێت"، هەندێکمان دوای جێ پێیەکە کەوتین تا ڕووبارەکە و هەندێکمان بە دەوری گوندەکە دەگەڕاین. لەناکاو سەیدوو هاواری کرد "دزەکەم دۆزییەوە، زۆریش تورەیە!" کاتێ سەیرمان کرد، سەگێك بوو دوایەمین قەپاڵی لە گۆشتە برژاوەکە دەگرت. هەر ئێمەی بینی دەستی بە وەڕین کرد و لەژێر قاچەکانیدا شاردییەوە. ئەلهاجی دارەکەی لە سەیدوو وەرگرت و دوای کەوت. سەگەکەش گۆشتەکەی بە دەمییەوە گرت و بەرەو دەوەنەکان ون بوو. پاشان هەموو کەوتینە گەڕان بەدوای خواردندا، کەس قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد. دەمەو ئێوارە کەمێك وچانمان دا.

ئەلهاجی وتی: "دەبووایە ئەو سەگەم بکوشتایە". پاشان لەسەر پشت ڕاکشا.

وتم: "لەبەر چی؟"

مۆریبا بە توورەییەوە وتی: "بەڵێ، لەبەر چی؟ چیت دەست دەکەوت گەر بتکوشتایە؟"

ئەلهاجی بە توورەییەوە وتی: "لەبەر ئەوەی تەنها شت کە هەمان بوو، ئەو گۆشتە بوو".

مووسا وتی: "بمانکوشتایە گۆشتی چاکی دەبوو".

ڕووم کردە مووسا و وتم: "باوەڕ ناکەم، پاشان گەر واش بووایە، زۆر قورس دەبوو گۆشتەکەی لێبنێین".

جووما تفی کردەوە و وتی: "ئێوە خەریکە وام لێدەکەن بڕشێمەوە، باسی چی دەکەن؟!"

مووسا هەستایە سەرپێ "باش...".

ئەلهاجی بە نائومێدییەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا "چییە؟ دەتەوێت چیرۆکێکی ترمان بۆ بگێڕیتەوە؟"

"نا ئەمجارە چیرۆك نییە. باوکم لای چەند کەسێکی مالیزی کاری دەکرد. جارێکیان پێی وتم ئەوان سەگ دەخۆن. ئەگەر ئەلهاجی ئەو سەگەی بکوشتایە، حەزم دەکرد تاقیم بکردایەتەوە بۆ ئەوەی گەر باوکم بینینەوە پێی بڵێم، ئەو کاتیش لێم توڕە نابێت، چونکە بیانوویەکی باشم هەیە".

هەموومان بێدەنگ بووین، مووسا مێشکمانی پڕ شتگەلێك کرد کە هەرگیز بیرمان لێی نەکردبووەوە.

مووسا ئەوکات لەگەڵ باوکی لە ماتروجۆنگ بوو، کاتێك هێرش کرایە سەر ناوچەکە. دایکی چووبوو بۆ بازاڕ تا ماسی بکڕێت و بۆ نانی ئێوارە ئامادەی بکات. مووسا و باوکی چوون بە شوێن دایکیدا، بەڵام کاتی هێرشەکە ئەو دیارنەما. باوکی دەستی بە گریان کرد و چوو بە شوێن ژنەکەیدا بگەڕێت، بە مووسای وت لە جێی خۆی نەجوڵێت، هەرچەندە ئەم سوور بوو لەگەڵیدا بڕوات، بەڵام ئەو ڕێگەی نەدا "لێرە چاوەڕێ بە کوڕم، هەرزوو من و دایکیش دەگەڕێینەوە". دوای ئەوەی باوکی

ڕۆیشت، ئەو ناوچـەیە بەتـەواوی بۆمبـاران کـرا و مووسـاش لەوکاتـەوە ڕایکردووە.

ئەلهاجی لە ڕووبارەکە ئاوی دەهێنـا، کـاتی هێرشـەکە ڕای کـردەوە و لەبەردەم خانووە چۆلکراوەکەیان هاواری دایك و باوك و خوشـك و براکـانی بوو.

کانییَ لەگەڵ دایك و باوکیـدا بـوو، بـەڵام دوو خوشـك و سـێ بـرای لەکاتی شەڕ و پشێوییەکەدا لەدەست دابوو، خۆی و دایك و باوکی چـوونە لای ڕووبارەکەوە تا بە ڕووبـاری جـۆنگ بپەڕنـەوە. لـە نیـوەی پەڕینـەوە، یاخیبووەکان هێرشیان کردنە سـەر و تەقـەیان لێکـردن و بەلەمەکـەیان نووقم بوو، کانێی بە مەلە پەڕییەوە ئەوبەر ڕووبارەکە و لەسەر قەراغەکـە چاوی لە خەڵکەکە بوو کە نقووم دەبوون. هەرچـەندە خـەڵك پێـی وتبـوو دایك و باوکی مردوون، بـەڵام ئـەو بـەهیوای ئـەوەی زینـدوو بـن، چـەند مانگێك لە گەڕان بەردەوام بوو.

مۆریبا و جووما ماڵیـان بەتەنیشـت یەکـەوە بـوو، کـاتی هێرشـەکە ڕایانکرد بۆ بەندەرەکە تا دایك و باوکیان ببینن، بەڵام ئەوان لەوێ نەبوون، پاشـان ڕایـانکرد بـۆ دارسـتانەکە ئـەو جێیـەی پێشـتر خۆیانیـان تیـا حەشاردابوو، لەوێش کەسیان نەبینی.

باوکی سەیدوو بڕیاری دابوو ئەو ناوچەیە جێ نەهێڵێت، خـۆی و سـێ خووشکەکەی کـە ١٩، ١٧، ١٥ سـاڵان بـوون لـەژێر جێخەوەکـە خۆیـان حەشاردابوو. ئەو ئێوارەیە سەیدوو چووبووە قاتی سەرەوەی خانووەکەیان تـا برنج بێنێت، پێش ئەوەی بێتە خوارەوە، گوێی لە دەنگی یاخیبووەکان بـووە

که هاتوونەتە ماڵەکەی و گوێی لە قیژەی خوشکەکانی بووە کـە لەلایـەن یاخیبووەکانـەوە پـەلاماردراون، بـاوکی تـوڕە بـووە و هـەوڵی داوە ڕێـیـان لێبگرێت، بەڵام یەکێکیان بە تفەنگەکەی کەوتووەتە لێدانی و دەمکـوتی کردووە و دایکیشی بە گریانەوە داوای لێبووردنی لە کچـەکانی کـردووە و گلەیی لە خـۆی کـردووە، کـە ئـەم کچـانەی هێناوەتـە ئـەم دنیایـەوە و خستوونیەتییە بەردەستی ئـەم دڕندانـە. پـاش ئـەوەی لـە پـەلاماردانیان بوونەتەوە، کەلوپەلی ماڵەکەیان بە دایك و بـاوکی هـەڵگرتوون و پـێش خۆیانیان خستوون و ڕۆیشتوون. "تا ئەمڕۆش ئازاری خووشکەکانم و دایـك و باوکم هەڵگرتووە، ئەوکاتەی هاتمە خوارەوە، هەموو شتێك چۆڵ کرابوو، هەموو لەشم سڕ ببوو فرمێسك لە چاوانما قەتیس ما، وام هەسـت دەکـرد دەمارەکانی لەشم دەردەهێنن، تا ئـەمڕۆش هـەمان هەسـتم هەیـە. ئـاخر خوورشکەکانی من هەڵەیان چی بوو؟ چ تاوانێکیان هـەبوو؟"ئەمـە وتـەی سەیدوو بوو، پاش ئەو شـەوەی ڕامـانکردبوو، چـیرۆکی هـەڵهاتنی خـۆی گێڕایەوە، کاتیّ ئەم چیرۆکەم بیست هەموو گیانم تێك شکا.

کانێی بە دەنگێکی نووساو و بێتاقەتەوە وتی: "وابزانم پێویستە دەست بە ڕۆیشتن بکەینەوە". بڕیارمان دابوو بە شـەویش بـەڕێگاوە بـین. بـەڕۆژ بەدوای خواردندا دەگەڕاین و کەمێکیش دەخـەوتین. بـە شـەویش تریفـەی مانگ چاودێرمان بوو تا بەرەبەیان، هەمان ڕۆژ دەستی پێدەکردەوە و پێش ئەوەی خۆزگە و هیواکانمان بە ئەستێرەکان بسپێرین، خۆر دای دەپۆشین.

لـەژێر ئـەم ئاسمانـە فێرکرابـووم چـیرۆك بگێڕمـەوە، بـەڵام ئێسـتا لەوەدەچێت ئاسمان چیرۆك بۆ من بگێڕێتەوە. زۆر بە دڕندەیی ئەسـتێرەکانی

تێك دەشكاند و مانگیش لەپشت هەورەكانەوە خۆی دەشاردەوە تا ئەو دیمەنە نەبینێت.

ڕۆژێك لە دێیەكی چۆڵكراو بەدوای خواردنەوە بووین. لەناكاو قەلەڕەشێك لە ئاسمانەوە كەوتەخوارەوە، نەمردبوو، بەڵام نەیدەتوانی بفڕێت. دەمزانی شتێكی ئاسایی نییە، بەڵام ناچار بووین، خۆمان بەدوای خواردندا دەگەڕاین پەڕەكانیمان لێكردەوە، مۆریبا پرسی "ئەمڕۆ چ ڕۆژێكە؟" هەموو بیرمان كردەوە و كەس قسەی نەكرد، كانێی وتی: "ئەمڕۆ ڕۆژی پشووە". پاشان دەستی كرد بە پێكەنین "دەیكەیت بە هەر ڕۆژێك بیكە!"

مووسا وتی: "ئاخر وا نییە، ئەمە ڕۆژێكی ئاسایی نییە. هەستێكی خراپم هەیە، پێم باشە نەیخۆین".

كانێی لەژێر لێوەوە وتی: "كەوتنەخوارەوەی ئەم باڵندەیە نیشانەی بەدبەختییە، یان نەفرەتە، ئێمە خۆمان لە هەردوو دۆخەكەداین، من دەیخۆم تۆش بە كەیفی خۆت چی دەكەی بیكە". ئەو شوێنە هەمووی بێدەنگ بوو، هەورەكان لە جوڵە وەستان و درەختەكانیش بەهەمان شێوە، وەك ئەوەی ئەوانیش بزانن شتێك ڕوودەدات.

هەندێك جار شەو ئامرازێكی قەسەكەر بوو، بەڵام ئێمە گوێمان بۆ نەدەگرت. ئەو شەوەی باڵندەكەمان خوارد زۆر تاریكتر بوو. ئەستێرە بە ئاسمانەوە نەبوو. بەڕێگەوە دەڕۆیشتین و هەستمان دەكرد تا دەهات تاریكتر دەبوو، تەنها بە دەنگ یەكترمان دەناسییەوە، بۆیە دەستی یەكمان گرت تا ون نەبین. دەترساین لە ناوەڕاستی ئەو جێیە بوەستین.

بەردەوام بووین تا گەیشتینە پردێکی لە تەختە دروستکراو بەژێریدا ڕووبارێك هەبوو، هیچ دەنگی نەدەهات، پێدەچوو خەوی لێکەوتبێت. لە نیوەی پردەکە گوێمان لە دەنگی کەسێك بوو کە لەوسەرەوە دەپەڕییەوە. دەستبەجێ دەستمان بەردا و لای چەند درەختێکەوە خۆمان شاردەوە، من لە تەنیشت ئەلهاجی و سەیدوو، جوومساوە بووم. سێ کەس بوون کە تیشێرتی سپییان لەبەردا بوو، پێدەچوو چەند تۆپەڵە جلێکیان لەبن دەستدا بێت، ئەوانیش دەستی یەکیان گرتبوو. دووانیان بالآیان وەك یەك بوو، ئەوی تریان بالآی کەمێك کورتتر بوو، لە ناوەڕاستی پردەکە وەستان وەك ئەوەی هەستیان بە بوونی کەسێك کردبێت. چەند شتێکیان وت، بەڵام دڵنیا نەبووم چی بوو. دەنگیان لە گیزەی هەنگ دەچوو وەك ئەوەی شتێك لوتیانی گرتبێت. پاشان ئەو دووانەی بالآیان وەك یەك بوو ئەوی تریان ڕاکێشا وەك ئەوەی ڕێی لێبگرن بگەڕێتەوە، شەڕ و ئاژاوەیان بوو منیش دڵم تا دەهات خێراتر لێی دەدا. زۆر هەوڵم دا ڕووخساریان بناسمەوە، بەڵام زۆر تاریك بوو، پاش دەمەبۆڵێ و ئاژاوەیان بڕیاریان دا بەو ڕێگەیەدا بڕۆن کە ئێمەی لێهاتبووین.

دوای ماوەیەك هەستاینەوە سەرپێ و هەموو بە خێرایی هەناسەبڕکێمان بوو. کانێی بۆ دڵنیایی بە چرپە هەموومانی بانگ کرد. کاتێك هاتە سەرەی سەیدوو، هیچ وەڵامێك نەبوو. هەموو دەستمان کرد بە گەڕان، پاش ماوەیەك لەپشت درەختێك دۆزیمانەوە، بە توندی ڕامانوەشاند و بانگمانکرد، هیچ وەڵامی نەبوو. ئەلهاجی و جووما دایانە پڕمەی گریان. من و کانێی ڕامانکێشایە دەرەوەی درەختەکان و بەلایەوە دانیشتین.

دەستەکانم لە ئەندازە بەدەر دەلەرزین. ئەو شەوە هەموو بەدیارییەوە دانیشتین، هەستم دەکرد سەرم تا دەهات قورستر دەبوو. یەکێك لە ئێمە بە چرپە وتی: "ڕەنگە بەدبەختی ئەو قەلەڕەشە بێت کە خواردمان". هەموویان دەستیان کرد بە گریان، بەڵام من تاسابووم سەیری ئاسمانم دەکرد وەك ئەوەی بەدوای شتێکدا بگەڕێم. جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان شەو و ڕۆژدا نەمابوو. شەو ئاسایی خۆی لوول دەکرد بە لایەکدا و ڕۆژی دەهێنا و ئاسمانی بەسەرماندا ڕۆشن دەکردەوە. هێشتا بەدیار سەیدووەوە بووین. ناوچەوانی ئاسەواری ئارەقی پێوە بوو، دەمی کردبووەوە. دەستم خستە بەر لووتی تا بزانم هەناسە دەدات، کوڕەکانی تر هەستان وەك ئەوەی چاوەڕێی شتێکم لێ بکەن. وتم: "نازانم". هەموو دەستیان خستە سەر سەریان وەك ئەوەی شتێك ڕوویدابێت کە ئاستەم بێت قبووڵ بکرێت، بەڵام تازە ڕوویدابێت.

مۆریبا وتی: "ئێستا ئێمە چی بکەین؟"

مووسا وتی: "خۆ نابێت هەر لێرە بوەستین".

کانێی وتی: "دەبێت هەرچۆنێك بێت بیبەینە دێیەکەی تر، گرنگ نییە چەند دوورە. یارمەتیم بدەن تا هەڵیگرین".

سەیدوومان هەڵگرت و کانێی خستییە سەر پشتی. بە پردەکەدا پەڕینەوە، ڕووبارەکە دەستی بە هاژەهاژ کردبوو بە دڵڕەقی خۆی لە تاشەبەردەکان دەدا. هەر لە پردەکە پەڕینەوە سەیدوو دەستی کرد بە کۆخین. کانێی بەپەلە داینا و هەموو دەورمان لێدا. ماوەیەك ڕشایەوە و دەمی سڕی و وتی: "ئەوانەی دوێنێ شەو خێو بوون، دەزانم...".

هەموو تاسابووین وتمان: "ڕاستە!!"

پاشان وتی: "هەر ئەوان دەستیان بە قسە کرد، من بورامەوە وابزانم".

هەمووومان یارمەتیمان دا، بەڵام ئەو پاڵێکی پێوە ناین و وتی: "باشم، با بڕۆین".

مووسا بە پێکەنینیەوە وتی: "چییە، لە مردن هەستاویتەتەوە و لەخۆت بایی بوویت".

هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین. دووبارە دەستەکانم کەوتنە لەرزین. ئەمجارە بۆ، نازانم. لە ڕێگادا بەردەوام پرسیارم لە تەندروستی سەیدوو دەکرد.

پاش نیوەڕۆ، گەیشتینە دێیەك زۆر قەرەباڵغ بوو. سەرمان سوڕمابوو لەم هەموو خەڵکە. چۆن بەم کاتی جەنگە لە دەرەوەن، گۆرانییان دەوت و سەمایان دەکرد. منداڵان لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر ڕایان دەکرد. بۆنی خواردنی گەڵای کاساڤا دەهات.

بەناو دێیەکە ڕۆیشتین و هەوڵمان دا جێیەك بدۆزینەوە و لەو قەرەباڵغییە دووركەوینەوە. دواجار چووینە ژێر درەختێك، ژنێکی لێبوو ڕووخساری لەوە نەدەچوو بیناسین. بەرامبەرمان دانیشت.

"تۆ..." ئاماژەی بۆ من کرد "من تۆ دەناسم".

من نەمدەناسی، بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی من و خێزانەکەم دەناسێت. پێی وتم جوونیەر هەفتەی پێشوو هاتووەتە ئەو دێیە و هەواڵی منی پرسیوە. دایك و باوك و برا بچووکەکەشم لەو دێیەی ترن. پاشان ڕێگاکەی پیشاندااین. "لەو دێیە خەڵکێکی زۆری سیرا ڕووتیل و

ماتروجۆنگی لێیە، لەوێ دەتوانن خێزانەکانتان بدۆزنـەوە، یـان هـەواڵیان بپرسن".

پاشـان هەسـتایە سـەرپێ و ئێمـەی جێهێشـت و دەسـتی کـرد بـە سەماکردن لەسەر گۆرانی سۆوکس. پاش ئـەوەی جێـی هێشـتین، هـەموو دەستمان کرد بە پێکەنین. دەمویسـت هـەر ئـەو کاتـە بەڕێکـەوم، بـەڵام بڕیارمان دابوو ئەو شەوە لەوێ بەسەربەرین تا سەیدووش کـەمێك پشـوو بدات، هەرچەندە دەیوت تەندروستی باشە. زۆر دڵخۆش بووم کـە دایـك و باوك و براکانم یەکتریان دۆزیوەتەوە و پێکەوەن، ڕەنگـە دایکـم و باوکیشـم گەڕابێتنەوە لای یەکتر.

بەرەو ڕووبارەکە ڕۆیشتین و یاریی چاوشارکێ و یارییە ئاوییەکانمان کرد و هاوارمان دەکرد "کۆکوو..." تا یارییەکە دەست پـێ بکـات. هـەموان سەیریان دەکردین و زەردەیان دەکرد.

ئەو شەوە کەمێك کاساڤا و برنجمان دزی و لەژێر درەختێکدا لە قـەراغ گوندەکە خواردمان. جێگەیەك نەبوو لێی بخەوین، بۆیـە بـە دزییـەوە لـە بالکۆنی ماڵێك خەوتین، کاتێك چووبوونە ژوورەوە.

ئەو شەوە دەستەکانم دەلەرزین و دڵم باشی نـەدەگوت، خـەو نەدەچـووە چاوم، ئەوانیش پرخەپرخیان بوو.

سـەگەکانیش دەسـتیان بـە وەڕیـن کردبـوو، لەمسـەری گوندەکـە ڕایاندەکردە ئەوسەری. ئـەلهاجی هەسـتا و هاتـە لامـەوە "ئـەو سـەگانە خەبەریان کردمەوە".

"من هەر لە سەرەتاوە نەمتوانی بخەوم".

بە هێواشی پێکەنی "ڕەنگە زۆر دوودڵ بیت کە خێزانەکەت دەبینیت، منیش هەروام".

هەستایە سەرپێ و وتی: "هەست ناکەی ئەم سەگانە بە شێوەیەکی سەیر هاوار دەکەن؟"

"وەك مرۆڤ دەگرین و دەپاڕێنەوە".

لەوکاتەدا سەگێك لەبەر بالکۆنەکەدا دەوەڕی چەند سەگێکی تریش بەدوایدا هاتن. ئەلهاجی بە باوێشکدانەوە وتی: "وابزانم سەگەکان شتێك دەبینن کە ئێمە نایانبینین، هەست دەکەم شتێك لەئارادایە".

دانیشت و هەردووکمان چاومان بڕییە ئاسمان، سەگەکانیش هەر بەردەوام بوون. یەکێکیان تا سەحەر دەوەڕی. خەڵك بەخەبەر هاتن و منداڵان دەستیان دەکرد بە گریان. دەبوایە پێش ئەوەی خاوەن ماڵەکە خەبەری بێتەوە، ماڵەکە چۆڵ بکەین. ئەلهاجی هەموویانی خەبەر کردەوە، کاتێ هاتە سەرەی سەیدوو ئەو لە جێی خۆی ڕەق ببوو. "هەستە... دەبێ بڕۆین". بە توندی ڕایوەشاند. کانێی وتی: "ڕەنگە دووبارە بورابێتەوە".

لەوکاتەدا خاوەن ماڵەکە بە دۆلکەیەك ئاوەوە هاتە دەرەوە، پێی وتین کە ئەو لەمێژە دەزانێت ئێمە لەوێداین.

پاشان دۆلکە ئاوە ساردەکەی بەسەر سەیدوودا ڕژاند، وتی: "ئەمە کاری خۆی دەکات"، بەڵام ئەو نەجوڵا. لەسەر سك ڕاکشابوو قۆڵەکانی پێچەوانە کردبووەوە و دەموچاوی لە خۆڵدا گەوزابوو. ناوچەوانی چرچ و دەمی کردبووەوە. ئاسەواری فرمێسك بە سووچی چەوەکانییەوە دیاربوو. پیاوەکە دەستبەجێ خستییە سەر پشت و وتی: "کوڕینە کەس لەم گوندە

دەناسن؟" هەموو سەرمان ڕاوەشاند. دۆلکەکەی دانا و دەستی خستە سەر سەری خۆی و وتی: "کێ لە هەمووتان گەورەترە؟" و سەیری ئەلهاجی کرد، کانێی دەستی بەرزکردەوە. پاشان پیاوەکە بردییە لاوە و بە چرپە چەند شتێکی پێ وت. ئیتر کانێی لەسەر شانی پیاوەکە دەستی کرد بە گریان و هاوارکردن. ئەوکات تێگەیشتین سەیدوو هەموومانی جێهێشتووە. هەموو دایانە پرمەی گریان. چاوەکانم پڕ بوون لە ئاو، سەرم گێژی دەخوارد نەمدەزانی خەوە، یان ڕاستە. کانێی و پیاوەکانی تر ڕۆیشتن و لەگەڵ دوو پیاوی تردا گەڕانەوە کە دەستەبەرەیەکی تەختەیان پێبوو. سەیدوویان خستە سەری داوایان لێکردین لەگەڵیان بڕۆین. لاشەی سەیدوو شۆردرا و هەر ئەو ڕۆژە کفن کرا و خرایە ناو کۆفنێکی تەختە، کە لە ژووری میوانی ماڵی پیاوەکە دانرابوو. پیاوێکی بالابەرز ڕووی تێکردین "کێ لە ئێوە لە خێزانی ئەم کوڕەیە؟"

هەموو سەرمان ڕاوەشاند، هەستم بە تاوان کرد وەك ئەوەی ئێمە سەیدوو لە برایەتی دەربکەین، هەرچەندە هاوڕێ بوو، بەڵام ئەو وەك خێزانێکی لێهاتبوو، بەڵام پیاوە بالابەرزەکە مەبەستی خێزانی ڕاستەقینە بوو تا سەرپشك بێت لە ناشتنەکە. دووبارە پرسیاری کردەوە "هیچ کەس لە ئێوە خێزانی ئەم کوڕە دەناسێت؟" کانێی دەستی هەڵبڕی و پیاوەکە بانگی کردە لاوە و دەستیان کرد بە قسەکردن. پیاوەکە دەستی چەپی خستبووە سەر شانی کانێی و بەدەستی ڕاستی ئاماژەی بە قسەکانی دەکرد. کانێی دەمی جوڵاند و سەری ڕاوەشاند تا کۆتایی بە قسەکان بێنێت. پاشان گەڕایەوە و لەسەر یەکێك لە کورسییەکان دانیشت کە بۆ

مەراسیمەکە ئامادەکرابوو، تەنها ئێمە و خاوەن ماڵەکە تێیدا ئامادە بوون. گوندنشینەکان لە دالآنی ماڵەکانیان دانیشتبوون، هەر سەیدوومان بەرەو گۆڕستان بەرێ کرد، هەموویان هەستانە سەرپێ.

باوەڕم نەدەکرد هێشتا سەیدوو مردبێت، پێم وابوو وەك جارەی پێشوو بووراوەتەوە و هەر زوو هەڵدەستێتەوە سەر پێ، بەڵام ئەو کاتەی بینیم وا نزم دەکرێتەوە بۆ ناو گۆڕەکەی، ئیتر لەوەدەچوو شەپازڵەم لێبەن.

قەبرهەڵکەنەکان دەموچاوی سەیدوویان بە گڵ داپۆشی و ئەوەی لێی بەجێما، تەنها یادگارییەکان بوو. قوڕگم ئازاری دەدام و نەمدەتوانی هەناسە بدەم، دەمم کردەوە و هەناسەم هەڵمژی. ئەو پیاوەی پێشتر پرسی کاممان خێزانی سەیدوو دەناسین، چەند سورەتێکی قورئانی خوێند. ڕێگەم بە فرمێسکەکانم دابکەونە سەرزەوی و دەستبەجێ تۆزی ئەو هاوینە هەموویانی داپۆشی. پیاوەکان بەردی گەورەیان بەدەوری گۆڕەکە دانا تا لە کۆتاییدا تەپۆلکەیەکیان بەسەر گۆڕەکەوە دروستکرد. پاش مەراسیمەکە بە تەنها بەجێماین. چەندین تەپۆلکەی گۆڕی، خەڵکانی تر لەو دەورروبەرە بوون، زۆربەیان پارچە تەختەیەکیان بەسەرەوە جێگیرکردبوو و شتیان لێ نووسرابوو، ئەوەی سەیدووش چووە ڕیزەوە. چەند کاژێرێك لەوێ دانیشتین وەك ئەوەی چاوەڕوانی شتێك بکەین ڕووبدات. هەموومان ١٣ ساڵان بووین، جگە لە کانێی کە سێ ساڵ لە ئێمە گەورەتر بوو. سەرم لێشێوابوو نەمدەزانی چی بکەم، سکیشم بە توندی ئازاری دەدام. شەو داهات، گەڕاینەوە ژێر هەمان درەخت کە یەکەمین جار لێی دانیشتین. بڕیار نەبوو ئەو شەوە بگەڕێینەوە دالآنی خانووەکە. کانێی باسی ئەوەی بۆ دەکردین کە

سەیدوو پێویست بوو بنێژرایەوە، چونکە نابێت مـردوو شـەوێك دابنرێـت. کەس گوێی بۆ نەدەگرت و کەسیش نەیدەویست بخەوێت.

کانێی بێدەنگ بوو، هەموو گوێمان بۆ سەگەکان گرت و بە دیـیەکـەدا پیاسەمان کرد، خەڵکەکە هەندێکیان بەخەبەر بوون، گوێمان لە چرپەیان بوو. پاشان بیری هەفتەیەك لەمەوپێشم کەوتەوە کە سەیدوو پێی وتین ئەو هەموو رۆژێك بەشێك لەلاشەی دەمرێت، ڕەنگە دوێنێ شەو هەموو لاشەی بەیەك جار مردبێت و کۆتایی پـێ هاتبێـت. دەسـت و قاچـەکانم کەوتنـە لەرزین زوو زوو ناوی هەموویانم دەهێنا، نەوەك خەویان لێکەوتبێت. خەمم بوو گەر یەکێکیان بخەوێت ڕەنگە ئیتر جێمان بهێڵێت. بەیانی پـێش خـۆر هەڵهاتن کانێی وتی: "ناتوانم شەوێکی تر لێرەبەسـەر بـەرم، ئەوسـەگانە دەمتۆقێنن". پاشان سوپاسی ئەو پیاوەمان کرد کـە یارمـەتی دایـن لـە ناشـتنی سـەیدوو. پاشـان پێـی وتـین: "دەزانـن جێگـەی گۆڕەکـەی لـە کوێدایە". سەرمان لەقاند، بەڵام دەمانزانی چانسی گەڕانەوە بۆ گوندەکـە ئاستەمە، چونکە داهاتوو بەدەست خۆمان نـەبوو. کەوتینـە ڕێ، هـەموو خەڵکەکـە ڕاوەسـتابوون و ماڵئاواییـان لـێ دەکـردین، کـەمێك ترسـم لێنیشت، ئەوکاتەی سـەیدوومان بـرد بـۆ گۆڕسـتان هـەر بـەو شـێوەیە وەستابوون. بەلای گۆڕستانەکە ڕۆیشتین، دەکەوتە کۆتایی گوندەکـە، ئـەو ڕێگەیـەمان گـرت کـە هیـوای بینینـەوەی خێزانـەکانمانی پێدەبەخشـین. تیشکی خۆر بەرە بەرە خۆی کرد بە گۆڕسـتانەکەدا و هەوایـەکی فێنکـی لەگەڵ خۆی هێنا و گـەڵای درەختـەکانی هێنایـە سـەما و ختوکـەی بـە پشتەملمدا هێنا، وەك ئەوەی یەکێك لەدواوە بە هێواشی فوی لـێ بکـات.

هەڵم لە چێشتخانەکان بەرز دەبوونەوە، منیش بەردەوام بووم لە سەیرکردنی دێیەکە تا لەبەرچاو ون بوو. هاوڕێکەمان بەجێهێشت. یان وەك نەنکم دەیوت: "گەشتە کاتییەکەی لەم دنیایە کۆتایی پێهاتووە". لەکاتێکدا بۆ ئێمە درێژەی هەبوو. لە ڕێگا زۆر بە لەسەرخۆیی دەگریاین. باڵندەکانیش جێیان هێشتین و مەودایان داین گوێمان لە بێدەنگی خۆمان بێت. ئەو بێدەنگییەی دەیپرسی: "دوای سەیدوو، کێی تر جێمان دەهێڵێت؟"

کاتێك لە چاوانی یەکترمان دەڕوانی، ئەو پرسیارەمان تێدا دەخوێندەوە. بەخێرایی دەڕۆیشتین تا فریای ڕۆژ بکەوین و شەومان لێبەسەر نەیەت کە ئەویش پەڕەیەکی نادیاری تر لە ژیانمان هەڵدەداتەوە.

# یانزە

شەو لە بێدەنگیدا ڕێمان کرد، تـا بەرەبـەیان وەسـتاین و گوێمـان بـۆ دەنگی چۆلەکەکان ڕاگرت کـە بێدەنگییەکـەیان تێکشـکاند. لەلایـەکی ڕێگاکە لاماندا، وچانمان دا. مۆریبا دوور لە ئێمە دانیشـتبوو، یـاریی بـە لقەدارێك دەکرد و هەنسکی دەدا. ئەو یارییەی هەمیشە لەگـەڵ سـەیدوو پێکـەوە دەیـانکرد. دەیویسـت خـۆی لـە هـەموو ئەوانـەی ڕوویـدابوون، دووربخاتەوە. هەموو هەستان و چوونە لای مۆریبا، کە ئەوکات بە دەنگـی بەرز دەگریا و هاواری دەکرد، هەموو کوڕەکان جگە لە من، دەستیان کـرد بە هەنسکدان. بەتەنها مامەوە و لەپی دەستم خستە سەر چاوەکانم تـا ڕێ لە فرمێسکەکانم بگرم. پاش چەند خولەکێك، هەموو بێدەنگ بـوون، بـێ ئەوەی کەس قسە بکات، کەوتینەوە ڕێ. هـەموو دەمـانزانی دەتـوانین بـۆ ماوەیەکی کەم خەم بخۆین، گەر وانەبێت، گیان بەدەرنابەین.

ئەلهاجی وتی: "ئاهە... دەمێکە چاوەڕێی ئەم گوندەم، کە دایکم بینی بە توندی باوەشی پیا دەکەم". بزەیەك گرتی و بـەردەوام بـوو "هەرچـەندە پێشی ناخۆشە، هەمیشە پێی دەوتم، گەر بەڕاسـتی منـت خـۆش دەوێـت، بەس ئەم ئێسقانە پیرانەم بگوشە، با زیـاتر بـژیم و تەمـەنم درێـژ بێـت". ژنێکی عەنتیکەیە. هەموو قاقامان لێدا.

کانێی خۆی کێشایەوە و قۆڵەکانی بە جـۆرێ بـەرزکردەوە، وەك ئـەوەی بییەوێت دەستی بە خۆر بگات، وتی: "هەستێکی باشم هەیە، هـەمووماان

خێزانەکانمان دەدۆزینەوە، یان هەواڵیان دەزانین". پاشان سەیری ئەلهاجی کرد کە پێدەکەنی و پێی وت: "ها، بیستوومە خوشکێکی جوانت هەیە، خۆ جارێ هاورێی یەکین، وایە؟"

هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین و ئەلهاجیش خۆی هەڵدایە سەر پشتی کانێی و لەناو گیاکەدا دەستیان کرد بە زۆرانبازیی. کە تەواو بوون دوای ئێمە کەوتن و گۆرانی (سی. ئی. رۆجی)یان دەوت: "نە بەم جۆرە سەیرم بکە... نە بەم جۆرە..."، پاشان ئێمەش چووینە ریزەوە و دستمان کرد بە گۆرانیوتن، وەك ئەوەی ژیانێکی زۆر خۆش بگوزەرێنین، بەڵام هەر زوو بێدەنگیی دووبارە بۆ لامان گەڕایەوە.

لایەکی ئاسمان شین و لاکەی تر بە پەڵە هەوری سستی پەنگخواردوو پڕ ببووەوە. بایەك هەڵیکرد و لقە دارێکی دارستانەکەی شکاندەوە، دەنگی ئەو بایە لە گریانی مرۆڤ دەچوو. هەر من بە تەنها هەستم پێ نەکرد، بەڵکو ئەوانیش وەستان و بە وردی گوێیان ڕاگرت، ئەمجارە بایەکە گۆڕا بۆ ڕەشەبایەکی توند. گەڵای درەختەکان خۆیان لەیەکتر دەخشاند و بەرەنگاری ڕەشەباکە دەبوونەوە. تا دەهات شیوەن و ناڵینی لقە درەختە شکاوەکان زیادی دەکرد. درەختەکان وا دەردەکەوتن کە ئازار بچێژن. بە هەموو لایەکدا لنگەفرتێیان بوو و لقەکانیان بەیەکتردا دەکێشا. هەورەکان ئاسمانی شینیان لوول دا، ئەوکات ڕەنگی خۆڵەمێشی ئاسمانی تەنییەوە. باران و هەورەتریشقە دەستی پێکرد و بۆ ماوەی کەمتر لە ١٥ خولەك بەردەوام بوو، تا دووبارە ئاسمان ڕەنگی شینی پۆشی. جلەکانم لە ئاودا خوسابوو، سەرلێشێواو لەژێر تیشکی خۆردا ڕێم دەکرد. شەو داهات و

دووباره باران دەستی پێکردەوە، هەموو تنۆکێکی باران زۆر بێڕەحمانە لێی دەداین. بەو شەوە بەڕێگاوە بووین. دەموچاومان دەسڕی تا بەردەمی خۆمان ببینین. تا دەهات خراپتر دەباری و کەڵکی ڕێکردن نەمابوو، بۆیە لەژێر درەختێکدا دانیشتین و چاوەڕێمان کرد. هەموو کات ڕووناکی هەورە تریشقە هاوڕێکانمی پیشان دەدام، لە کوێن و چۆن دانیشتوون. هەموومان سەرمان خستبووە سەر ئەژنۆکانمان و قۆڵمان چەماندبووەوە.

دوا کاژێرەکانی شەو زۆر درێژ بوون، ئەو دەمەی باران خۆشی کردەوە، یەکەم زرنگی بەیان بوو. هەموو دەلەرزین و سەری پەنجەکانمان ڕەنگ هەڵگەڕاو و چرچ و لۆچ ببوون.

لەژێر درەختەکە هاتینە دەرەوە، مووسا بە پێکەنینەوە وتی: "دەڵێی مریشکین و لە ئاودا نووقم بووین". چووینە جێیەکی کراوە کە خۆر تیشکی خۆی تێ دەهاویشت. جلەکانمان گوشی و بە لقی درەختەکاندا هەڵمانخستن و لەبەر خۆردا دانیشتین، تا خۆمان وشک بکەینەوە، پاشان نزیکەی نیوەی ڕۆژ، جلە شێدارەکانمان لەبەرکردەوە و بەڕێکەوتین.

پاش چەند کاژێرێک لە ڕۆیشتن، لە دوورەوە گوێمان لە دەنگی کەڵەشێر بوو. مووسا لە خۆشیان بازی هەڵدا و هەموومان دەستمان کرد بە پێکەنین. دواجار گەیشتینە دێیەکە و خێزانەکانمان دەبینین. نەمدەتوانی لە بزەکردن بوەستم. کێڵگەی قاوە دەهاتە بەرچاو و گوێمان لە دەنگی برنج بوو کە ڕۆدەکرا و جێ پێی خەڵکیمان بەدی کرد، هەموو ئەمانە خێراتری کردین و دڵنیای کردینەوە کە ژیان هێشتا درێژەی هەیە.

بەرامبەر کێڵگەی قاوە، کێڵگەیەکی بچووکی چاندنی مـۆزی لێبـوو. لەوێ گەیشتین بە پیاوێك کە لەوکاتەدا سەرقاڵی لێکردنەوەی مـۆز بـوو، ڕووخسارمان نەبینی، چونکە پشتی لێمان بوو. کانێی چووە پێشەوە و وتی: "دوانیوەڕۆت باش". پیاوەکە لەپشت گەڵایەکی مـۆزەوە نیگایـەکی کـرد. ئارەقی ناوچەوانی سڕی و خشەخش بەناو چەند گەڵایـەکی وشـکەوەبووی مۆزدا بەرەولامان هات. هەر نزیکبووەوە، بیرەوەرییەکانم بەخەبەرهاتنـەوە... ڕووخساری چرچییەکی زۆری تێکەوتبوو و لاوازتر دەینواند لەوکاتـەی کـە من بینیبووم. ناوی نگۆر* گاسیم بوو. یەکێك بوو لـە پیـاوە ناسـراوەکانی شارۆچکەکەم. خەڵکی بەردەوام سەریان دەکردە سەری تا زەماوەنـد بکـات. خەڵکـە بەتەمەنـەکان هەمیشـە دەیـانوت: "ئێسـتا گەورەیـە و توانـای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی هەیـە، پێویسـتە ژنێکـی بـاش بۆخـۆی پەیـدا بکات، بەڵام ئەمە هەر حەز بە تەنهایی دەکات!" هەمیشە خۆی خواردنی بـۆ خـۆی ئامـادە دەکـرد، هەرچـەندە هـیلاك بـوو بەدەسـت خـواردن دروستکردنەوە، هەمیشە هەنگوین و گاری** دەخـوارد، جـار هـەبووە بـە هەفتە هەمان شتی خواردووە.

بۆیە دایکم بڕیاری دابوو هەموو ئێوارەیەك خواردنی بۆ ئامادە بکات و پێی دەوت: "ئەم جۆرە خواردنانە بۆ تەندروستیت باش نین". ئەویش بـزەی دەکرد و سەری دەخوراند.

---

* زارەوەیەکە بۆ نیشاندانی ڕێز، پێش ناوهێنانی گەورەکان بەکاردەهێنرێت.

** خواردنێکە لە کاساڤا دروست دەکرێت، پاش ئەوەی دەجنرێت و وشك دەکرێت.

هەر گاسیمو نزیکتربووەوە، بە وردی لە ڕووخساری هەموومان وردبووەوە و پاشان بزەیەکی کرد، ئەو کات زیاتر دڵنیابووم ئەوە گاسیموە، چونکە دانێکی پێشەوەی نەبوو.

"کوڕینە دەتانەوێت یارمەتیم بدەن برێ لەم مۆزە بەرینەوە ناو گوندەکە؟" بە جۆرێکی وەها وتی کە (نەخێر) قبوڵ ناکات، هەروەك چۆن گەورە داوا لە منداڵ دەکات.

"دەی کوڕینە"، داوای لێکردین دوای کەوین بۆ ناو کێڵگەکە و دەستی بەجۆرێك ڕاوەشاند وەك ئەوەی بە پەتێك ئێمەی بەستبێتەوە و بیەوێت بەلای خۆیدا ڕامانکێشێت.

ئەوکاتەی لێی نزیکبومەوە، دەستی خستە سەرشانم و دەستی بەسەرمدا هێنا.

لوتمی ڕاکێشا و وتی: "تا ئەمڕۆش هەروا هاروهاجیت؟"

-"لەم ڕۆژەدا کات نەماوە بۆ هاروهاجی".

"دەبینم زۆر غەمباریت. کە منداڵ بوویت، هەمیشە لەگەڵ دایکت باسی ناوچەوانی تۆمان دەکرد. کاتێك پێدەکەنیت ناوچەوانت دەدرەوشایەوە. لەگەڵ دایکت دەمانگوت ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە هەمیشە دڵت خۆشە، دایکت دەیوت لەکاتی خەوتنیش هەر پێدەکەنیت. تەنانەت ئەوکاتانەی توڕە دەبوویت و خەریکی کەتن نانەوە بوویت، ناوچەوانت زیاتر دەدرەوشایەوە. سەیر بوو هیچ ڕوونکردنەوەیەك نەبوو کە پەیوەندی بە کەسایەتیتەوە دەربخات، بەڵام ئێستا شەوق لە ناوچەوانت نابینم".

سەیری کردم و بێدەنگ بوو.

پاشان دوورکەوتەوە و هاوڕێکانمی فێر دەکرد چۆنە مۆزەکە لەسەر شانیان هەلگرن لەبری سەریان. "بەم شێوەیە لە ناوەڕاستدا کەرت نابێت".

مۆزەکانم کۆکردەوە و چاوەڕێی گاسیمو بووم تا دۆلکە ئاوەکە و شقارتە و کەلوپەلەکانی کۆبکاتەوە. "تۆ چۆن گەیشتیتە..."، قسەکەی پێ بڕیم و وتی: "دایکت و باوکت زۆر دڵخۆش دەبن بە بینینت. ماوەیەکی زۆرە بە دواتدا دەگەڕێن. دایکت هەموو ڕۆژێك دەگری و دەپاڕێتەوە لە خوا و ڕۆحی پێشینان تا تۆ بگەڕێننەوە بۆ لای. براکەت چووە دەرەوەی گوندەکە و هەفتەی پێشوو بە دڵتەنگییەوە گەڕایەوە و گلەیی لە خۆی دەکرد کە بەهۆی ئەوەوە تۆیان لەدەست داوە".

کاتێك ئەو قسانەم بیست هەموو ئەوانەی بەدەستمەوە بوون کەوتنە خوارەوە و بە خێرایی کۆمکردنەوە و دوای کەوتمەوە، ئەویش بە هێواشی لە پێشمەوە دەڕۆیشت و بەردەوام بوو "بەڕاستی سەریان دەسووڕمێ گەر بتبینن".

هەناسەم سوار بوو، نەمدەتوانی تەنها وشەیەك بڵێم، ئەویش هێواش هێواش لە پێشمەوە ڕێی دەکرد. دەمویست هەموو ئەوانەی بەدەستمەوەیە فڕێدەمە سەر زەوییەکە و ڕابکەم، بەڵام نەمدەزانی چۆن لەو ڕێگا تەسکە پێشیان بکەوم. پاش چەند خولەکێك گەیشتینە ڕووبارەکە. ئەوکات دڵم خۆش بوو، چونکە لە کۆتایی قەراغ هەموو گوندێك ڕووبارێك هەیە و پاشان ڕاستەوخۆ دەچیتە ناو گوندەکەوە، بەڵام ئەمجارەیان وانەبوو.

"گوندەکە بەسەر ئەو گردەوەیە". ڕێگایەکی پێچاوپێچی بەرداری بوو، زۆر بە سەختی بەسەریدا ڕۆیشتین و ئەوانیش کەمێك وچانیان دا. زۆر تووڕە بووم کە وەستان، دوور لەوان دانیشتم و چاوم بڕییە ڕێگە خۆڵاوییەکە کە بەرەو دارستانەکە دەڕۆیشت و لەوێوە بەئاستەم سەربانی چەند خانوویەك دەبینرا. بەشێك لە من لەناو گوندەکەدا بوو بەشەکەی تریش لە چاوەڕوانیدا ئۆقرەی لێبڕابوو. گاسیمو دۆلکە ئاوەکەی بە ناوماندا گێڕا. من ئاوم نەخواردەوە و چاوەڕوان بووم بەڕێکەوین. لە پێش هەموویانەوە خۆم کۆکردەوە تا خێرا لە پێشیانەوە بڕۆم. هەر لە گردەکە چوومەخوارەوە، تەقەی تفەنگ و وەڕینی سەگ تێکەڵ بە یەك بوون. پاشانناڵین و گریانی خەڵکیش بەدوایاندا. بەپەلە لەو جێیە ڕامانکرد. دووکەڵ تەوقی گوندەکەی دا و چەند پریشکێکیش لە هەوادا بەدیارکەوتن. لە دەوەنێکی نزیك گوندەکە خۆمان حەشاردا و گوێمان بۆ دەنگی هاواری ژن و پیاو و منداڵ ڕادێرابوو. منداڵان کەوتبوونە شین بۆکردن و شریخەی پیاوەکانیش بە جۆرێ بوو کە لە دارستانەکەوە دەنگی دەدایەوە و زریکەی ژنەکانیان داپۆشی. بە گاسیموم وت دەبێت بڕۆم، بەڵام ئەو ڕایکێشامەوە دواوە و نەیهێشت. بەهەموو هێزی خۆم پاڵم پێوەنا و لە دەستی هەڵاتم. بەجۆرێك ڕامکرد کە هەستم بە قاچەکانی خۆم نەدەکرد. ئەوکاتەی من چوومە ناو گوندەکەوە، ئاگر لە هەموو جێیەك هەڵدەستا، گوللەی تفەنگ وەك گەڵای مانگۆی هەڵوەریوی بەیانیان پەرش ببووەوە و زەوی داپۆشیبوو. نەمدەزانی لە کوێوە دەست بە گەڕان بکەم. گاسیمو و کوڕەکانی تریش بە دوامدا هاتن و هەموو وەستان و چاویان بەناو گوندە گڕتێبەربووەکەدا دەگێڕا.

ئەوەندە گەرم بوو، ئارەقم دەردابوو، بەڵام سڵم نەدەکرد بچمە نێوان خانووەکانەوە. بزماری سەقفە تەنەکەکان دەکەوتنە خوارەوە و قیینی ئاگرەکەی زیاتر دەکرد.

هاوار لە چەند خانوویەکی دەوروبەر بەرزبووەوە. بە خێرایی بەرەو لایان رامانکرد و لە قەراغ درەختی قاوەکان چووینە لای ئەو خانووەی کە دەنگەکەی لێوەدەهات، هەموو لە ژوورەوە گیریان خواردبوو، ئاگرێکی لەرادەبەدەر لە ژوورەوە پەنگی خواردبوو، ڕووخساری خۆی لە پەنجەرەو سەربانی خانووەکەوە نیشان دەدا. دەسکەوانێکمان هەڵگرت و دەرگاکانمان پێی شکاند، بەڵام زۆر درەنگ بوو، تەنها ژنێك و منداڵێك هاتنە دەرەوە. گڕتێبەر بوو بە خێرایی بە هەموو لایەکدا ڕایاندەکرد و هەرچییەك لەو دەورو بەرەدا بوایە، خۆیانیان پیادەکێشا و دووبارە دەگەڕانەوە بۆ لایەکی دی و هەمان شتیان دەکرد. پاش کەمێك ژنە بە زەویدا کەوت و لە جووڵە کەوت. منداڵەکەش لەژێر درەختێکدا دانیشت قرووسکەیەکی کرد و پاشان لە جووڵە کەوت. ئێمەش وەك ئەوەی لە زەویدا ڕووابێتین، وەستابووین و سەیرمان دەکرد، هەموو ئەمانە زۆر بە خێرایی ڕوویان دا. هێشتا زریکەی ئەو منداڵە لە مێشکمدا دەنگی دەدایەوە. وەك ئەوەی لە جەستەی مندا ڕۆحی دەرچووبێت.

گاسیمو لەو جێیە ڕۆیشتبوو کە منی لێ وەستابووم، گاسیمو هەموومانی بانگ کردە لایەکی گوندەکە، دەستبەجێ بەرەو لای ڕامانکرد. زیاتر لە بیست کەس بەدەمدا کەوتبوون لەسەر زەوییەکە و هەموو ڕیز ببوون و خوێن لە جێی فیشەکەکانیانەوە دەتکا. هەندێ لە خوێنەکە

چۆراوگەی بەستبوو بۆ ژێر لاشەکانی تریش، وەك ئەوەی بیانەوێت تێکەڵ بەیەکدی بن. دەنگی گریانی گاسیموش لەگەڵ هەڵدانەوەی هەر لاشەیەك زیاتر دەبوو. هەندێکیان چاو و دەمیان بە جۆرێ کرابووەوە کە دیاربوو چەند لە ترساندا خۆیان گرژ کردووە و چاوەڕوانی گوللەیەك بوون تا لەپشتیانەوە لاشەیان بپێکێت. هەندێکیان لەگەڵ هەڵمژینی دوا هەناسەیان گڵۆ پیسی سەر زەوییەکەیان هەڵمژیبوو. لاشەکان زۆربەیان پیاو بوون، تەمەنیان لە بیستەکاندا بوو، هەندێکی کەمیان منداڵتر بوون. لە لایەکی تری دێیەکە لاشەی نیوە سووتاوی ئەو کەسانە کەوتبوون کە لە جەنگدا بوون تا لەدەست ئاگرەکە خۆیان ڕزگاربکەن، هەموو ئەم جەنگەش تەنها لەپێناو ئەوەدا بووە کە لە دەرەوەی ماڵەکانیان گیان لەدەست بدەن. هەموو لە چەند شێوەیەك خۆیان ڕێکخستبوو. هەندێکیان ئەژنۆیان تا لای سەریان چەماندبووەوە و ئێسقانە سپییەکانی شەویلگەیان بەدیارکەوتبوون. هەندێکیشیان وەك چۆن منداڵ خۆی لە سکی دایکیدا لوول دەکات، بەو جۆرە سڕ ببوون. ئاگرەکە دامرکایەوە و بەناو دێیەکەدا ڕامکرد. بەدوای شتێکدا دەگەڕام کە نەمدەویست بیبینم. بە دوودڵییەوە سەرنجی هەموو ڕووخسارەکانم دا، بەڵام ئاسان نەبوو ناسینەوەی، جگە لەوە خەڵکێکی زۆر کەوتبوون. گاسیمو ئاماژەی بۆ خانوویەکی سووتاوی خەڵۆزئاسا کرد و وتی: "ئەوان لەو خانووەدا دەژیان". ئاگر هەموو چوارچێوەی دەرگا و پەنجەرەکانی لەناوبردبوو، ئەو قوڕەی خرابووە نێوان دارەکانەوە، دەکەوتنە سەر زەوی، بەرە بەرە ئەوگوریسانە بەدەر دەکەوتن کە ئاگر بەرەولایان ڕێی دەکرد. جەستەم وشك بوو. بەتەنها چاوەکانم دەجوڵان

که بە هێواشی دەمترووکاندن. هەولّم دا قاچەکانم ڕابوەشێنم تا دووبارە خوێن تیایدا هاتوچۆ بکاتەوە، بەڵام بە زەویدا کەوتم و بەدەستەکانم ڕووخساری خۆمم گرت. هەستم دەکرد چاوەکانم دەرپۆقیون و تا دێت زیاتر لە چاڵی چاومەوە دەردەپەڕن و ئازارێکیش لەبری شۆك دەستی بەسەر جەستەمدا گرت.

هەستامە سەرپێ و بەڕاکردن بێ ترس خۆم کرد بە خانووەکەدا. دووکەڵ سەرتاپای ژوورەکەی گرتبوو، چاوم گێڕا هیچ لاشەیەکم نەبینی. عەرزەکەی تەژی پاشماوەی سووتاو و خۆڵەمێش بوو. هیچ لاشەیەکی ڕەق، یان نەشێواوم بەرچاو نەکەوت. پڕ بە سییەکانم هەناسەم هەڵمژی و هاوارم کرد و بە هەموو هێزی خۆم دەستم کرد بە گریان. شەق و بۆکسم لە دیوارە گڕ تێبەربووەکان دەدا، بەڵام هەستم بە ئازار نەدەکرد. کوڕەکانی تر ڕایانکێشامە دەرەوە منیش بەردەوام بۆکس و شەقم هەڵدەدا. گاسیمو وتی: "هەموو ئەم گوندە گەڕاوم بۆیان، نەمدۆزینەوە".

لەسەر زەوییەکە دانیشتم و قاچەکانم لەناو پیسییەکەدا بڵاوە پێکرد. بە هەردوو دەستم سەری خۆمم گرت. پڕ بووم لە تووڕەیی. لە تووڕەییدا فسەفسم بوو. هەستم دەکرد دڵم وەختە بتەقێتەوە. لە هەمانکاتدا هەستێکی وام هەبوو کە شتێکی لە ڕادەبەدەر قورس لەناو سەرمدا دانراوە، ئازارێك لە ملمدا پەیدا بوو. نازانم چیم لێ بەسەرهات، بەڵام لەناکاو هەستامە سەرپێ و پەلاماری گاسیموم دا و توند ملیم گرت. "ناتوانم هەناسە بدەم..."، پاشان پاڵێکی پێوەنام و کەوتم بەسەر دەستکەوانێکدا. هەستامەوە و دەستکەوانەکەم پیاکێشا ئەویش کەوت بە

زەویدا. کە هەستایەوە خوێن لە لوتییەوە دەپرژا و وتی: "مـن نەمـدەزانی ئەمە ڕوو دەدات". پاشان دوورکەوتەوە و لەژێر درەختێکی مانگۆ دانیشت و لوتی خۆی سڕی. کوڕەکانی تریش لەسەر زەوییەکە توند گرتیانم. پاشـان بوو بـە هـەرا و مشـتومڕ. هەنـدێکیان دەیـانوت هەڵـەی گاسـیمو بـوو خێزانەکانمان نەبینی، هەندێکی تریان دەیانوت هەڵەی ئەو نەبوو، گاسیمو نەبوایە ئێمەش دەمردین. بەلامەوە گرنگ نەبوو، دەمویست ئەوان ببینم و لەگەڵ ئەواندا بمرم. پاشان بوو بە ئاژاوە و شەڕ لەنێوانیان. شتیان دەگرتـە یەك و شەقیان لە یەکتر هەڵـدەدا. ئـەلهاجی پـاڵێکی بـە جوومـاوە نـا و خستی بەسەر ئاگرەکەدا و پانتۆڵەکەی گڕی تێبەر بوو. جوومـاش هـاواری لێهەستا و خۆی لەناو پیسییەکەدا دەخولاندەوە تا ئاگرەکـە بکوژێنێتـەوە، پاشان هەستایەوە سەرپێ و بەردێکی کێشـا بەسـەری ئـەلهاجی و سـەری پڕکرد لە خوێن. توڕەتر بوو. بەرەو ئەلهاجی ڕایکرد، بـەڵام گاسـیمو تونـد گرتی و هێنایە لای خۆی و بە پارچە قوماشێك سەری بۆ بەسـت. هـەموو بێدەنگ و تـا دەهـات تـوڕەتر دەبـووین لەهـەموو ئەوانـەی ڕوویانـدابوو. دەمانزانی ئەوە کۆتایی گەشـتەکەمانە. "هەڵـەی کـەس نـەبوو" وەختـێ گاسیمو ئەمەی وت، زیاتر و زیاتر توڕە بووم، دەمویست دووبارە هەستمەوە بۆی، بەڵام لەوکاتەدا گوێمان لە هـاواری چـەند کەسـێك بـوو بـەڕاکردن چووینە لای کێڵگەی قاوەکەوە و سەیرمان کرد نزیکی ١٠ یـاخیبوو بـوون پێدەکەنین و بـە دەنگـی بـەرز دەدوان و دەستخۆشـییان لەیـەکتر دەکـرد. جلەکانیان خوێناوی بوو. دووانیان پێدەچوو کەمێك لە مـن گـەورەتر بـن. یەکێك لە کوڕەکان کەللەسەری پیاوێکی بە قـژ هـەڵگرتبوو. ئـەو سـەرە

لەوە دەچوو هێشتا هەست بە ئازاری قژی بکات کە بە توندی ڕادەکێشرێت. خوێن لەو جێگەیە دەتکا کە ڕۆژێك لە ڕۆژان جێی "مل" بووە. گازۆلین و دەستەیەك شقارتەیان پێبوو. لەسەر زەوییەکە دانیشتن و یاریی کارتیان دەکرد و ماریجوانایان دەکێشا و بە خۆفشانەوە باسی کارەکانی ئەو ڕۆژەیان دەکرد. کوڕێکی زەعیف کە پێدەچوو لە هەموویان دڵخۆشتر بێت، پێدەکەنی و وتی: "ئەمڕۆ سێ گوندمان سووتاند". یاخیبووەیەکی تر کە جلی سەربازیی لەبەردا بوو، وتی: "وایە... سێ گوند لە چەند کاژێرێکی کەمی دوانیوەڕۆ! جێی سەرسوڕمانە". وەستا و یاریی بە جی ٣یەکەی دەکرد و وتی: "ئەم گوندەم لە هەمووی پێ باشترە، یەك کەسی تیا دەرنەچوو، هەموو ئەوانەی کەوتنە بەر دەستمان کوژران، هەموو ئەوانەی فەرمانمان پێکرابوو، جێبەجێمان کرد. دڵنیام سەرۆك بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر دڵخۆش دەبێت".

کاتێك قسەی دەکرد، هەموو ئەوانی تر یارییەکەیان وەستاندبوو تا گوێ بۆ ئەم بگرن. سەریان بۆ لەقاند و قسەکەیان پەسەند کرد، پاشان دەستیان کردەوە بە یاریکردن. یەکێك لە یاخیبووەکانی تر کە بە پێوە وەستابوو، وتی: "هەندێك لە خەڵکی گوندەکەی تر ڕایانکرد". پاشان دەستی بە ناوچەوانیدا هێنا وەك ئەوەی بیربکاتەوە چۆن ئەمە ڕوویداوە. پاشان وتی: "دیارە لە دوورەوە دووکەڵی ئەم گوندەیان بینیوە و ڕایانکردووە، پێویستە ستراتیجەکەمان بگۆڕین و لەیەك کاتدا هێرش بکەینە سەر هەموو گوندەکان". ئەوانی تر ئەوەندە گوێیان بە قسەکانی ئەم نەدا، وەك ئەوەی گوێیان بە قسەی یاخیبووەکەی تر دەدا. بەردەوام بوون

لە یاریکردن و قسە کردن بۆ ماوەی چەند کاژێرێك و بێ هیچ هۆکارێك چەند فیشەکێکیان بە ئاسماندا تەقاند. یەکێك لە ئێمە جوڵەیەکی کرد و دەنگی لە گەڵای وشکەوەبووی قاوە هێنا، یاخیبووەکان دەستبەجێ یارییەکەیان وەستاند و دەستیان کرد بە گەڕان. دووانیان بەرەولای ئێمە هاتن و چەکەکانیان ئاڕاستە کردین. دەستبەجێ ڕامانکرد بەرەو دارستانەکە و بەدواماندا فیشەکیان تەقاند. گاسیمو لەپێش هەموومانەوە بوو، ڕێگەکە شارەزا بوو، ئێمەش بەدوایەوە بووین. گەیشتینە کۆتایی گوندەکە و گاسیمو وەستا تا هەموومان گەیشتین "هەمووتان بەیەك ئاڕاستە بڕۆن..." سەیری یەکمان کرد و بزەیەکی تێگرتم، نازانم لەبەرچی، بەڵام ڕووخساری زیاتر تووڕەی کردم. بەلایدا ڕۆیشتم و چووینە سەر ڕێگەیەکی باریکی بە گژوگیا داپۆشراو، من لەدوای ئەلهاجییەوە دەڕۆیشتم و ئەویش لقی درەختەکانی دووردەخستەوە و دەیدایەوە بە دەموچاوی مندا، بەڵام پێویست بوو نەوەستین، دەنگی تفەنگەکان نزیکتر دەبوون. بێ وەستان بۆ ماوەیەك ڕامانکرد تا ئاسمان خۆری ڕاپێچ کرد و ئەوکات مانگ لەدایك بوو ئەستێرەکانی لەگەڵ خۆی برد و ئاسمانی خستە گریان و ئێمەی ڕزگارکرد. شەومان لەژێر درەختێك بەسەر برد. جلەکانمان تەڕ و هەناسەبڕکێمان بوو. لەناکاو گاسیمو وەك و منداڵ دەستی کرد بە گریان. هەمیشە ئەم جۆرە شتانە دەیانترساندم. کە منداڵ بووم فێرکرابووم کە پیاوان تەنها ئەو کاتانە دەگرین کە هیچ ڕێگە و چارەیەکی تریان لەبەر دەستدا نییە. پاشان لەبەر ئازار لەسەر زەوییەکە خۆی دەخولاندەوە. بە هەموومان بەرزمان کردەوە ئەو کات زانیم لەبەرچی دەگری. لەکاتی

ڕاکردنەکە چەند فیشەکێکی بەرکەوتبوو. قاچی ڕاستی خوێنی لێدەهات و ئاوسابوو، دەستی گرتبوو بە ناوقەدییەوە و نەیدەویست لای ببات. ئەلهاجی دەستی گاسیموی لابرد و خوێن لە ناوقەدییەوە چۆڕا، وەك ئەوەی دەستی ڕێگر بوویێت لەو خوێنەی بە لێشاو دەهات. ئەلهاجی داوای لێکردم دەست بخەمە شوێنی برینەکە، هەروام کرد، بەلاّم خوێن لەنێوان پەنجەکانمەوە فیچقەی کرد. سەیری منی کرد و چاوەکانی وردە وردە بەقوڵدا دەچوون. دەستی بەرزکردەوە و ویستی بیخاتە سەر دەستی من کە برینەکەم پێ گرتبوو. چیتر نەگریا، هەرچەندە فرمێسك هەر لە چاوانی دەهاتە خوارەوە، بەلاّم بەقەد ئەو خوێنە نەبوو کە لێی دەڕژیشت. مووسا چیتر توانای بینینی ئەو دیمەنەی نەبوو، بۆیە لەهۆش خۆی چوو. من و ئەلهاجی جلەکانی گاسیمومان داکەند و جێ برینەکەمان پێ بەست. ئەوانی تریش سەیریان دەکردین. مووسا پاش ماوەیەك هاتەوە هۆش خۆی و یارمەتی داین. گاسیمو بەدەم هەناسەبڕکێ و هەنسکدانەوە چەند وشەیەکی پێکا، کە زۆر بەئاستەم لێی تێگەیشتین. پێی وتین لەو نزیکانەوە واهلی* یەك هەیە گەر بگەڕێینەوە بۆ کێڵگەکە لەوێ پیشانمان دەدات چۆن ئەو دووڕێگایە یەك پێ بگرینەوە و ڕێی دەرچوون دیاریی بکەین، چونکە ئەو شەوە بە ڕێگای هەڵەدا ڕامانکردبوو. گاسیمو دەستەکانی خستە سەرشانی من و ئەلهاجی و هەستایە سەرپێ و بەهێواشی بەناو دەوەنەکاندا بردمان، زوو زوو وچانمان دەدا تا ئارەقی ناوچەوانی بسڕین. نزیکی نیوەی ڕۆژ بوو، گاسیمو هەموو لەشی کەوتە لەرزین و داوای لێکردین دایبنێین. دەستی

---

* ناوچەیەکە لە دەرەوەی گوندەکان، خەڵکی لەوێ قاوە و بەرووبوومی تر دەچێنن.

بە سکییەوە گرت و لەتاو ئازار خولی دەخوارد. پاشان ڕاکشا و چاوی بڕییە ئاسمان، قاچەکانی دەلەرزین و پاش ماوەیەك دەوەستان، دەستەکانی بەهان شێوە پاشان پەنجەکانی. ئەلهاجی بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: "با هەڵیگرین".

دەستی خستەوە سەرشانمان و قاچەکانی لە زەوی دەخشاند و دەستەکانی ساردوسڕ بوون و خوێنی لێدەڕژیشت. هیچ کەس قسەی نەکرد، هەموو دەمانزانی چی ڕوو دەدات.

گەیشتینە واهلییەکە. چاوەکانی گاسیمو هێشتا کراوە بوون. ئەلهاجی دەستی بە چاوەکانیدا هێنا و دایخستن. هێشتا خوێن بە قۆڵ و دەستەمانەوە بوو. زۆر پەشیمان بووم کە بەدەسکەوانەکە لێمدا، خوێنی وشکەوەبوو هێشتا بە لوتییەوە مابوو. بەهێمنی دەستم کرد بە گریان، نەمدەتوانی ئەوەندەی خۆم دەمەوێت بگریم.

خۆر ئامادە بوو ئاسمان جێبهێڵێت. خۆر بۆ ئەوە هاتبوو گاسیمو لەگەڵ خۆی ببات. لەتەنیشت گاسیمۆوە دانیشتم و توانای بیرکردنەوەم نەبوو، نەمدەزانی چی بڵێم، بیرم لەوە دەکردەوە داخوا گاسیمو هەستی بەچی کردبێت کاتێك پەنجەکانی دەلەرزین و دوایەمین هەناسەی دەرچوو.

# دوانزه

لەڕاستیدا بەبیرمدا نایەت چەند ڕۆژ بەڕێگەوە بووین. تا ئەوکاتەی دوو پیاو تفەنگەکانیان ئاڕاستەکردین و ئاماژەیان کرد نزیکتر بینەوە. چووینە نێوان دوو ڕیز لە پیاوەکان کە چەکی تاپڕ و (ئار. پی. جی)، (جی٣) و (ئەی کەی-٤٧)یان پێبوو. ڕووخساریان ئەوەندە ڕەش بوو لەوەدەچوو خەڵوزیان لە خۆیان هەڵسوبێت. بەڕوویەکی تاڵەوە چاوە سوورەکانیان تێبڕین. چووینە بەشی دواوەی ڕیزەکە، چوار پیاو لەسەر زەوییەکە کەوتبوون و جلی سەربازییان لەبەردابوو، لەخوێندا گەوزابوون. یەکێکیان لەسەر سك کەوتبوو چاوەکانی کرابووەوە و ئەندامەکانی ناو سکی هاتبوونە دەرەوە. ئاوڕم دایەوە، کەللەسەری هەپروونکراوی پیاوێکم بینی. سەرم گێژی خوارد و هەموو شتێك بە بەردەممدا دەخولایەوە. یەکێك لە سەربازەکان شتێکی دەجوو، سەیری منی کرد و پێکەنی پاشان کەمێك ئاوی خواردەوە و ئەوی تریانی کرد بە دەموچاومدا و وتی: "وردە وردە لەگەڵ ئەم بارودۆخە ڕادێیت، هەموومان لە سەرەتاوە هەر وابووین". پاشان دەنگی تەقەی تفەنگ هات لە نزیکەوە و هەموو کەوتنە جووڵە و هەر شەمەکانیان لەگەڵ خۆیان برد، گەیشتینە ڕووبارێك، لەوێ بەلەمە ئەلەمنیۆمەکانیان بە بزوێنەرەکانەوە بە نەرمی سەرئاو کەوتبوون، لاشەی دوو کوڕمان بینی کە شۆرتی سەربازییان لەبەردا بوو لەسەریەك کەڵەکە کرابوون لای ڕووبارەکەوە، پێدەچوو تەمەنیان لەنێوان ١٠-١٣ ساڵان بێت.

خێرا ڕوومان وەرگێڕا و سەرکەوتین. دەنگی تەقە تا دەهات نزیکتر دەبووەوە. فیشەکی (ئار. پی. جی) لە دەوەنەکانەوە بۆ گوێ ڕووبارەکە داباریین.

پیاوێـك کـە شـۆرتی سـەربازی لەبـەردا بـوو، بـەرەو ڕووی شـوێنی بەلەمەکان ڕایکردە خوارەوە و دەستی کرد بە تەقەکردن. ئەو سەربازەی لـە بەلەمەکە لەگەڵ مندا بوو، تەقەی بەرەو ڕووی پیاوەکە کردەوە و پیاوە بـە زەویدا کەوت. بەلەمەکە بەرەو خوارەوەی ڕووبارەکەی بردین تـا گەیشـتینە چەمێك، لەوێ وازیان لێ هێناین. پاشان سەربازێك بەرەو گوندی (یێـل)ی بردین. ئەوێ گوندێك بوو کـە لەلایـەن سـەربازەکانەوە کـۆنترۆڵ کرابـوو. گوندێکی گەورە بوو نزیکەی زیاتر لـە دە خـانووی لێبـوو. هـەموو دار و دەوەنی دەوروبەری گوندەکەیان بڕیبووەوە، جگـە ئەوانـەی لـە ڕووبارەکـەوە دەچێتەوە سەر گوندەکە. سەربازەکان پێیان وتین کـە بـەم جـۆرە مەترسـی هێرشکردنە سەر گوندەکە کـەمتر دەبێتـەوە. لەسـەرەتادا پـێم وابـوو بـۆ دوایەمین جار جێیەکی ئارامان دۆزیوەتەوە لە (یێل). پڕ بوو لـە گەمـە و یاری، ژیانێکی ئاسایی دەگوزەرا. خەلکەکە لەگەڵ سەربازەکان باسیان لـە کەش و هەوا و نەمام چاندن و ڕاوکردنیان دەکرد، بێ ئەوەی کەس باس لە جەنگ بکات. لە سەرەتادا ڕەفتاری خەڵکەکـە تووشـی شـۆکیان کـردین. دوایی تێگەیشتین شتێك نییە تا لێی بترسین. ئەوەی دیمەنی دێیەکەی ڕەش دەکردەوە بینینی ڕووخساری منداڵە هەتیوەکان بوو. زیاتر لـە ٣٠ منـداڵ بوون، تەمەنیان لەنێوان حەوت بۆ شانزە ساڵان بوو. منیش یـەکێك بـووم لەوان. هەموومان لە خانوویەکی لە خشت دروسـتکراوی تـەواو نـەکراودا بووین لەگەڵ چەند کوڕێکی تـردا، بنمیچـەکەی بـە کاغـەزێکی گـەورە

داپۆشرابوو. لەسەر زەوییە چیمەنتۆکە دەخەوتین لەسەر دۆشەکێك و باتانییەکی بچووك، هەر دووکەسە و دانەیەکی بەردەکەوت. سەربازەکان کەلوپەلەکانیان بە دیوارە تەواو نەکراوەکانی خانووەکەدا هەڵدەواسی و لەوێ دوور لە مەدەنییەکان کاتیان دەبردەسەر. ئێواران گوێیان لە مۆسیقا دەگرت سەیری فیلمیان دەکرد و پێدەکەنین و ماریجوانایان دەکێشا، کە بۆنەکەی سەرتاپای گوندەکەی دەگرتەوە. بە ڕۆژیش لەگەڵ خەڵکەکە کۆدەبوونەوە و ئێمەش یارمەتیمان دەدان. من و کانێی لە ڕووبارەکە ئاومان دەهێنا و قاپەکانمان دەشت و ئەوانی تریش پیاز و کولەکە و گۆشتیان دەجنی. پێم خۆش بوو سەرقاڵ بم نەمدەویست هەرگیز بێ ئیش بم. چوونم بۆ ڕووبارەکە و شتنی قاپەکان، ڕێگەیەك بوو بۆ خۆدزینەوە لە بیرکردنەوە لەو شتانەی تووشی سەرئێشەیەکی توندی دەکردم. نیوەی ڕۆژ هەموو ئیشێك تەواو دەبوو، ئێواران خواردن ئامادە دەکرا و چاوەڕێ خواردن دەکرا. خەڵك لە دالآنەکانیان دادەنیشتن ڕوویان دەکردە ئەوپەڕی دێیەکە. دایك و باوکەکان منداڵەکانیان دەهێنایەوە ماڵەوە. کیژۆڵەکان گۆرانییان دەوت، چەپڵەیان لێدەدا و یارییان دەکرد. سەربازە گەنجەکانیش لەگەڵ کوڕەکان فووتبۆڵیان دەکرد. دەنگی خۆشی و گۆرانی و چەپڵە لەوپەڕی ڕووبارەکەوە دەبیسترا. ژیان لەو دێیە بێ ترس بوو، هەموو ئەو یارییانەی دەیانکرد، بەتایبەتی فووتبۆڵ، یادگاریی منداڵی بەبیر دەهێنامەوە، بۆ نموونە ئەو کاتەی تازە ماڵمان گواستبووەوە بۆ (مۆگبویمۆ)، یان ئەو ڕۆژەی تیمەکەی من براوە بوو. (پێکهاتبوو لە جوونیەر و چەند هاوڕێکی تریش). دایکم بە ڕووخساری گەشاوە وە

زەردەیەکی پڕ لە شانازیی بەرەو ڕووم هات و باوکم دەستی بەسەرمدا دەهێنا و دەستی ڕاستمی بەرز دەکردەوە و بە براوە بانگی دەکرد، هەمان شتی لەگەڵ جوونیەر دەکرد. دایکم ئاوی بۆ دەهێناین و لە پاش خواردنەوەی، بە سەرپۆشەکەی ناوچەوانمانی باوەشێن دەکرد. ئەوەندە دڵخۆش بووم دڵم بە خێرایی لێی دەدا و ئارەق بە ناوچەوانمدا، بەسەر لێومدا دەهاتە خوارەوە، ئەوکات تامی سوێریی ئارەقەکەم دەکرد. ئەوکاتەی لەگەڵ خێزانەکەم بووم، هەستم دەکرد لە خۆشیدا دەفڕم. دەمویست ئەو ساتانە زیاتر بخایەنن، نەك لەبەر ئەوەی براوە بووین، لەبەر ئەوەی بزەی سەر لێوی دایك و باوکم لە هەموو شت زیاتر دڵخۆشی دەکردم. ئەو شەوە خۆم لە هەموو یارییەکان بە دوورگرت و لەپشت خانووەکە هەڵتروشکام جێم بۆ ئەو سەرئێشە توندەم کردەوە تا بەهێواشی دەرچێت. بە هیچ کەسم نەوت چیمە. ئەو دکتۆرەی بەیانیانیش چارەسەری خەڵکی دەکرد، تەنها چارەسەری لەرز و تای دەکرد، نەك ئەو سەرئێشەیەی من ئازارم پێوە دەچەشت، یان ئەو خەوە ناخۆشانەی من دەمبینین.

بۆ شەوەکەی ئەلهاجی و مۆریبا و موسا لەسەر عەرزە چیمەنتۆکە لەژێر تریفەی مانگدا کە لە شووشەی پەنجەرەکەوە سەری دەرهێنا بوو، یاریی هەڵماتێنیان دەکرد. موسا لەناو کوڕەکاندا بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە هەرجارەی بە چیرۆکێك کۆتایی بەو شەوە دەهێنێت، من دوور لەوان دانیشتم و لەبەر ئازاری سەرم ددانەکانم جیڕ دەکردنەوە، تا هاوڕێکانم هەست نەکەن کە چیمە، بەڵام چاوەکانی مێشکم هێشتا هەموو ئەو پریشکی ئاگر و وێنە و دیمەنانەیان پیشان دەدام کە بینیبوومن،

دەنگی قیژەی منداڵان و ژنەکان دووبارە لە مێشکمدا زیندوو دەبووەوە. هەستم دەکرد سەرم وەك جەرەس لێدەیات، بەهێواشی دەستم کرد بە گریان. جاربەجار کە ئازاری سەرم دەوەستایەوە بۆ ماوەیەکی کەم خەو دەچووە چاوەکانم تا ئەو کاتەی لەبەر مێردەزمە لە خەو ڕادەپەڕیم. شەوێکیان لە خەونمدا فیشەکێکیان نا بەسەرمەوە، بەسەر زەویدا کەوتبووم و خوێنم لێ دەڕێشت و خەڵکی بەسەرمدا هاتوچۆیان دەکرد، تا سەگێك هات و خوێنەکەمی دەلێسایەوە، دەمویست بیترسێنم تا ڕابکات، بەڵام توانام نەبوو بجوڵێم پێش ئەوەی شتێکی تر بکات لە خەو ڕاپەڕیم بە توندی هەناسەم دەدا و ئارەقم دەکردەوە بە درێژایی ئەو شەوە نەمتوانی بخەوم. بەیانییەکیان بارودۆخی گوندەکە گۆڕابوو وەکو ڕۆژانی تر ڕۆحی تێدا نەبوو. نەمدەزانی چی بووەتە هۆی ئەو گۆڕانە کتوپڕە. هەموو سەربازەکان لە نزیك ڕووبارەکە ڕیزیان بەستبوو، جلی سەربازییان لەبەردا بوو، چەکەکانیان هەڵگرتبوو خۆیان ئامادە دەکرد و مەشقی سەربازییان دەکرد، کڵاو و زرێکانیان لەبن باڵیان دانابوو "ئاگادارین... ئاگادارین"، "لەسەرخۆ" گوێمان لە دەنگی ڕاهێنەرەکەیان بوو. کاتێ من و ئەلهاجی لە ڕووبارەکە ئاومان هێنا لە مەشقکردن وەستابوون. ئەمجارەیان ئەفسەر جاباتی لەبەردەم پیاوەکانی وەستاو و دەستی لە پشتییەوە دانابوو و نزیکەی چەند کاژێرێك قسەی بۆ پیاوەکانی دەکرد پێش نانی نیوەڕۆ. کاتێ ئەفسەر قسەی بۆ پیاوەکانی دەکرد، ئێمە چووین بەلای کاری ڕۆژانەی خۆمان، لە هەمان کاتدا هەوڵمان دەدا بە نهێنی گوێ بۆ قسەکانی ڕابگرین. بۆ ئەوەی ئەمەش ڕووبدات، پێویست بوو نزیك بینەوە لە ڕیزی

سەربازەکان، ئەوەندەی نەمابوو ببین بە یەکێك لە سەربازەکان، کە بێگومان مەحاڵ بوو. ئەو ڕۆژە لە بیرکردنەوەی ئەوەدا بووین ئەفسەر چی بە سەربازەکانی وتبوو. بۆ ئێوارە سەربازەکان تفەنگەکانیان پاککردەوە و ئامادەیان کرد و چەند فیشەکێکیان بۆ تاقیکردنەوە بە ئاسماندا تەقاند ئەو فیشەکانەی وای لە منداڵەکان دەکرد ڕابکەنە بەینی قاچەکانی دایك و باوکیان. هەندێکیان جگەرە و ماریجوانایان دەکێشا و هەندێکی قومار و گاڵتەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، ئەوانی تر لەژێر خێمەکان سەیری فیلمیان دەکرد. ئەفسەر جاباتی لەسەر بالکۆنی ماڵەکەی دانیشت و کتێبی دەخوێندەوە، بە هیچ جۆرێك سەری هەڵنەدەبڕی تەنانەت کاتێ سەربازەکانیشی فیکەیان لێدەدا بۆ ئەو فیشەکانەی لەناو فیلمەکەدا دەتەقێنران.

کاتێك هەموو شت بێدەنگ بوو، سەری هەڵبڕی و منی بەرچاوکەوت کە سەیرم دەکرد. پیاوێکی کەچەڵی بالاّبەرز بوو، جووتێ چاوی گەورەی هەبوو، گوێیەکانی هەڵئاوساو بوون وەکو ئەوەی شتێك لە دەمیدا بێت. پیاوێك بوو بێدەنگییەکەی وای لە مرۆ دەکرد لێی بترسێت و ڕێزی بگرێت. بانگی کردم تا لای دابنیشم.

-"تێر دەخۆیت بەو خواردنەی لێرە ئامادە دەکرێت؟"

-"بەڵێ" لە کاتێکدا سەرقاڵی ئەوە بووم تا بزانم چی دەخوێنێتەوە.

-"شکسپیر، جولییەس قەیسەر. خوێندووتەتەوە؟"

-"لە قوتابخانە خوێندوومە".

-"هیچت بیر ماوە لەوەی فێری بوویت؟"

-"ترسنۆك، پێش مردنی یەکجارەکی، چەندین جار دەمرێت".

پاشان بەردەوام بووم، ئەویش لەگەڵ مندا بەردەوام بوو، کاتێ تەواو بووین ڕووخساری دووبارە گرژیی گرتییەوە و پشتگوێی خستم و دەستی کردەوە بە کتێب خوێندنەوە. سەیری دەمارەکانی ناوچەوانیم کرد کە گرژ دەبوون لەگەڵ خوێندنەوەی هەردێڕێك، یان ڕەنگە بیری لە شتێکی تر کردبێتەوە.

بەسەر نووکی پێوە بە هێواشی لێی دوورکەوتمەوە و شەو خەریك بوو دەهاتە جێی ڕۆژ.

کاتێك تەمەنم ٧ ساڵان بوو، دەچووم بۆ ئەو شوێنەی گەورەکان لەسەر کورسییەکی درێژی تەختەی بێ پشت دادەنیشتن و باسی شکسپیر و ئەو شتانەیان دەکرد کە ڕۆژانە لە کۆمەڵگاکەمان ڕووی دەدا، پاشان منیان بانگ دەکرد تا یەکێك لە بەرهەمەکانی شکسپیر بخوێنمەوە، باوکم کۆخەیەکی بە دەنگی بەرز دەکرد تا ئەوانی تر بێدەنگ بن و من دەست بە خوێندنەوە بکەم. پاشان بە گەورەترین زەردەخەنەوە کە وا دەردەکەوت چەند ساڵێك بخایەنێت تا ڕووخساری جێدەهێڵێت، لە ڕیزی پێشەوە دادەنیشت و قۆڵەکانی لەسەر یەکتر دەچەماندەوە. منیش لەسەر یەکێك لە کوورسییەکان دەوەستام و بەو گۆچانەی بەدەستمەوە بوو کە دەوری شمشێری دەبینی، دەستم پێدەکرد سەرەتا بە قەیسەر "ڕۆمانییەکان... هاوڕێکانم... ئەی پیاوانی شارەکەم گوێم بۆ ڕاگرن..."، لە قەیسەرەوە بۆ ماکبیس ئەو بەرهەمانەی زۆرتر گەورەکان چێژیان لێوەردەگرت. زۆر دڵخۆش بووم بە

خوێندنـەوەی ئـەو بەرهەمانـە هەمیشـە وام هەسـت دەکـرد دەتـوانم بـە ئینگلیزییەکی باش بدوێم.

ئەو شەوەی سەربازەکان بەڕێکەوتن، لەخەو ڕاپەڕیم.

دەنگی ڕەوتی سەربازیی لەو نیوەی شەوەدا کەشـوهەوایەکی نائاسـا و ترسناکی خولقاند کە تا بەرەبەیان و تەنانەت درێژایی ئەو ڕۆژەش بەردەوام بوو. نزیکەی دە سەرباز لە گوندەکەی ئێمە مانـەوە تـا پارێزگاریمـان لـێ بکەن، هەریەکەیان لەو شوێنانەی بۆیان دەستنیشانکرابوو، جێگیر ببوون. ئێوارە پەنجەکانی جولاَنـد و هێمـای بـۆ شـەو کـرد تـا جێـی بگرێتـەوە، سەربازەکان چەند فیشەکێکیان بە ئاسماندا تەقاند، داوایان لە خەڵك کـرد تا بچنە ژوورەوە و تا دەتوانن لە ئاستێکی نزم دانیشـن. ئـەو شـەوە هـیچ چیرۆکێك لە موساوە نەبیسترا، مۆریبا چی تر یاریی هەڵماتێنی نـەدەکرد، هەموو پاڵمـان بـە دیوارەکـەوە دابـووەوە و گوێمـان لـە دەنگـی تەقـەی تفەنگەکان دەگرت کە لە دوورەوە دەهاتن، مانگ بەناو هەورەکاندا سەوڵی لێـدەدا و لەپشـت هەورەکانـەوە سـەیری دەکـردین پـێش ئـەوەی دەنگـی کەڵەشێرەکان ڕاوبینێن.

بەیانی نەك خۆری لەگەڵ خۆیدا هێنا، بەڵکو سەربازەکانیشی لەگـەڵ خۆیدا گەڕاندەوە. هەندێکیان شکستیان هێنابوو، پۆستاڵەکانیان لە قوڕ و پیسیدا گەوزابوو، دوور لە یەکتر دانیشـتن و خۆیـان بـە تفەنگەکانیانـەوە نووساند. وەك ئەوەی تفەنگەکانیان تەنها شـت بێـت کـە ئارامییـان پـێ ببەخشێت. یەکێك لە سەربازەکان کە لەسەر خشتێك لەژێر چێشـتخانەکە دانیشتبوو، دەستەکانی خستبووە ناو سەرییەوە و خۆی ڕادەژەند، هەسـتایە

سەر پێ و کەمێك بە گوندەکەدا هاتوچۆی کرد، گەڕایەوە و لەسەر هەمان خشت دانیشت. بەدرێژایی ڕۆژ ئەمەی بۆ چەند جارێك دووبارە کردەوە. ئەفسەر جاباتی گوێی لە ڕادیۆ دەگرت، لەناکاو هەڵیگرت و توند دای بە دیوارەکەدا و چووە ژوورەکەی خۆی. ئەو ڕۆژە ئێمەی مەدەنیش قسەمان لەگەڵ یەکتر نەکرد، هەموومان سەیری ڕەفتارە شێلگیرەکانی سەربازەکانمان دەکرد.

لە نیوەی ڕۆژدا نزیکەی ٢٠ سەرباز هاتنە گوندەکە، ئەفسەر جاباتی زۆر دڵخۆش بوو بە بینینیان، بەڵام هەر زوو دڵخۆشی خۆی لەسەر ڕووخساری شاردەوە. بەرەولایان ڕۆیشت و سەربازەکان خۆیان ئامادەکرد و بەرەو جەنگ ڕۆیشتن. هیچ شتێك نەماوە تا جێی شاردنەوە بێت، هەموومان دەمانزانی کاتی جەنگ هاتووە. هەر سەربازەکان ڕۆیشتن، گوێمان لە دەنگی تەقە بوو کە نزیکتر دەبووەوە لە دێیەکە. ئەو سەربازانەی چاودێری گوندەکەیان دەکرد، داوایان لێکردین لە ژوورەوە بمێنینەوە. دەنگی تەقە تا ئێوارە بەردەوام بوو، گۆرانی باڵندەکان و سروودی سیسرکەکانیان دەبڕی. شەوان سەربازەکان بە ڕاکردن دەگەڕانەوە تا چەکی تر لەگەڵ خۆیان بەرن و کەمێکیش پشوو بدەن. سەربازە بریندارەکان دەهێنرانەوە تا لەبەردەم ڕووناکی چراکاندا نەشتەرگەرییان بۆ بکرێت. هەرگیز ئەوانەی مردبوون لاشەکانیان نەدەهێنرانەوە. گیاوەکان ڕیز دەکران و فیشەك بەسەریانەوە دەنرا. هەموو ئەمانە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بەردەوام بوون.

ئـەو ژمـارە زۆرەی سـەربازەکان کـە بـۆ جـەنگ دەنێـردران، تـەنها کەمێکیان دەگەڕانەوە. سەربازەکان تووڕە و تۆقرە لێبڕاو ببـوون، تەنانـەت تەقـەیان لـەو مەدەنییانـەش دەکـرد کـە شـەوانە ئاودەسـتخانەکانیان بەکاردەهێنا. ئەفسەر جاباتی داوای لـە هـەموو پیاوەکـانی کـرد هـەموو خەڵکەکە کۆبکەنەوە. "لە دارسـتانەکە پیـاوانی وای لێیـە کـە ئامـادەن هەموومان لەناوبـەرن. بـەپێی توانـا جـەنگمان لەگـەڵ کـردوون، بـەڵام ئاستەمە بەرەنگاری ژمارەیەکی وەها زۆر ببینـەوە، هـەر زوو بـە هـەموو گوندەکەدا بڵاودەبنـەوە" پاشـان بـە دەسـتەکانی بازنەیـەکی دروسـتکرد "دەیانەوێت ئەم گوندە داگیر بکەن، ئمانکوژن و خواردەمەنی و چەکەکانمان ببەن". کەمێك وەستا و بە لەسەرخۆیی بەردەوام بوو "هەندێکتان لێـرەن، لەبەرئەوەی ئەم پیاوانە دایك و باوکتانی لەناوبردوون، هەندێکتان لێـرەن، چونکە ئێرە گوندێکی بێ مەترسییە، باش بزانن لە ئێستا بەدواوە چی تـر بێمەترسی نییە، پیاوان و کوڕانی ئازامـان دەوێـت تـا یارمـەتیمان بـدەن بەرەنگاریان بینەوە. ئەگەر ناتانەوێت بجەنگێن، ئاساییە بەڵام لـەم گونـدە جێتـان نابێتـەوە، دەتـوانن ئـازاد بـن و بـڕۆن لـەم گونـدە جـەنگاوەر و چێشتلێنەرەکانمان بەسە، ئێستا ژنـی تـەواومان لەبەردەسـتایە تـا کـاری چێشتخانە بەڕێوەببەن، کەواتـە پێویسـتە هـەموو کوڕەکـان بێنـە ڕیـزی جەنگاوەران، ئەمە تەنها ڕێگەیە تا ئەم گونـدە لـە وێرانبـوون بپـارێزین. ئەمە هەلێکی گونجاوە تا تۆڵەی دایك و باوکتان بسێنن و دڵنیـابین تـەم منداڵانەی لێرەن دایك و باوکیان لەدەسـت نـادەن" هەناسـەیەکی قـووڵی هەڵمژی "سـبەینێ هـەموتان ڕیـز دەبـن و هەریەکـەتان کـارێکی پـێ

دەسپێردرێت". پاشان جێی هێشتین و پیاوەکانی بەدوایدا ڕۆیشتن. بۆ ماوەیەك بێدەنگ بووین پاشان بە هێواشی بەرەو جێی خەوتنەکانمان بەڕێکەوتین. زەنگ لێدرا و کرا بە شەو. لە ژوورەوە من و ئەلهاجی و مووسا و مۆریبا کانییێی کۆبووینەوە بە هێمنی دانووستانمان کرد سەبارەت بە هەموو ئەوشتانەی ڕوویاندا. ئەلهاجی ئەو تەنگوچەڵەمەیەی ڕووبەڕوومان هاتبوو ڕوونی کردەوە و وتی: "یەکێك لە ئەفسەرەکان وتوویەتی هەرچی لەم گوندە بێت دەکوژرێت، لەبەرئەوەی هەموومان بە جاسووس، یان جەنگاوەر دژی ئەوان لەقەڵەم دەدرێین". کوڕەکانی تریش لەسەر ڕایەخەکانیان هەستان و دەوری ئەلهاجییان دا "واباشترە لێرە بمێنینەوە". چار نەبوو ئەگەر گوندەکەمان جێهێشتایە دەچووینە ڕیزی مردووان.

سەربازێك بە بڵندگۆکەی هاواری کرد "ئاگاداری... ئەمە فەرمانی ئەفسەر جاباتییە هەمووتان لە هەمان جێ کۆببنەوە هەرئێستا". پێش ئەوەی دوا وشە بڵێت، هەموو خەڵك کۆبوونەوە و چاوەڕوانی ئەو ساتەی دەکرد کە فەرمانێك دەربکرێت تا ژیانیان بێ مەترسی بمێنێتەوە. پێش ئەوەی ئەم فەرمانە بکرێت، لەگەڵ هاوڕێکانم لە نزیك پەنجەرەی چێشتخانەکە دانیشتبووین. هاوڕێکانم ڕووخسارییان هیچ هەستێکی تیا نەدەبینرا، بەڵام چاوەکانیان پڕ لە داخ بوون، دەمویست سەیریان بکەم، بەڵام ئەوان ڕوویان وەردەگێڕا زۆرم لەخۆم کرد تا نانی بەیانیم بخۆم، بەڵام ئارەزووم نەمابوو.

لە ڕیزی دواوە جێی خۆمان کردەوە، فیشەك ئاسمانی پڕکرد، پاشان بێدەنگییەك ڕووی لە ناوچەکە کرد، کە بەرگەگرتنی سەختتر بوو لە دەنگی فیشەکەکان.

ئەفسەر چەند خشتێکی سەریەك خست و چووە سەریان تا هەموومان بەباشی بیبینین. ڕێگەی بە بێدەنگی ناوچەکەدا تا ڕۆبچێتە ناو ئێسکەکانمانەوە. پاشان دەستی بۆ چەند سەربازێك ڕاوەشاند کە پێش ئێمە دوولاشەیان هێنابوو، کە پیاو و کوڕێکی منداڵ بوون، پێشتر لە گوندەکەی ئێمە دەژیان. پێدەچوو تازە کوژرابێتن، خوێنی جلەکانیان وشك نەبووبووەوە چاوەکانیان کراوە بوون. خەلکەکە هەموو ڕووی وەرگێڕا. منداڵەکان دەستیان بە هاوار و گریان کرد. ئەفسەر قوڕگی پاککردەوە و لە ناوەندی ئەو قیژە و گریانەدا دەستی کرد بە قسەکردن، کە بەدرێژایی قسەکانی ئەم بەرەو کپبوون دەڕۆیشت. "دەبێت بمبوورن کە ئەم دوولاشە تۆقێنەرەتان پیشان دەدەم، بەتایبەتی کە منداڵەکانیشتان لێرە ئامادەن.

بەڵام هەمووتان مردووتان بینیوە و دەستتان لە لەرزین کەوتووە لەگەڵ هەرببینینێکدا..." بەرەو ڕووی لاشەکان ڕۆیشت و بە هێمنی بەردەوام بوو "ئەم پیاوە دەیویست لەگەڵ ئەم منداڵە ڕابکات و بەشداری شەڕ نەبێت، منیش ڕێم لێ نەگرتن و ئازادم کردن. بە چاوی خۆتان ببینن ئەوەی ئێرە جێبهێلێت چی لێبەسەر دێت". پاشان بۆ ماوەی کاژێرێك بەردەوام بوو، باسی ئەوەی دەکرد چۆن یاخیبووەکان سەری خێزانەکانیان لەبەر چاوی یەکتریدا بڕیوە و خانووەکانیان بە خەلکەکەی ناوەوە سوتاندووە. زۆریان لە کوڕەکان کردووە لەگەڵ دایکی خۆیان تێکەڵ بن و منداڵە ساواکانیان

پارچە پارچە کردوون، لەبەرئەوەی گریاون. سکی دایکە دووگیانەکانیان هەڵدڕیوە و منداڵەکانیان دەرهێناوە و کووشتویانن. ئەفسەر تفێکی لە زەوی کرد و پاشان بەردەوام بوو تا ئەوکاتەی دڵنیا بوو هەموو ڕێگەی ئازاردانی یاخیبووەکانی بەرامبەر بە خەڵکی ڕوونکردووەتەوە. "هەموو سیفاتێکی مرۆبوونیان لەدەست داوە. شایانی ئەوە نین بژین، پێویستە هەموویان لەناوبەرین، بەمە گەورەترین شەیتان لەناودەبەین و کارێکی گەورەش بۆ وڵاتەکەمان ئەنجامدەدەین". پاشان چەند فیشەکێکی بە ئاسماندا تەقاند، هەموو دەستیان کرد بە هاوارکردن "پێویستە هەموویان بکوژین نەهێڵین جارێکی تر بەسەر ئەم زەوییەدا بڕۆن". هەموومان ڕقئەستوور بووین بەرامبەر یاخیبووەکان، دوای قسەکانی جاباتی ڕووخسارەکان ڕقیان لێدەباری و سامناك دەردەکەوتن. خۆر لە ئاسمان ون بوو، کەش و هەوا تەماویی بوو وەك ئەوەی ئاسمان لە تووڕەییدا وەخت بێت بکەوێتە خوارەوە. من زۆر تووڕە بووم لەهەمان کاتدا دەترسام، هاوڕێکانیشم بەهەمان شێوە. جووما بەناو دارستانەکەدا پیاسەی دەکرد کانییێ بێ چاوترووکان سەیری زەوییەکەی دەکرد، مۆریبا دەستی خستبووە سەر سەری و ئەلهاجی بەدەستی چەپی چاوەکانی داپۆشیبوو، منیش دەستم لەسەر قاچەکانم، کە کەوتبوونە لەرزین.

ژنان و کچان داوایان لێکرا بچنە چێشتخانەکان، کوڕەکانیش بۆ جبەخانەکان لەوێ سەربازەکان ماریجوانایان دەکێشا و سەیری فیلمیان دەکرد. هەرگەیشتییە بیناکە، سەربازێك بە چەکێکی جی ۳یەوە هاتە بەردەم دەرگاکە. بزەیەکی بە ڕووماندا کرد، پاشان چەکەکەی بەرزکردەوە و

چەند فیشەکێکی بە ئاسماندا تەقاند. هەموو خۆمان دا بە زەویدا، ئەویش دەستی کرد بە پێکەنین و چووە ژوورەوە. چووینە ناو بیناکەوە، لە ناوەوە چەند خێمەیەکی تێدا بوو، بێ سەقف بوو، بەلام بەمادەی تارپاولێن داپۆشرابوو، لە هەموو لایەك چەك و تەقەمەنی لای دیوارەکانەوە دانرابوو. تەلەفزیۆنێك لەسەر دێسکێکی کۆن و ڕزیو دانرابوو، کەمێك بەولاتر دینەمۆیەك و گالۆنێك گاز دانرابوو. چاوەشێك لەگەڵ سەربازەکانی هاتنە دەرەوە و هەموومانی بردە پشتی بیناکە، ئەوشوێنەی کەسمان نەمانبینیبوو. نزیکەی ١٣ کوڕ لەوێ بووین. دووانیان شێکو و جۆسیا تەمەنیان ٧ ساڵ و ١١ ساڵ بوو. باقی ئەوانی تر تەمەنمان لەنێوان ١٣-١٦ بوو، جگە لە کانییێ کە ئێستا تەمەنی بووە بە ١٧ساڵ. سەربازێك کە جلی مەدەنی لەبەردابوو، فیکەیەکی لەملدا بوون چەکی (ئەی کەی ٤٧)ی بەسەر هەموماندا دابەشکرد، کاتێ هاتە سەرەی من، ویستم سەیری نەکەم، سەری ڕێککردمەوە تا نیگای هەردووکمان بەیەك گەیشتن. بە دەستە لەرزۆکەکانم چەکەکەم لێوەرگرت پاشان عەمارەکەی دایە دەستم، ئەوەندەی تر کەوتمە لەرزین. "هەمووتان لەیەك شتدا لەیەك دەچن! هەموو لە هەڵگرتنی چەك دەترسن، وەك ئەوەی چەکەکە ناڕاستەی سەرتان کرابێت و هەرگیز ناتوانن سەیری چاوی پیاو بکەن".

پاش ئەوەی چەکەکانی بەخشییەوە (ئەی کەی)یەکی بەرزکردەوە "ئەمەی دەیبینن لە ئەمڕۆوە مولکی ئێوەیە، دەبێت ڕابێن، لێی نەترسن، ئەمە بەسە بۆ ئەمڕۆ". ئەوشەوە لەبەردەم خێمەکەمدا وەستابووم، دەمویست یەکێك لە هاوڕێکانم بێنەدەرەوە تا قسە بکەین، بەلام کەسیان

ئەهاتن. ئەلهاجی هاتە دەرەوە سەیرێکی لای منی کرد و گەڕایەوە ژوورەوە، لە دەرەوە وەستام و ئەو هەوایەم هەڵدەمژی کە جاربەجار بۆنی ماریجوانـای لەگەڵ خۆی دەهێنا. هەناسەیەکی بێئومێدییم هەڵـژی و چـوومە ژوورەوە، بەدرێژایی ئەو شەوە نەخەوتم. دەستم خستبووە سەر سەرم، ئەوە یەکەم شەو بوو بەخەبەر بووم و سەرئێشەم لەگەڵدا نەبێت، خۆشم سـەرم سـوورمابوو. لەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا کەڵەشێرێك دەستی بە قووقانـدن کـرد، هێشـتا نیوەی شەو بوو پێم وابوو ئەو کەڵەشێرە سـەری لێشـێواوە. تـا بەرەبـەیان بەردەوام بوو.

ئەوانەی لە خێمەکەدا لەگەڵمدا بوون، شێکو و جۆسیا بـوون، هێشـتا لە شیرین خەودا بوون، کـە کـاژێر ٦ بـۆ مەشـقی سـەربازیی خەبـەریان کردینەوە. "هەستن دەبێت بڕۆین"، ویستم بە هێواشی خەبەریان بکەمەوە، بەڵام خۆیان بەرەو لایەکی تـر دەخشـاند. دەبووایـە بـە شـەپازلە خەبـەرم بکردنایەتەوە. سەربازەکان خێمە بە خێمە دەگەڕان ئاویان بەسەری ئەوانەدا دەکرد کە هێشتا خەوتبوون. لە مەیدانی مەشق یەکمان بینییەوە. شـۆرت و تیشێرت کالەی نایك و ئادیـداس بەهـەموو ڕەنگێـك بەخشـرانەوە، لـە هەموویان زیاتر دڵم بە کالـەکانم خـۆش بـوو. جلـە کۆنـەکانم داکەنـد و پانتۆڵەکەم کە پڕ بوو لە کاسـێتی ڕاپ. دامکەنـد و شـۆرتە سـەربازییە تازەکەم لەبەرکرد. سەربازێك هەموو جلەکۆنەکانی کۆدەکردەوە و دەیخسـتە ناو ئەوئاگرەی کە بەتایبەت بۆ سووتاندنی جلەکانی ئێمە خۆشکرابوو. بـە خێرایی بەرەو ئاگرەکە ڕۆیشتم تا فریای شریتەکانم بکەوم، بەڵام لـە مێـژە توابوونەوە. فرمێسك بە چاوەکانمدا هاتنە خوارەوە.

بــه لێــوی لەرزۆکــەوە ڕووم وەرگێڕایــەوە... پــاش لەبــەرکردنی جلــە نوێیەکانمان هــەموومان ئاسـۆیی ڕیــز بـووین، قاچـەکانمان بڵاوکـردەوە و قۆڵمان ڕێك بۆ خوارەوە دانا. هەندێك لە سـەربازەکان لــە ڕیـزی پێشــەوە گەڕانەوە و چەکەکانیان پڕ لــە فیشــەك کـردەوە، دەموچـاو و جلـەکانیان خوێنی پێوە بوو، بەڵام بایەخی ئەوتۆیان پێ نەدا. هەریەك لە سـەربازەکان بە خێرایی نانی بەیانییان دەخـوارد و لای دیوارێکـەوە دەوەسـتان و تونـد چەکەکانیان بەدەستەوە دەگرت و پڕبەسییەکانیان هەناسەیان هەڵدەمـژی، پێش ئەوەی دەست بە ڕاکردن و مەشق بکەن. شێکو و جۆسیا لە تەنیشـت منەوە بوون، لەبەر ئەوەی لە یەك خێمەش بووین، کەواتە ئێسـتا مـن وەك برا گەورەیان وام، هەمیشە لاسایی منیان دەکردەوە، لەبری ئەو سـەربازەی کە خۆی بە عەریفی سوپا ناوبردبوو. ناوی گادافی بوو. کوڕێکی گەنج بوو، لە جاباتی و چاوەشەکەش گەنجتر بوو. کەچەڵ بوو دەموچاوی لــە تەمــەنی خۆی گەورەتر دەینواند، ڕووخسارێکی توونرتیژی هــەبوو، تەنانــەت کــە زەردەخەنەشی دەکرد وا دەردەکەوت شتێکی زۆر ترش قووت بدات.

سەرەتا بە دەوری جبەخانەکەدا چەندجارێك ڕامانکرد پاشان مەشـقمان کرد تا فێربین چۆن بەسنگە خشـکێ بـەناو دارسـتانەکە بـڕۆین. عــەریف گادافی دەستی بــەرز دەکـردەوە لەگــەڵ هێنانــە خـوارەوەی دەسـتی بــەرەو دارستانەکە ڕامــان دەکـرد و دەسـتبەجێ خۆمــان دەدا بــە زەوییــدا و بــە سنگەخشکێ بەرەو لای ئەو درەختە دەڕۆیشتین، کــە بۆمــان دیــاریکرابوو، بێئەوەی هــیچ دەنگێکمــان لێــوە بێــت، پاشــان هەڵدەسـتاینە سـەرپێ و بەخێرایی بــە خۆمەڵازدانــەوە بــەرەو درەختێکــی تــر دەڕۆیشــتین، دووبــارە

دەگەڕاینەوە هەمان شوێن. عەریف هیچی نەدەوت جگە لە "خراپ نییە"، "زۆر خراپە"، "خێراتر" بە زۆری بە دەستەکانی ئیشارەتی دەکرد "تەنها وشەیەك، واتە فیشەکێك بۆ ناوچەوانتان". پاشان زەردەیەکی گاڵتەئامێزی دەکرد و چاوەکانی زەق دەکردەوە تا ئێمەش پێبکەنین. پاش مەشقکردن ماوەی یەك خوولەکمان هەبوو تا نان بخۆین کەس لە ئێمە نانەکەی بە تەواوی نەدەخوارد، هەموو ئەو خواردنەی لەبەردەستماندا بوو، لێمان وەرگیرا، بەڵام هەر زوو ڕاهاتین لەماوەی خوولەکێکدا شتێك بخۆین، ئەمەش بەشێك بوو لە مەشقکردن کە فێریان کردبووین. پاش نانی بەیانی، هەموومان لەبەردەم عەریف ڕیز بووین (ئەی کەی) بەسەرماندا دابەشکرا، کە هاتە سەرەی من، لەبەردەممدا وەستا و چاوی تێم بڕی وەکو ئەوەی بیەوێت پێم بڵێت کە ئەو شتێکم دەیاتێ کە پێویستە بۆی دڵخۆش بم، بە پەنجەی چەند جارێك کێشای بە سنگمدا و بەدەورمدا خولایەوە کاتێك هاتەوە بەردەمم تووڕەتر لێمی دەڕوانی، چاوەکانی سوور ببوون. دەمارەکانی ناوچەوانی هەڵناوسان و ددانەکانی جیڕ دەکردەوە وەك ئەوەی بیەوێت هێرشم بکاتە سەر، لەترسا قاچەکانم کەوتنە لەرزین، پێش ئەوەی منیش زەردەیەك بە ڕوویدا بکەمەوە، ئەو وەستا. پاشان عەمار و ئەی کەی-یەکەی دایە دەستم کەمێك شڵەژام، بەزۆر کێشای بە سنگمدا بە دەستی لەرزۆکەوە لێم وەرگرت و سڵاوم لێکرد و گەڕامەوە جێی خۆم. چەکەکەم بەدەستەوە بوو، بەڵام دەترسام سەیری بکەم هەرگیز لەمەو پێش بۆ ئەو ماوە زۆرە چەکم بەدەستەوە نەبووە. تەنها چەکێك بۆ ماوەیەکی زۆر هەڵمگرتووە، ئەو چەکە بووە کە بە منداڵی یاریم پێدەکرد لە کێڵگەی

قاوه و بینا تەواونەکراوەکەی لای مالّی دایەگەورە، پاوو پاوو... هەرکەسێك یەکەم کەس بیوتایە ئەوکەسە براوە دەبوو.

وەکو ڕۆژانی تر مەشقمان دەستپێکرد، بەلاّم ئەمجارەیان بە چەکەوە ڕاماندەکرد و سنگەخشکێمان دەکرد. چەکەکان بۆ شێکو و جۆسیا قوورس بوون، کە بەردەوام دەیانخست و هەلّیان دەگرتەوە. ماوەیەکی کەممان هەبوو بۆ نانی نیوەڕۆ. ئەمجارەیان ناڕاستەمان گۆڕی و چالاکی ترمان ئەنجامدا، نیشانەمان لەچەند درەختێکی مۆز دەگرتەوە "وا بزانن ئەو درەختە ئەو پیاوانەن کە دایك و باوکی ئێوەیان کوشتووە، یان بەرپرسیارن لەو بارودۆخەی ئێوەی تیادان". عەریف هاواری کرد "بەم شێوەیە تۆلّەی خۆتان لەو کەسە دەکەنەوە کە وای بەسەرهێناون؟ ئێستا پیشانتان دەدەم بەچ شێوەیەك تۆلّە دەکەنەوە". پاشان چەکێکی هێنا و کەوتە هاوارکردن و فیشەك تەقاندن "یەکەمجار فیشەك دەنێم بە سکییەوە، پاشان ملی و لە کۆتاییدا دلّی. بیرتان بێت ئەوان خراپتریان بەسەر خێزانەکانتاندا هێناوە". پاشان بە چەقۆ کەوتە گەلاّکان بەهەموو هێزی خۆی چەقۆکەی بەناویدا دەگێڕا تا کەوت بە زەویدا "زۆر باشە..."، زەردەیەك گرتی ئەمجارەیان زیاتر لە جارەکانی تر درێژەی هەبوو، بەردەوام بووین لە مەشق. هەموو کات هەمان ڕستەی دووبارە دەکردەوە "وا بزانن ئەو درەختە، ئەو پیاوانەن کە دایك و باوکی ئێوەیان کوشتووە، یان بەرپرسیارن لەو بارودۆخەی ئێوەی تیادان". دوای نیوەڕۆ فێری ئەوە بووین چۆن فیشەك بخەینە چەکەکانمان و میل بهێنینەوە. ئێوارە فێری نیشانەگرتنەوە بووین. نیشانەمان لەو لەوحە تەختان دەگرتەوە کە بە درەختی ناو دارستانەکەدا هەلّواسرابوون. شێکو و

جۆسیا نەیاندەتوانی چەکەکانیان هەڵگرن، بۆیە عەریف ڕاگرێکی بەرزی بۆ دانان تا چیتر چەکەکانیان نەکەوێتە سەر زەوی. پاشان فێری ئەوە بووین چۆن پارچەی چەکەکانمان لە یەك بکەینەوە و ڕۆنیان لێ بدەین. (ئەی کەی)ەکان ئەوەندە کۆن بوون، زۆرجار نیشانەی هەڵەیان دەگرتەوە، یان هەر بەتەواوەتی لەکار دەکەوتن. شەو چووینەوە ناو خێمەکانمان شێکو و جۆسیا هەرزوو خۆیان دا بە زەویدا و بوورانەوە لەبری ئەوەی بەدەمخەوەوە پێبکەنن ئەمجارەیان دەیانووت "پاوو... پاوو... یەك دوو... یەك دوو" هەموو ئەوشتانەی ئەو ڕۆژە فێری ببووین. هەرچەندە هیلاك بووم، بەڵام خەوم نەدەهات، هەموو لەشم دەیەشا و دەنگی تفەنگ لە گوێمدا دەهات و دەچوو. بەدرێژای ڕۆژ کات نەبوو بۆ بیرکردنەوە، بەڵام ئێستا کاتێکی گونجاوە، بەڵێ، توورە بووم، ئەو یاخیبووانە بەرپرسیارن لەو ژیانەی منی تێکەوتووم، پاشان لە مێشکی خۆمدا چەند سیناریۆیەکم دروستکرد چۆن یاخیبووەکان دەستگیر دەکەم و لە خانوویەکیان دەنێم و گازۆلینیان پیادەکەم و دەیانسووتێنم، پاشان پێدەکەنم کاتێ ئەوان دەسووتێن و هاوار دەکەن.

دەنگی لانسانا (ئەو کوڕەی سێ خێمە خوار من دەژیا) زۆر سەرنجی ڕادەکێشام. هەموو شەو ئاوازی چەند گۆرانییەکی دەوتەوە کە هەرگیز بەرگوێم نەکەوتبوون، بەردەوام دەبوو تا خەوی لێدەکەوت، پاش خەوتنی هەموو گوندەکە، بێدەنگیی بەسەریدا زاڵ دەبوو.

# سیانزه

ڕەنگە ڕۆژی یەکشەممە بووبێت. بەیانییەکەی عەریف گادانی پێی وتین ئەو ڕۆژە بۆمان هەیە پشوو بدەین. دەسکی خەنجەرەکەی کێشا بە لەپی دەستیدا و وتی: "گەر دیندارن، مەبەستم ئەوەیە گەر مەسیحین، دەتوانن ئەمڕۆ بۆ خواپەرستی تەرخان بکەن، لەوە ناچێت چیتر کاتتان هەبێت". ئێمە چووینە گۆڕەپانەکە، شۆرتە سەربازییەکانمان لەپێ کرد لەگەڵ ئەو کالانەی پێماندرابوو. یاریی فووتبۆڵ دەستی پێکرد. ئەفسەر جاباتی هاتە دەرەوەی ماڵەکەی، هەمووومان وەستاین و سڵاومان لێکرد. "بەردەوام بن لە یاریکردن دەمەوێت سەربازەکانم ببینم چۆن یاریی دەکەن". پاشان دەستی کرد بە خوێندنەوەی جوولییەس قەیسەر. پاش ئەوەی تەواو بووین چووینە ناو ڕووبارەکە بۆ مەلەکردن. ڕۆژێکی هەتاو و خۆش بوو، ئەو کاتەی چوومە ڕووبارەکەوە هەستم دەکرد هەوا فێنکەکە نارەقەی جەستەم وشك دەکاتەوە. پاش چەند خولەکێك لە یاریکردن، هەمووومان بووین بە دوو تیم، ئەو تیمەی هەموو ئەندامەکانی گرووپەکەی تری دەستگیر بکردایە براوە دەبوو.

"سەربازەکان ئامادە بن بۆ ڕۆیشتن، کاتی پشوو کۆتایی هات". عەریف لە قەراغ ئاوەکەوە هاواری کرد. یارییەکەمان وەستاند و بەرەو ناو گوندەکە دوایکەوتین لەڕێگا بە ساتمەدانەوە دەڕۆیشتین و پاڵمان بەیەکەوە دەنا بۆ ناو دەوەنەکان. گەیشتینەوە ناو دێیەکە، عەریف فەرمانی کرد

چەکەکانمان پێکەوە بنێینەوە و پڕ فیشەکیان بکەین "زۆری فیشەك تێمەکەن با بتوانن ڕابکەن". چەکەکەم ئامادەکرد و پشتێنێکی پڕ فیشەکم لە کەمەرم بەست، سەرم هەڵبڕی چاوم کەوتە سەر دووسەرباز کە تەمەنیان لە من گەورەتر بوو، هەمان شتیان دەکرد دەستەکانم کەوتنە لەرزین و دڵم خێراتر لێی دەدا، زانیم ئەمجارە بۆ مەشقکردن نامانبەن. هەموو ئەوانەی تر خۆشییان دەبینی لەوەی دەیانکرد، واتێگەیشتبوون هەمان مەشقی ڕۆژانی تر ئەنجام دەدەین. جگە لە ئەلهاجی کە دەیزانی چی ڕوودەدات پاڵی بە دیواری بیناکەوە دابووەوە، چەکەکەی توند گرتبوو، هەروەك چۆن دایکێك کۆرپەکەی خۆی دەگرێت. پاش ئەوەی ئامادە بووین، عەریف ماوەیەکی کەم بەجێی هێشتبووین تا خۆی بگۆڕێت. گەڕایەوە و جلی سەربازیی لەبەردا بوو، پشتێنی پڕ فیشەك و تەقەمەنی بەستبوو کڵاوزرێکەی لەبن قۆڵی دانابوو. چەکی جی ٣ هەڵگرتبوو "هەستنە سەرپێ سەربازەکان"، هەموو بۆ پشکنین ڕیزمان بەست، پاشان پارچە پەڕۆیەکی سەوزی بەسەرماندا بەخشییەوە "ئەمە لەسەرتان ببەستن، هەرچیتان بینی ئەم پارچە پەڕۆیەی پێوە نەبوو، یان لەم کڵاوەی منی لەسەردا نەبوو تەقەی لێ بکەن"، دوو وشەی کۆتایی بە هاوارکردنەوە پێوتین. ئێستا ئاشکرایە بۆ مەشقکردن ناچین. ئەوکاتەی پەڕۆکانمان لە سەرمانەوە دەبەست، شێکۆ لە تەنیشت منەوە وەستابوو، ئەوەندەی تەقەمەنی هەڵگرتبوو بە پشتدا کەوت. عەریف هەندێ چەکی لێوەرگرت و هەڵیساندەوە سەرپێ، شێکۆش لێوەکانی کەوتبوونە لەرزین و ئارەقی دەردابوو، عەریف بەهێواشی دەستێکی بەسەریدا هێنا و بەردەوام بوو

"پیاوەکانی تر..."، ئاماژەی بۆ ئەو سەربازانە کرد کە لە ئێمە گەورەتر بوون "ئەوان فیشەك و تەقەمەنیتان بۆ هەڵدەگرن خۆتان مەشلەژێنن، چەند خولەکێکی تر بەرێ دەکەوین". عەریف بەجێی هێشتین. هەمووومان لەسەر زەوییەکە دانیشتین هەریەکەو بەرەو خەیاڵی خۆی دەڕۆیشت. گۆرانیوتنی ڕۆژانەی باڵندەکان کۆتایی پێهات و لەبری ئەوە دەنگی تەقەی ئەو سەربازانەی خۆیان بۆ جەنگ ئامادە دەکرد، ببووە جێگرەوەیان. شێکو و جۆسیا دڵیان پڕ ببوو، دەستم بەسەریاندا هێنا و پێم وتن هەموو شتێك باش دەبێت. چوومە لای ئەلهاجی و هاوڕێکانی ترم هەمووومان بڕیارمان دا گرنگ نییە چی ڕوودەدات، هەموو پێکەوە دەمێنینەوە. سەربازێك لەناو جانتایەك چەند پارچە حەبێکی هێنا و دای بە هەمووومان لەگەڵ پەرداخێك ئاو "ئەمە بەهێزترتان دەکات..."، بزەیەکی پڕنهێنی ڕووخساری تەنییەوە. کاتی ڕۆیشتن چەند سەربازێك پێشمان کەوتن، هەندێکیان کارتۆنی پڕتەقەمەنییان هەڵگرتبوو، هەندێکی تریان تاپڕ و (ئار. پی. جی)یان پێبوو. (ئەی کەی)یەکەم ڕوو لە زەوی هەڵگرت و قەمەی تفەنگم بەلای چەپمدا بەست، بەلای ڕاستیشم عەمار و فیشەکی زیادەم بەست. شێکو و جۆسییا سەری تفەنگەکانیان توند هەڵگرتبوو، وەکو ئەوەی هێشتا نەتوانن چەکەکانیان هەڵگرن. باڵایان لە چەکەکانیان کورتتر بوو. پێویست بوو بۆ ئێوارە بگەڕێینەوە، بۆیە خواردن و ئاومان لەگەڵ خۆمان نەبرد. جاباتی پێی وتین: "لە دارستانەکە جۆگەلە ئاوی زۆری لێیە"، پاشان جێی هێشتین تا عەریف درێژە بەقسەکانی بدات "تەقەمەنی زیاتر لەگەڵ خۆتان بێنن تەوە لە نان و ئاو بۆ ئێوە باشترە، چونکە بە تەقەمەنی

زۆرەوە نان و ئاو پەیادەکرێت، بەڵام بە نان و ئاوی زۆرەوە تا ئێوارە نـاژین"، کاتێ بەرێکراین دێنشینەکان لەبـەردەم ماڵـەکانیان سـەیریان دەکـردین، منداڵێك بە باوەشی دایکییەوە دەستی کرد بە گریان، گریانێك کە توانـای کۆنترۆڵکردنی نەبوو. گریانێکی وەها کە لەوە دەچوو بزانێـت چـیمان لـێ بەسەردێت.

ڕووناکی خۆریش وێنەی سێبەرەکانمانی لەسەر زەوی دەخشاند.

بەدرێژایی ژیانم ئەوەندە نەترساوم بچم بۆ جێیەك، تەنانەت لە جووڵەی مارمێلکەکانیش سڵم دەکردەوە. هەوایەك هەڵیکرد و شـاڵاوی کـردە سـەر مێشکم، لەتاوا ددانەکانم جیڕ دەکردەوە. فرمێسك لـە چـاوانمدا زەنگۆڵـەی بەست، زۆرم لەخۆم کرد بیانشارمەوە، چەکەکەم بەهەموو هێزی خۆم توند گرت تا کەمێك ئارام ببمەوە. بـۆ نـاو باوەشـی دارسـتانەکە بەرێکـەوتین، چەکەکانمان توند بە دەستمانەوە گرتبوو، وەك ئەوەی تەنها سەرچاوەی هێـز بن بۆمان. بە هێواشی هەناسەمان دەدایەوە نـەوەك دەنگـی هەناسـەکانمان بەرەو مەرگمان ڕاپێچکەن. ئەفسەر جابـاتی سەرپەرشـتی ڕیزەکـەی مـنی دەکرد دەستی بەرزکردەوە و هەموومان وەستاین. دەستی بەهێواشی هێنایە خوارەوە لەسەر یەك قاچ وەسـتاین و چـاومان بـە دارسـتانەکەدا دەگێـڕا، دەمویست ئاوڕبدەمەوە تا ڕووخسـاری هاوڕێکـانم ببیـنم، بـەڵام نـەمتوانی. بەخێرایی دەوەنەکەمان جێهێشت تا گەیشتینە قـەراغ زەلکاوێـك لەسـەر سنگ خۆمان دا بە زەویدا، نیشانەمان گرتەوە، جۆسیا لە تەنیشت منـەوە بوو، پاشان شێکو لەملاشمەوە سـەربازێکی لـە ئێمـە گـەورەتر و جومـا و مووسـا. ویسـتم سـەیریانکەم، بـەڵام سـەرقاڵی نیشـانەگرتنەوە بـوون.

هەرچەندە نەدەگریام، بەڵام فرمێسك بە ڕوومەتەکانمدا دەهاتە خوارەوە و گوێچکەکانم گەرم داهاتن. دەمارەکانی قۆڵم دەرپەڕین هەستم بە پرتەیان دەکرد، وەك ئەوەی بە ئارەزووی خۆیان هەناسەبدەن.

هەموومان وەکو ڕاوچی چاوەڕوان بووین هەموو پەنجەمان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکە بوو، بێدەنگییەکەش تا دەهات زیاتر ئازاری دەدام. یاخیبووەکان نزیکبوونەوە و درەختەکانی زەلکاوەکە جوڵانەوە، هێشتا کەس دیار نەبوو، بەڵام فەرمانەکەی جاباتی وەك ئەوەی پەلەپیتکە لە پولی دۆمینە بدرێت و هەموو پولەکانی تر بەدوایدا بکەوێت، ئاوا فەرمانەکەی بە ڕیز گەیشتە لای من "هەرکاتێ فەرمانم کرد تەقە بکەن"، پاش کەمێك چەند یاخیبوویەك بە جلی مەدەنییەوە دەرکەوتن بە دەست ئاماژەیان کرد چەند کوڕێکی تر هاتنە ڕیزەوە. تەمەنیان پێدەچوو وەك ئێمە بن چەند پلانێکی ستراتیجییان دارشت. ئەفسەر فەرمانی کرد چەند (ئار پی جی)یەك بتەقێنرێت، بەڵام فەرماندەری یاخیبووەکان گوێی لێبوو "بگەڕێنەوە..."، دەستبەجێ فەرمانی کرد. هەموویان گەڕانەوە ئەو نارنجۆکەی هەڵمان دا، لاشەی ژمارەیەکی کەمی یاخیبووی بە ئاسماندا هەڵدا و بە پارچەکراوی کەوتنەوە سەر زەوی. لە هەردوولا بوو بە تەقە. هێشتا چەکەکەم ئاڕاستەی بەردەمم کردبوو، نەمدەتوانی تەقە بکەم، پەنجەم وشك ببوو، وام هەست دەکرد ئەو ناوچەیە سەروخوار بووەتەوە و خەریکە دەکەومە خوارەوە، توند دەستم بە درەختێکەوە گرت، هەموو ئەوەی گوێم لێبوو خەڵکی بوو کە لەبەر ئازار هاواریان دەکرد و گیانیان دەسپارد. خوێن بە دەموچاومدا پرژەی کرد، دەمم کردەوە، تامی خوێنم

کرد، دەستبەجێ تفم کردەوە و دەموچاوم سڕی، چاوم کەوتە سەر ئەو سەربازەی لە خوێندا گەوزابوو، تەنانەت لە کوونی (ئەی کەی)یەکەشی خوێن دەهاتە دەرەوە، هێشتا چەکەکەی بەدەستەوە بوو. هاواری جۆسیا هەموو گیانمی وشك کرد دەگریا و داوای دایکی دەکرد هەستم دەکرد مێشکم تەنها یەك دەزوولەی پێوە ماوە و هەر زوو لەسەرم جیادەبێتەوە. تیشکی خۆر سێبەری بۆ لوولەی تفەنگەکان و فیشەکەکان دروست دەکرد. لاشەکان لە نزیك درەختێکی کورتی دارخورما لەسەر یەکتر کەڵەکە ببوون، گەڵاکان لە خوێندا نقووم ببوون، بەدوای جۆسیادا دەگەڕام، بەڵام (ئار پی جی) بەر لەشە بچکۆلانەکەی کەوتبوو لەبن دارێکدا خستبووی بە هێواشی قاچەکانی دەجوڵاند و گریانەکەی بەرەو کۆتایی چوو. خوێن هەموو ئەو ناوەی پڕکردبوو، پێدەچوو فیشەك لە هەموو گۆشەیەکی دارستانەکەوە بکەوێتە خوارەوە. چوومە لای و سەرنجی چاوەکانیم دا، کە پڕ فرمێسك بوون، لێوەکانی دەلەرزین، بەرەو لای من خۆی خشاند، ویستی دەست بگرێت بە شانمەوە و هەستێتە سەرپێ، لەناکاو لەجوولە کەوت. ئەوکات هەستم بە دەنگی فیشەکەکان نەدەکرد، پێدەچوو دڵیشم لەکار کەوتبێت، جیهان لە جوولە وەستابێت. بەدەست چاوەکانیم داخستن. هەڵمگرت، هەستم کرد ئێسقانەکانی پشتی تێکشکاون، یەکێك لە دراوە قاچەکانمی ڕاکێشا، جۆسیام لەسەر پشت دانایەوە، ئاوڕم دایەوە عەریف بوو، چەند وشەیەکی وت باش تێیان نەگەیشتم، لێوەکانی دەجوڵاند و زۆر ترساو دیاربوو. "دانیشە و تەقە بکە..."، گەڕایەوە شوێنی خۆی. چاوم بە مووسا کەوت، سەری خوێنی پێوە بوو، خێرا گەڕامەوە نزیك زەلکاوەکە.

میلم هێنایەوە و پیاوێکم کوشت. هەر کاتێک بیم لە دوو هاورێ مردووەکەم دەکردەوە، زیاتر و زیاتر تووڕەی دەکردم، میلم دەهێنایەوە و پیاوی زیاترم دەکوشت. هەرچییەک لە بەردەمم بجولایە تەقەم لێدەکرد، پاشان فەرمان کرا بگەڕێینەوە تا ستراتیجییەکی تر بەکاربهێنین.

چەك و تەقەمەنی هاورێ مردووەکانمان برد و هەر لە دارستانەکە جێمانهێشت، ئەو دارستانەی کە ژیانێکی تایبەت بە خۆی تیابوو، ئەو دارستانەی رۆحی مردووەکانی بەرەو لای خۆی ڕاپێچ دەکرد. درەختەکان وا دەردەکەوتن سوجدە بەرن و نوێژ بکەن. خۆمان نزمکردەوە و چووینە لایەکی تری دارستانەکە، چەند مەترێك لە شوێنی یەکەمجارمان دووربوو. دووبارە چاوەڕێ بووین ئێوارەیەکی درەنگ بوو، یەکێك لە سیسرکەکان دەستی بە گۆرانیوتن کرد، بەڵام هاورێکانی ئامادە نەبوون بەشداری بکەن، بۆیە ئەویش بەناچاریی بێدەنگ بوو تا شەو دابێت. لە تەنیشت عەریف گادانی بووم چاوەکانی سوورتر لە جاران دەردەکەوتن، دەنگی چەند کەسێك هات بەناو گەڵای وشکەوەبوودا نزیك دەبوونەوە، دەستبەجێ میلمان هێنایەوە و خۆمان ئامادەکرد.

ژمارەیەك کوڕی گەنج و چەکدار لەپشتی درەختەکانەوە خۆیان نزمکردبووەوە و بە هێواشی هەنگاویان دەنا. دەستبەجێ دەست بە تەقە کرا، ئەوانەی لە ڕیزی پێشەوە بوون، کوژران و ئەوانەی ڕیزی دواوە بەرەو زەلکاوەکە کشانەوە، هەر لەوێدا کوشتمانن. لاشەکانمان کەڵەکە کرد و چەك و تەقەمەنییەکانمان بۆ خۆمان هەڵگرت. چیتر لەم لاشە مردووانە نەدەترسام شەقم تێهەڵدەدان و هەڵم دەگێڕانەوە و بە چاوی ڕقەوە لێیانم

دەڕوانــی. ژمارەیـەکی زۆر (جـی ۳) و تەقەمــەنی و دەمانچـەی دەسـتیم دۆزییەوە، عەریف بۆ خۆی هەڵگرتن. سەرنجم دا یاخیبووەکان زێڕ و خشڵی زۆریان پێوە بوو. یەکێك لە کوڕەکان کە ئێستا لە خوێندا گـەوزاوە، پێـنج کاژێری ئاڵتوونی لەدەستدا بوو لەگەڵ تیشێرتێکی توپاك شـاکوور* کـە لەسەری نووسرابوو "هەموو نیگاکان لەسەر منن". هەندێك لە سـەربازە بەتەمەن گەورەکانمان لەدەسـت دا. لـە هاوڕێکانیشـم مووسـا و جۆسـیا. مووسا کە هەمیشە چیرۆکی دەگێڕایەوە لەو ڕۆژەوە چیتر چیرۆك نـەبوو تـا گوێی لێگرین و بماخاتە پێکەنین. جۆسـیا... ئەگـەر یەکـەم ڕۆژی مەشـق بمهێشتایە زیاتر بخەوتایە، ئێستا لە ڕیزی پێشەوە نەدەبوو.

شـەو داهــات و گەڕاینـــەوە نــاو دێیەکــە. هــەموومان بــە دیــواری جبەخانەکەوە پاڵماندابووەوە، چەکەکانمان و ئەوانەی تریش کە هێنابوومان پاکمان دەکردنەوە، بۆ تاقیکردنەوە چەند فیشەکێکمان بە ئاسماندا تەقانـد و هەموومان گەڕاینەوە ناو خێمەکان. جگە لە کـەمێك نـاو هیچـی تـرم نەخوارد و نەخواردەوە. سەرنجی ئەژنۆم دا خوێنی لێدەهات، بەڵام گوێم پـێ نەدا. لەسەر پشت پاڵکەوتم (ئەی کەی)یەکەم لەسەر سنگم دانـا و جـی ۳یەکەم لە تەنیشتمەوە. چاوم بڕییە سوچێك تا خەوم لێکەوت. ئەو شـەوە لە خـەوما جۆسـیام لـەبن دار کـە هەڵگرتـەوە، کـاتێ ئاوڕمـان دایـەوە یاخیبوویەك تفەنگەکەی ئاڕاستەی ناوچەوانم کرد و تەقـەی لێکـردم. لـە خەو ڕاپەڕیم و بە هەموو چواردەوری خۆمدا تەقـەم کـرد تـا فیشـەك لـە عەمارەکەدا نەما. عەریف گادافی و ئەفسەر جاباتی بەپەلە هاتنە ژوورەوە

---

*گۆرانیبێژێکی (ڕاپ)ی بەڕەگەز ئەفریقی-ئەمریکی بوو.

و بردیانمه دەرەوە، کەمێك ئاویان بە دەموچاومدا کـرد و حـەبێکی تریـان دامێ. لەو هەفتەیەدا دوو جاری تـر بـۆ جـەنگ بـراین. لـەو دوو جـارەدا کێشەم نەبوو لە کوشتنی هەرکەسێك.

# چوارده

تا زیار خۆم بە کاروباری سەربازییەوە خەریك بکردایە، ئازاری سەرم کەمتر دەبووەوە. بەڕۆژ لەبری یاریکردن، بە گوندەکەدا پیاسەم دەکرد و ماریجوانا و کۆکاین تێکەڵ بە بارووتم دەکێشا و براون براونم هەڵدەمژی. ئەم جۆرە شتانە هەمیشە لەسەر مێزەکانمان هەبوون. بێگومان ئەو حەبە سپییەی لە یەکەم ڕۆژی جەنگەوە پێماندرا، پێوەی ئالوودە ببووم. هێزی زیاتری پێدەبەخشیم. سەرەتا کە ئەم دەرمانانەم پێکەوە بەکارهێنا، پلەی گەرمی لەشم بەرز بووەوە، جلەکانم داکەند. هەستی بیستنم بۆ چەند خولەکێك لەدەست دا. چاوەکانم لێڵ دەیانبینی، بەڵام پاش ماوەیەك ڕاهاتم ئەوەی هەستم پێدەکرد وزەیەکی زۆر بوو کە بۆ ماوەی هەفتەیەك بێ خەوتن دەیهێشتمەوە. شەوان بە دینەمۆ، یان باتری ئۆتۆمبێلەکان سەیری فیلمی جەنگمان دەکرد، وەك: ڕامبۆ، فێست بلەد، بەشی دووەمی ڕامبۆ، کۆماندۆ... هتد. دەمانویست هەرچی زووترە شەڕ دەست پێ بکات تا ئەو تەکنیکانەی لە ڕامبۆوە فێری بووین بەکاریان بێنین. هەرکات خواردن و تەقەمەنی، یان گازۆلینمان لێببڕایە، هەڵمان دەکوتایە سەر خێمەی یاخیبووەکان لە شارۆچکە و گوند و ناو دارستانەکان. یان چەند گوندێك کە هاوڵاتی مەدەنی تیا دەژیان، تا خەلکی زیاتر بێنینە ڕیزی سوپاوە، چیمان بەردەستکەوتایە، دەمانبرد. ئەفسەر هاواری دەکرد "هەواڵی باشمان پێگەیشتووە لەلایەن سیخوورەکانمان. پاش پێنج دەقەی تر بەڕێدەکەوین و

هێرش دەکەینە سەرخێمەی چەند یاخیبوویەك، کە چەکی باشیان پێیە، لەڕاستیدا چەکی خۆمانە". ڕووخساری پڕ لە تەوس و متمانە دەردەکەوت پاشان بزەیەکی دەکرد پێش ئەوەی وتەکانی تەواو بکات. جلەکانمان لەبەرکرد و پەڕۆ سەوزەکانمان لەسەرمان دەبەست تا لە یاخیبووەکان جیامانکاتەوە. بێ نەخشە و بێ زانیاری بەڕێ دەکەوتین، تەنها ئەوەمان دەکرد کە فەرمانمان پێدەکرا. جارجار لە نیوەی ڕێگا بۆ بەکارهێنانی حەبەکانمان و هەڵمژینی کۆکاین و براون پشوومان دەدا. هەموو ئەوانە زیاتر و زیاتر توندوتیژیان دەکردین و هێزی زیاتریان پێدەبەخشین. ئێستا بیرۆکەی مردن بۆ ساتێك بە مێشکمدا نایەت. کووشتن وەك ئاو خوارنەوەی لێهاتووە بێ ئەوەی هەست بە تاوان بکەم. دوای بەکارهێنانی دەرمانەکان، گەورەکان پشوویان دەدا و ئێمە پارێزگاریمان لێدەکردن. من و ئەلهاجی پێکەوە پۆستێکمان پێدرابوو، زۆربەی جار کاتمان ڕادەگرت تا بزانین کاممان زووتر عەمارەکان دەردەهێنین و پاشان دەیاخەینەوە ناو چەکەکان.

ئەلهاجی بە زەردەخەنەیەك کە وا دەردەکەوت زۆری دڵ بەم پلانە تازەیەی خۆش بێت، پێی وتم:

-"ڕۆژێك وەکو ڕامبۆ بە تەنها دەست بەسەر هەموو گوندەکاندا دەگرم".

-"منیش وەکو کۆماندەر حەز دەکەم چەند بازووکەیەکی تایبەت بەخۆمم هەبێت"، هەردووکمان دەستمان کرد بە پێکەنین.

پێش ئەوەی بگەینە خێمەکان، ئاڕاستەمان دەگۆڕی و بەناو دارستانەکەدا دەڕۆیشتین. هەرکات خێمەکەمان بەرچاوکەوتایە، دەورمان

دەگرت و چاوەڕوانی ئەفسەر دەبووین تا فەرمان دەرکات. یاخیبووەکان بێ ئەوەی ئاگایان لە هیچ بێت پاڵیان بەدیوارەکانەوە دەدایەوە سەرخەویان دەشکان. کوڕە گەنجەکانیش کە بۆ پارێزگاریکردن دانرابوون ماریجوانایان بە یەکتر دەدا.

هەرکاتێك دەمبینین زیاتر تووڕە دەبووم، لەو یاخیبووانە دەچوون کە یاریی کارتیان دەکرد لەو گوندەی من خێزانەکەمم تێیدا لەدەست دا. هەرکات ئەفسەر فەرمانی دەرکردایە، بەهەموو توانای خۆم تەقەم دەکرد هێشتا دڵم ئاوی نەدەخواردەوە. پاش تەقەکردن دەچووینە ناو خێمەکان ئەوانەی برینداربوونایە دەمانکوشتن. هەموو کەلوپەلەکانیان لە گازۆلین و ماریجوانا و کۆکاین، خواردەمەنی خوێ، شەکر، گاری و ماسی... پاشان خشڵ و کاژێرەکانیان چەند شتێکی تریش، دەمانبردن. پاشان مەدەنییەکانمان لە پیاو و ژن و کچە گەنجەکان کە لە خێمەکاندا خۆیان شاردبووەوە، هەموو کەلوپەلەکانمان پێهەڵدەگرتن پێش خۆمانمان دەخستن. ڕۆژێکی تر ژمارەیەکی زۆر یاخیبوومان دەستگیرکرد، جلەکانیانمان داکەندن و توند بەستماننەوە تا لەشیان وەك و دەهۆڵ ڕەق بوو. عەریف پرسیاری لە یەکێك لە گیراوەکان کرد "ئەم هەموو تەقەمەنیانەتان لەکوێوە دەستکەوتووە؟" پیاوەکە کە ڕیشێکی داچەقاوی هەبوو تفێکی بە ناوچەوانی عەریفدا کرد. ئەویش دەستبەجێ لە نزیکەوە فیشەکێکی بەسەرییەوە ناو پیاوەکە کەوت بەزەویدا و خوێن جۆگەلەی بەست. هەمووومان دەستمان کرد بە هووتاف کێشان و دەستخۆشی لە عەریف و سڵاوی سەربازیمان لێکرد. لەناکاو یاخیبوویەك کە لەپشت درەختەکان

خۆی حەشاردابوو، چەند فیشەکێکی بە سەر و سکی لانساناوە نا و کوشتی. خێرا بڵاوەمان کرد بەناو گوندەکەدا و یاخیبووکەمان دەستگیرکرد. جاباتی بە خەنجەرەکەی ملی پەڕاند، دووبارە دەستمان بە هاواری خۆشی کرد و دەستخۆشیمان لێ کرد. جاباتی سەیری گیراوەکانی تری کرد و پێی وتین: "هەرکەسێك کاری ئەنتیکەی کرد، دەستبەجێ بیکووژن".

زەل و قامیشی سەر خێمەکانمان گرتێبەردان. ئەوانیش بەشێوەیەکی وا بەملاولادا دەجولانەوە، وەك ئەوەی شیوەن بکەن و بلاوێنەوە. گیراوەکانمان پێش خۆمان دا.

جاباتی هەموو گیراوەکانی کۆکردەوە، کە هەموویان مەدەنی بوون "ئێمە لێرەین بۆ پارێزگاریکردن لە ئێوە. کارەکانمان تا ڕادەیەك جدین و سەربازی وامان لەبەردەستدایە کە ئامادەن هەموو شتێك بکەن بۆ ولاتەکەیان. ئێمە وەکو یاخیبووەکان نین. ئەو بێنرخانە کە خەلکی بەبێ هۆ دەکوژن. ئێمە لەپێناو ولاتەکەمان هەموویان لەناو دەبەین. ئێوەش ڕێزی ئەم پیاوانە بگرن"، ئاماژەی بۆ ئێمە کرد "خزمەتیان بکەن". پاشان بەردەوام بوو، قسەکانی تێکەڵەیەك بوو لە باوەڕپێهێنانی خەڵکەکە، کە ئەو کارانەی ئێمە دەیانکەین ڕاست و ڕەوانن، لە لایەکی تریشەوە پیاهەڵدان بوو بە پیاوەکانی. من لەناویاندا وەستابووم چەکەکەم بەدەستەوە بوو، هەستم دەکرد کەسێکی تا ڕادەیەك گەورە و بەنرخم، لەبەر ئەوەی لە کەس سڵناکەمەوە و لە دەست کەسیش ڕاناکەم. ئێستا چەکم لەدەستدایە وەك گادافی دەیوت: "ئەم چەکەی لەبەردەستاندایە، سەرچاوەی

هێزە بۆ ئێوە لە هەموو شتێك دەتانپارێزێت و هەرچیتان بوێت بۆتان دابین دەكات، بەمەرجێ بزانن چۆن بەكاریدەهێنن". نەمدەزانی هۆی ئەم دانووستانەی جاباتی چییە، تازە هەموو شت تەواو بووە و چیتر پێویست بە ڕوونكردنەوە ناكات. بڕێ جار لە نیوەی سەیركردنی فیلمدا بەزەو جەنگ دەبراین، پاش چەند كاژێرێك لە كوشتنی چەندین كەس دەهاتینەوە و درێژەمان بە فیلمەكە دەدا، وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت و تەنها پشوویەكمان دابێت. هیچ كاتێك نەبوو بەتەنیا بین تا بیر بكەینەوە، یان لە جەنگ بووین، یان دەرمانی بێهۆشكەرمان بەكاردەهێنا، یان سەیری فیلمی جەنگمان دەكرد. ئەو كاتانەی پێكەوە قسەمان دەكرد بابەتەكانمان بریتی بوون لە بابەتی جەنگ و كووشتن. یان سەرسامی خۆمان دەردەبڕی كە چۆن جاباتی، یان گادافی، یان كەسێكی تر پیاوێكی كووشتووە. ئیتر جگە لەمانە هیچ شتێكی تر لە واقیعی ژیانمان بوونی نەبوو.

بۆ ڕۆژی دواتر. پێنج دەستگیركرا و هەبوون كە پێویست بوو بكوژرێن. ژمارەی دەستگیركراوەكان كەم بوون و ئەوانەی دانرابوون بۆ مەشق زۆرتر بوون، لەبەر ئەوە جاباتی كانیێ و سێ كوڕی تر و منی هەڵبژارد. دەستگیراكراوەكان بەسترابوونەوە و ڕیز كرابوون. جاباتی فەرمانی كرد كە قورگی هەریەكەیان هەڵدڕین. هەر دەستگیركراوێك زووتر مرد، ئەو كەسە براوە دەبێت. هەروەها پێویست بوو چاو ببڕینە دەستگیركراوەكە تا گیانی دەردەچێت. هەر زوو چاوم بڕییە ئەو پیاوەی لەبەردەمدا بوو. ئەوەندەی لێدرابوو، هەموو دەموچاوی شین هەڵگەڕابوو. چاوەكانی وادەردەكەوتن سەیری شتێك بكەن لە دوامەوە، شەویلگەكانی تەنها بەش بوون لە

ڕووخسارێدا کە سامناک دەردەکەوتن، جگە لەوە هەموو بەشەکانی تری ڕووخساری بێهەست و هێمن بوون.

هیچ هەستێکم نەبوو بەرامبەری. بیرم نەدەکردەوە چی دەکەم، تەنها چاوەڕێی فەرمانی عەریف بووم. ئەم دەستگیرکراوەش یاخیبوویەکە کە خێزانەکەمی لەناوبردووە. عەریف فیشەکێکی بە ئاسماندا تەقاند و دەستبەجێ سەریم توند گرت و خەنجەرەکەم بە شێوەیەکی ناجێگیر، بە ملیدا هێنا. قورتمی بەتایبەت بۆ چەقۆی تیژ دروستکرابوو. خەنجەرەکەم بە زیگزاکی بە ملیدا هێنا، دواجار چاوەکانی بە نیگایەکی ترسناک کەوتنە سەرم و خۆی دایە دەستم دوا هەناسەی دەرچوو، منیش دام بە زەویدا و خەنجەرەکەشم هەر بەخۆی سڕی. دەستبەجێ بە عەریفم ڕاگەیاند کە کاتی ڕاگرتبوو. کوڕەکانی تر هێشتا هەر خەریک بوون. هەندێ لە گیراوەکان زیندوون و هەندێکی تریان هەموو لەشیان دەلەرزی. لە کۆتاییدا من براوە بووم. کانییێ دووەم بوو. کوڕەکانی تر چەپڵەیان لێدا و دەستخۆشییان لێکردم. پاشان پلەی جێگری جاباتیم پێ بەخشرا و کانییێ جێگری گادافی. ئەو ڕۆژە بە دەرمانی زیاتر و فیلمی زیاتر ئاهەنگمان گێڕا.

خێمەیەکی تایبەت بە خۆمم هەبوو، کە هەرگیز تیایدا نەدەخەوتم، چونکە خەو بۆ من نەبوو. زۆرجار لە نیوەی شەودا شنەی با دەنگی لانساناى دەهێنایە بەرگوێم وەک ئەوەی درەختەکان بە چرپە ئاوازەکانی ئەو بڵێنەوە. بۆ ماوەیەک گوێم ڕادەگرت و بە چەند فیشەکێک ڕاوەدوویم دەنا.

# پانزە

ئەو گوندانەی داگیرمانکردبوون، هەموویان دواتر دەبوونە بارەگای خۆمان. لەهەر جێیەك بخەوتینایە، ئەو جێگەیە دەبوو بە ماڵی من. ئەندامانی سوپا خێزانی من بوون. چەکەکەم پارێزەرم بوو. ئامادەی دەکردم بۆ ناکاوی دوارۆژ. ئەو یاسایەی پەیڕەوم دەکرد، بریتی بوو لە "بکوژە، یان دەکوژرێیت". ئیتر جگە لەمانە مێشکم بەلای هیچ نەدەرۆیشت. دوو ساڵی ڕەبەق سەرقاڵی کوشتن و جەنگ بووین. کوشتن ببوو بە پیشەی ڕۆژانە. چیتر بەزەیم بۆ کەس نەبوو. دڵم بەستبووی بێ ئەوەی ئاگام لێبێت منداڵی خۆمم لەدەست دابوو. ڕۆژ و شەوم بە خۆر و مانگدا جیادەکردەوە، بەلام هەرگیز نەمدەزانی یەکشەممەیە، یان هەینییە. لە مێشکی خۆمدا وام لێکدەدایەوە ژیانم زۆر ئاسایییە. چەند هەفتەیەك لە کۆتایی مانگی جانیوەری ساڵی ١٩٩٦ هەموو شتێك گۆڕا. ئەو کات تەمەنم ١٥ ساڵان بوو.

بەیانییەکیان لەگەڵ بیست سەرباز بەرێکەوتین بۆ (باوییە) تا چەك و تەقەمەنی بێنین. ئەو شارۆچکەیەی لە باشووری ناوچەکە بوو نزیکەی ڕۆژێکی بەپێ دەویست بۆ گەیشتن. ئەلهاجی و کانییێ لەگەڵم بوون. زۆر خۆشحاڵ بووین، چونکە جووما لەوێ نیشتەجێ کرابوو. هەموو چاوەڕوانی جووما بووین تا چیرۆکی جەنگەکانمان بۆ بگێڕێتەوە و بزانین چەند کەسی

کووشتووە. بە پەرۆش بووم بۆ بینینی جاباتی، بە هیـوای ئـەوەی کـەمێك باسی شکسپیر بکەین.

لە رێگا خۆڵاوییەکە بە دوو ریز بەرێکەوتین، بە چاوەکانمان کـە وەکـو خوێن سوور دەچووەوە، سەیری ناو دەوەنەکەمان دەکرد. پـێش خۆرئـاوابوون گەیشـتینە دەوروپشـتی (باوییـە). لـە دەوەنەکانـدا چـاوەڕێمان کـرد تـا فەرماندەر چووە ناو شارۆچکەکە، نـەوەك هاورێکـانی خۆمـان بـە هەڵـە تەقەمان لێ بکەن. لەبن درەختەکان دانیشتین و سـەرنجی رێگاکـەمان دا، فەرماندەر پاش چـەند دەقەیـەك گەڕایـەوە و فـەرمانی کـرد بچـینە نـاو شارۆچکەکە. چەکەکەم خسـتە سـەر شـانم و لەگـەڵ کـانییێ و ئـەلهاجی چووینە ناو بارەگاکەیان. خانووە چیمەنتۆکانی ئـەو شارۆچـکەیە گـەورەتر بوون لەو خانووانەی لە گوندەکانی تـر بینیبـووم. هـەموو ڕووخسـارەکان نامۆ دەردەکەوتن. بەناو شارۆچکەکەدا سڵاومان لە سەربازەکانی تر دەکرد و سوپاسی خۆمانمـان ئاڕاسـتە دەکـردن. دواجـار جوومامـان لـە داڵانـی خانوویەکی لە چـیمەنتۆ دروسـتکراوا بەرچـاوکەوت لەسـەر جۆلانەیـەك دانیشتبوو، ڕووی کردبووە دارستانەکە. ڕەشاشێکی نیـو ئۆتۆمـاتیکی لـە تەنیشت خۆیەوە دانابوو. دیاربوو لە خـەیاڵ و بیرکردنـەوەدا ون ببـوو. بـە هێواشی لەپشتەوە ڕۆیشتینە لای تا بیترسێنین، بەڵام هـەر زوو گـوێی لـە دەنگی پێیەکانمان بوو و دەسـتبەجێ ئـاوڕی دایـەوە. دەموچـاوی گـەورەتر دیاربوو چی تر لەکاتی قسەکردندا سەری نەدەلەقانـد. تەوقـەمان کـرد و دەوروخولی چەکەکەیمان دا.

بـە جوومامـــان وت، پـــاش چـــەند دەقەیـــەكی تـــر دەگەڕێینـــەوە و لای دادەنیشین. جانتاكانمان پڕ تەقەمەنی و خواردن كرد و بـۆ كـاتی گەڕانـەوە ئامادەمان كردن. لە جبەخانەكە، فەرماندەر پێی وتین، جاباتی فـەرمانی كردووە ئەو شەوە بمێنینەوە، نانی ئێوارەش ئامادەیـە. مـن برسـیم نـەبوو كانیێ و ئەلهاجی چوون بۆ نانی ئێـوارە و منـیش گەڕامـەوە لای جوومـا. ماوەیەك بەبێ دەنگـی دانیشـتین جوومـا پێـی وتم: "بـەیانی زوو هێـرش دەكەین. لەوە ناچێت بتبینم". پەنجەكانی بە چەكەكەیدا هێنـا و بـەردەوام بوو "لە هێرشی پێشوومـاندا خاوەنی ئەم ڕەشاشەم كوشـت. ئـەو زۆری لـە ئێمە كوشت پێش ئەوەی بیكوژم، پاشان چەكەكەی كەوتـە دەسـت مـن و خۆشم چەندین كەتنم ناوەتەوە پێـی"، لـە بـەر خۆیـەوە دەسـتی كـرد بـە پێكەنین. دەستخۆشیمان لەیەكتر كرد و دەستمان كرد بە پێكـەنین. پاشـان فـەرمانمان پێكـرا لـە مەیـدانی سـەنتەری شارۆچـكەكە كۆببینـەوە. مەراسیمێك بوو بۆ زیاتر یەكتر ناسینی فەرماندەرەكان، جووما چەكەكەی هەڵگرت و دەستی لە ملم كرد، هەردووكمان بەرەو مەیدانەكـە ڕۆیشـتین. لەوێ كانیێ و ئەلهاجی ئامادە بوون و جگەرەیان دەكێشا. جاباتیش لـەوێ بوو. ئەوشەوە بەكەیف و ڕووخۆش دەردەكەوت. زۆربەی هاوەڵـەكانی وەك و چاوەش مانسەرایی و عەریف گادافی لەدەست دابوو، بەڵام ئەو وا ڕاهاتبوو نەهێڵێت دەرروبەری كاری تێبكەن، هەروەها فێری ئەوە ببوو پیاوی زیندوو و ئازا و بەجەرگ بكاتە جێگرەوەی مردووەكان. دەمویست لەگـەڵ جابـاتی كەمێك لەبارەی شكسپیرەوە بدوێم، بەڵام ئەو سەرقاڵی میوانـەكانی بـوو، تەوقەی لەگەڵیان دەكـرد و بـەخێرهاتنی دەكـردن. دواجـار لەبـەر دەمـدا

ڕاوەستا و توند دەستی گرتم و وتی: "ماکبیس هەرگیز بەرەنگاری کەس نابێت تا بیرنام ودی گەورە و دوونسینانین بەرامبەری دەوەستنەوە"، سەری بۆ من دانەواند "ئێستا ئێرە بۆ تۆ چۆڵ دەکەم ئەی پیاوی بەڕێز"، لەبەردەمدا کڕنووشی برد دەستەکانی دەجوڵاند و خواحافیزی لێکردم. هەموومان دەستمان کرد بە ئاهەنگ گێڕان و چەکەکانمان بەرزکردەوە. پاش ئەوەی جاباتی ڕۆیشت، دەستمان کرد بە وتنی سروودی نیشتمانی "بە بەرزییەوە پیاتا هەڵدەدەین... ئەی وڵاتی ئازادی ئەو خۆشەویستییە گەورەیەی بەرامبەرت هەمانە..."، بە مۆسیقای ڕەوتی سەربازی و جگەرەکێشان و کۆکاین و ئەو شەوەمان بەسەربرد، تا بەیانی قسەمان دەکرد بەزۆری باس لە باشی دەرمانە بێهۆشکەرەکانمان دەکرد. پێش بەرەبەیان جووما بۆ هێرشەکەی بەڕێکەوت. تەوقەمان لەگەڵ کرد و پەیمانمان دا جاری داهاتوو کاتی زیاتر بەیەکەوە بەسەربەرین. جووما زەردەیەکی کرد و چەکەکەی توند گرت و بەرەو تاریکاییەکە ڕایکرد و لەپێش چاو ون بوو.

****

پاش چەند کاتژێرێك لۆرییەك هاتە گوندەکەوە چوار پیاو کە پانتۆڵی کاوبۆی پاکیان پۆشیبوو، لەگەڵ تیشێرتی سپی بە پیتی گەورەی شین نووسرابوو (یونیسێف). یەکێکیان پیاوێکی سپی پێست بوو. ئەوی تریان بەهەمان شێوە ڕەنگی پێستی کاڵ بوو، پێدەچوو لوبنانی بێت. دووانەکەی تریان خەڵکی ناوخۆ بوون. یەکێکیان نیشانەی خێڵەکی بە

ڕوومەتەکانییەوە دەبینرا، ئەوی تریان نیشانەیەک بەدەستییەوە بوو هەمان نیشانە بوو کە بابەگەورەم لەسەر دەستم کێشابووی تا مار پێوەم نەدات. هەردوو پیاوەکەش زۆر پاك دەرەکەوتن لەوە نەدەچوو بەشداری شەڕیان کردبێت. هەموویان بەرەو ژوورەکەی جاباتی بران ڕۆیشتن، وادیاربوو جاباتی پێشبینی سەردانەکەیانی کردبوو. هەموویان لە دالآنەکە دانیشتن سەربازێکیش چاودێریی دانووستانەکەی دەکرد، لەبن درەختێکی مانگۆ دانیشتین و چەکەکانمان پاك دەکردەوە، سەیرمان دەکردن. لە کۆتاییدا جاباتی تەوقەی لەگەڵ دوو پیاوە بێگانەکە کرد و ئەو سەربازەی بانگ کرد کە بۆ چاودێریی دانوستانەکە نیشتەجێ کرابوو. پاش کەمێك سەربازەکە گەڕایەوە و پێی وتین: ڕیز ببین، پاشان بەناو شارۆچکەکەدا گەڕا و کوڕەکانی تری کۆکردەوە "ئەمە فەرمانی جاباتییە" وا ڕاهێنرابووین ئەوەی فەرمانمان پێدەکرا، دەستبەجێ ئەنجامی بدەین.

ناسۆیی ڕیز بووین و چاوەڕێ بووین. دەستی کرد بە پیاسەکردن بە ناوماندا "کوڕینە بە ئیسراحەت بوەستن"، میوانە بێگانەکانیش چەند هەنگاوێك لە دوایەوە بوون و زەردەیان دەکرد "هەرکات پەنجەم خستە سەر هەر یەکێکتان لەتەنیشت ئەو سەربازەوە ڕیز دەبن". پاشان ئاماژەی بۆ ئەو پیاوە کرد کە بۆ چاودێریی دانوسستانەکە لە دەرەوە وەستابوو. هەموو هاوارمان کرد "بەڵێ گەورەم"، پاشان سڵاومان کرد. زەردەخەنەی سەر ڕووخساری میوانەکان ون بوو "بە ئیسراحەت..." "تۆ... تۆ..."، بە ڕیزەکەدا چووە خوارەوە و چەند کەسێکی هەڵبژارد. کاتێ منی هەڵبژارد دەستبەجێ چاوم تێبڕی، بەڵام ئەو پشتگوێی خستم. ئەلهاجی هەڵبژێردرا،

بەڵام کانییێ بەجێما، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە تەمەنی لە ئێمە گەورەتر بوو. ١٥ کەس هەڵبژێردران، پاشان جاباتی فەرمانی کرد "پشتێن و تەقەمەنی و چەکەکانتان بخەنە سەر زەوی و چەکەکانتان بخەنە سەر زامن". ئەوەی پێمانبوو خستمانە سەر زەوی، میوانەکان، بەتایبەتی بێگانەکان، دووبارە زەردەخەنە دەموچاویانی تەنییەوە. سەربازەکە فەرمانی کرد "ئاگاداری... بەرەو لۆرییەکە" هەموومان دوای جاباتی کەوتین بەرەو ئەو لۆرییەی میوانەکان پێی هاتبوون، پاشان ئاوڕی دایەوە و هەموومان وەستاین "ئێوە سەربازی چاك بوون. هەمووتان باش دەزانن لەم برایەتییە بەشدارن. زۆر هەست بە شانازیی دەکەم کە لەگەڵ پیاوانی وەك ئێوە خزمەتی ئەم وڵاتەم کردووە، بەڵام کاری ئێوە لێرە کۆتایی دێت. دەبێت بتاندەمە دەست ئەم پیاوانە، ئەوان دەتاخەنە بەر خوێندن و ژیانێکی ترتان بۆ دابین دەکەن". ئەمەی وت و زەردەخەنەیەکی کرد و جێی هێشتین. پاشان بە سەربازەکانی وت بمانبەنەوە بۆ سەربازگەکە و کەلوپەلە سەربازییەکانمان لێوەرگرن. خەنجەرەکەم لەناو پانتۆڵەکەم شاردەوە و نارنجۆکێکیشم خستە گیرفانم. سەربازێك یەك بە یەك هەموومانی دەپشکنی، کاتێ هاتە سەرەی من، پاڵێکم پێوە ناو پێم وت، ئەگەر لێم نزیك بێتەوە، دەیکوژم. لێم دوورکەوتەوە و کوڕەکەی تەنیشتمی پشکنی. جاباتی هاتە ناو ماڵەکەوە "چی ڕوویداوە؟" هەموومان سەیری جاباتیمان کرد لەبەر چی دەیەوێت دەستبەردارمان بێت و ڕادەستی ئەم مەدەنییانەمان بکات؟ وامانزانی تا کۆتایی جەنگ پێکەوە دەبین. ئەم سەربازانە هەموویان وەك خێزانی ئێمەن، کەچی ئێستا هەروا بە ئاسانی

ڕادەستمان دەکەن بێ هیچ ڕوونکردنەوەیەك. چەکەکانیان لێوەرگرتین، چەند سەربازێکیش چاودێرییان دەکردین، نەوەك چەکەکانمان هەڵگرینەوە.

بەرەو لۆرییەکە براین، هەر چاوم لەسەر دالآنەکە بوو کە جاباتی لێوەستابوو، دەستەکانی خستبووە پشتییەوە و لە دارستانەکەی دەڕوان. هەستم بە تووڕەیی و بێئارامی کرد، لەو ڕۆژەوەی بووم بە سەرباز هەرگیز لە چەکەکەم دانەبڕابووم. لەناو لۆرییەکە سێ سەربازی سەر بە حکومەتی تیا بوو. بە جلوبەرگەکانیاندا بۆم دەرکەوت. جلەکانیان تا ڕادەیەك پاك بوو، پانتۆڵەکانیا خستبووە ناو پۆستاڵەکانیان و کراسەکانیان بۆ ناو پانتۆڵەکەیان. چەکەکانیان تا ڕادەیەك پاك بوو، پێدەچوو تەنها فیشەکێکیان پێ نەتەقاندبێت. ڕووخساریان توندوتیژ نەبوو. سەربازەکان دابەزین و پێیان وتین سەرکەوین. دوو کورسی بێ پشت بەرامبەر یەکی تیا بوو، لەسەریان دانیشتین، دوو پیاو ئەوەی هێماکەی بە ڕوومەتەوە بوو و ئەو پیاوەی لە لوبنانی دەچوو، لەگەڵمان سەرکەوتن، سێ سەربازەکە قاچێکیان لەناو لۆرییەکە دانا، قاچەکەی تریان لە دەرەوە بوو. بەڕێکەوتین، لە تووڕەییدا کولآم نەمدەزانی چی ڕوودەدات، ئەلهاجی بە سەرسووڕمانە سەیری کردم. سەیری چەکی سەربازەکانم دەکرد و ئیرەییم پێ دەبردن. پیاوەکانی هاتبوون بەدوای ئێمە، بە درێژای ڕێ زەردەخەنەیان دەکرد. دواجار لۆرییەکە خۆڵ و تۆزی سەر ڕێگەکەی وروژاند، هێشتا نەمدەزانی بۆ کوێمان دەبەن. بۆ چەند کاژێرێك بەڕێوە بووین وا ڕانەهاتبوون بەم جۆرە دانیشم، بۆ ماوەیەکی زۆر من فێری ڕۆیشتنی بەردەوام بووم لە جێیەك بۆ جێیەکی دی. ڕقم لەو بارودۆخە دەبووەوە.

دەمویست لۆرییەکە بوەستێنم و بگەڕێمەوە بۆ (باورییە). بیم لای ئەوە بوو بە خێرایی چەکەکانیان بفڕێنم، بەڵام هەرکاتێك دەمویست ئەوە بکەم، لۆرییەکە لە خاڵی پشکنیندا دەوەستا و سەربازەکان دادەبەزین. بیم نەبوو نارنجۆکێك لە گیرفانمایە. بەدرێژایی گەشتەکە ئۆقرە لێبڕاو بووم، دەمویست لە خاڵی پشکنیندا بوەستین (ژمارەیەکی زۆر خاڵی پشکنین هەبوون) تا کەمێك بە پێوە بوەستم. کەس قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد، جار بەجار لە کاتێکی گونجاوا چاوم لە ئەلهاجی دادەگرت تا هێرش بکەینە سەر سەربازەکان، پاڵیان پێوەنێین و چەکەکانیان ببەین.

بەلای دوایەمین خاڵی پشکنیندا تێپەڕین چەند سەربازێك وەستابوون کە وەك سەربازەکانی ناو لۆرییەکە سەربازی ناوشار بوون. جلوبەرگی پاکیان لەبەردا بوو، تەختەی ئەملاو ئەولای (ئەی کەی)یەکانیان قاوەییەکی بریقەدار بوو. وا دیاربوون هەرگیز بەشداریی جەنگیان نەکردووە وەك ئەوی ئاگادار نەبن لە قەراغ شارەکانی وڵاتەکەیان چی لەئارادایە. ڕێگا خۆڵەکەمان جێهێشت، پاشان گەیشتینە شەقامێکی قەرەباڵغ، ئۆتۆمبێل بە هەردوو ئاراستە دەڕۆیشت. هەرگیز ژمارەیەکی ئەوەندە زۆر ئۆتۆمبێلم نەبینیبوو لە ژیانمدا. مێرسیدس، تۆیۆتا، مازدا، شیفرۆلێت بێ ئەوەی چاوەڕوان بکەن، هۆڕنیان لێدەدا. دەنگی گۆرانی لە هەموو لایەکەوە دەهات. تا ئەو کاتەش نەمدەزانی بۆ کوێمان دەبەن، بەڵام دەمزانی لە (فری تاون)ی پایتەختی (سیارالیۆن)ین.

شەو داهات، بە هێواشی بەڕێمان دەکرد لەناو قەرەباڵغییەکەدا. گڵۆپی سەرجادەکان هەڵکران. تەنانەت گڵۆپی دووکانەکانیش هەڵکران، سەرم

سوورِمابوو چۆن ئەم هەموو گلۆپانە بێ دینەمۆ کاردەکەن. سەرم لەم دیمەنانە سوورِمابوو. لۆرییەکە ئاراستەکەی گۆڕی و پاشان هەڵبەز و دابەزین و لەرینەوەیەکی زۆری دەستپێکرد، هەموومان وامان هەست دەکرد لە ناو ئامێری لەرینەوە وەستابێتین.

سەربازەکان داوایان لێکردین دابەزین و دوای ئەو پیاوانە بکەوین کە تیشێرتی (یونیسێف)یان لەبەردا بوو. گەیشتینە جێیەك چەند خانوویەکی تەنیشت یەکی لێبوو. چەند پەرژینێکی پێکەوە لکاویش لەبەردەم خانووەکان. چەند کوڕێکی تەمەن خۆمانی لێبوو لە داڵانەکەدا بوون، پێدەچوو ئەوانیش نەزانن لەبەرچی لەوێن. ئەو پیاوەی لە لوبنانی دەچوو پێی وتین، دوایکەوین بۆ ناو خانووەکە، دەموچاوی لە خۆشیدا دەدرەوشایەوە. خانووەکە لەناوەوە هۆڵێکی گەورە بوو، دوو ڕیز چرپای دووکەسی دانرابوو. پیاوەکە بە ڕوویەکی خۆشەوە جێی خەوتنی هەریەکەمانی پیشاندا‌ین. سەر جێگە و باتانی و سەرین و سابوون و هەموو کەلوپەلێکی پاکەرەوەی پێداین. ئەوەندەی ئەو دڵی بەو شتانە خۆش بوو، ئێمە دڵمان پێیان خۆش نەبوو. "کاڵەی زۆرمان هەیە، سبەینێ وەریدەگرن". پاشان بە فیکەلێدانەوە چووە دەرەوە. ئێمەش هەروا وەستاین چاومان بڕیبووە جێی خەوتنەکانمان، وەك ئەوەی هەرگیز شتی وامان نەبینیبێت! ئەو پیاوەی هێماکە بە ڕوومەتییەوە بوو، پێی وتین: "وەرن لەگەڵم بۆ چێشتخانەکە و هەندێ خواردەمەنی بەرن". دوایکەوتین بەناو ئەو کوڕانەی پێش ئێمە لەوێبوون، چاویان وەکو ئێمە سوور بوو، هەرچەندە جلی مەدەنییان لەبەردابوو، بەڵام هەر پیس و چڵکن

دەردەکەوتن و ڕووخسارِیان وەك و ئێمە تووندوتیژ بوو. هێشتا بۆنی دارستان و دەوەنیان لێدەهات. لەلایەکی مێزێکی گەورەی ناخواردن دانیشتین. پیاوەکە چووە ژوورێکی بچووك لەبەرخۆیەوە ئاوازی گۆرانییەکی دەوتەوە، کە لەمەوپێش بیستبووم، لە ژمارەیەکی زۆر قاپی قوڵدا برنجی لەسەر سینی بۆ هێناین و دەستمان کرد بە خواردنی. کاتێ گەڕایەوە سەر مێزەکە تا نانەکەی بخوات، ئێمە هەر زوو قاپەکەی بەردەمان بەتاڵکردبووەوە. سەری سووڕما، سەیری ئەملاولای کرد نەبا شتێکمان لە خواردنەکە کردبێت و نەماخواردبێت. پێش ئەوەی یەکەم کەوچك لە خواردنەکەی بدات، دوو پیاوە بێگانەکە هاتنە ژوورەوە و داوایان کرد بچێتە دەرەوە لەگەڵیان، قاپەکەی لەگەڵ خۆی برد و دوایانکەوت. بۆ ماوەیەك بە بێدەنگیی دانیشتین. ئەلهاجی پرسی کێ ماریجوانا، یان کۆکاینی پێیە، یەکێك لە کوڕەکان کەمێك ماریجوانای پێبوو، بەڵام ئەوەندە نەبوو کە بەشمان بکات. یەکێ لە کوڕەکان پرسیاری کرد: "لە کوێ کەمێك مادەی بێهۆشکەری چاك پەیدا بکەین لەم خانووە؟" کاتێك سەرقاڵی بیرکردنەوە بووین بۆ ئەم پرسیارە، ئەو پیاوەی ئێمەی هێنا بۆ چێشتخانەکە، گرووپێکی تر کوڕی هێنا ژمارەیان لە بیست کوڕ زیاتر بوون "ئەمانە تازە گەیشتوون". ڕووی کردە کوڕەکان، پاشان وتی: "ئێستا خواردنتان بۆ دەهێنم، بەڵام تکایە بە ئیسراحەت نان بخۆن، هیچ پێویست ناکات پەلە بکەن"، ئەوانیش بەهەمان خێرایی ئێمە نانەکەیان تەواو کرد. پیاوەکە بۆنێکی ژوورەکەی کرد و پرسی "کێ ماریجوانای کێشاوە؟"

کەس قسەی نەکرد بە بێدەنگیی دانیشت و هیچی نەوت. کوڕەکان بەرامبەرمان بوون، هەردوولامان چاومان بڕیبووە یەك.

ئەلهاجی بێدەنگییەکەی تێکشکاند "ئێوە خەلکی کوێن کوڕینە؟"

کوڕەکان چاویان زەق کردەوە و سەیری ئەلهاجییان کرد، وەك ئەوەی پرسیارێکی زۆر هەڵەی کردبێت. یەکێك لە کوڕەکان کە پێدەچوو تەمەنی گەورەتر بێت. قژ بەسەرییەوە نەبوو. دەستی بەرزکردەوە و خۆی بەرەو ڕووی ئەلهاجی نوشتانەوە "ئەی جەنابت خۆت بە چی دەزانیت پرسیار لە ئێمە دەکەیت؟ وا دەزانیت ئێمە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانتان لێرەین؟"

ئەلهاجی هەستایە سەرپێ و پاڵی پێوەنا کوڕەکە بە زەویدا کەوت، کە هەستایەوە خەنجەرێکی دەرهێنا و بەرەو ڕووی ئەلهاجی ڕایکرد. هەموومان هەستاینە سەرپێ، پیاوەکە هاواری کرد "کوڕینە بوەستن..."، بەڵام کەس گوێی بۆ نەگرت، دەستبەجێ نارنجۆکەکەم دەرهێنا و دەستم خستە ناو دەرزییەکەی. هەڕەشەم لە کوڕەکان کرد.

-"کوڕینە دەتانەوێت ئەمە دوایەمین ژەمە خواردنتان بێت، یان دەتانەوێت وەڵامی پرسیارەکەی بدەنەوە؟"

-"خەلکی کۆنۆزین" کوڕەکەی خەنجەرەکەی بەدەستەوە بوو، وەڵامی دایەوە.

هێشتا نارنجۆکەکەم بەدەستەوە بوو، ئەلهاجی وتی: "ئاهـ... شوێنی ئەڵماسەکان!!"

بە ڕوویەکی گرژەوە پرسیم: "لە ڕیزی یاخیبووەکان بوون، یان لە ڕیزی سوپا؟"

-"بە بۆچوونی تۆ لە یاخیبوویەك دەچم؟ من لـە بـەرەی سـوپا بـووم. یاخیبووەکان گوندەکەمیان سووتاند و دایك و باوکمیان کوشت. تۆش هەر لە یەکێك لەوان دەچیت".

ئـەلهاجی وتـی: "کەواتـە هـەموومان لـە یـەك بـەرە جـەنگاوین". هەموومان دانیشتین هێشتا بە تووڕەییەوە لە یەکمان دەڕوانی. بۆمان ڕوون بووەوە هەموومان لە پارچـە جیاجیاکـانی ولاتەکـە لـە جەنگـدا بـووین. هێوربووینەوە و دەستمان کردە گفتوگـۆ. هەریـەك باسـی سـەربازگەکانی خۆی دەکـرد. کـەسمان نـاوی سـەربازگەکان، یـان فەرمانـدەی ئـەویترمان نەبیستبوو. پێمان وتن، کە ئێمەش چەند دەقەیەك پێش ئەوان هێنراوین.

ئەوانیش وەك ئێمە هەڵبژێردرابوون لەلایـەن فەرمانـدەکانیان. پێمـان سەیر بوو بۆ ئێمەیان ناردووە بۆ ئێرە، هەموومان سەربازی بەتوانا بـووین کە ئامادە بووین تا کۆتایی جەنگ بکەین. یەکێك لە کوڕەکان پێی وتـین کە ئەم بێگانانە لەبری ئێمە پارەیان داوە بە فەرمانـدەکان. کـە ئەمـەمان بیست کەس قسەی نەکرد. هێشتا نارنجۆکەکەم بەدەستەوە بوو، ڕووم کـردە پیاوەکەی ئێمەی هێنـابوو بـۆ چێشـتخانەکە. لـە قـەراغێکی مێزەکـەوە دانیشتبوو هەموو گیانی لەترسا دەلەرزی و ناوچەوانی ئارەقی کردبـووەوە، پاشان لێم پرسی: " تۆ دەزانیت بۆ فەرمـاندەکان ئێمەیان ناردووە بـۆ نـاو ئەم ژنانە؟" بە نارنجۆکەکەم ئاماژەم بۆ کرد. دەستبەجێ سەری خستە ژێـر مێزەکە، وا تێگەیشت نارنجۆکەکەی تێـدەگرم. زۆر شـڵەژا بـوو نەیـدەزانی چۆن وەڵام بداتەوە. کوڕەکەی خەنجەرەکەی پێبوو ناوی مامبو بوو، کە دواتر

بووینە هـاورێ. مـامبو وتـی: "ئەمـە پیـاوێکی ژنانییـە بـا بـڕۆین لـە کوڕەکانی تر بپرسین".

ڕۆیشتینە دەرەوە پیاوەکە هێشتا لەژێر مێزەکـە بـوو. بـەرەو دالآنەکـە ڕۆیشتین، سێ سەرباز لەبەردەم دەرگای هاتنە ژوورەوە، قسـەیان دەکـرد و ئێمەیان پشتگوێخستبوو. دوو پیاوە بێگانەکە ڕۆیشتبوون. چـەند کوڕێـك لە دالآنەکە بە هێمنی دانیشتبوون، ئـەلهاجی پرسـی: "ئێـوە دەزانـن بـۆ فەرماندەکان ئێمەیان ڕادەستی ئەم مەدەنییانە کردووە؟"

کوڕەکان وەستان و بە تووڕەییەوە چـاویان بڕییـە ئـەلهاجی. ئـەلهاجی وتی: "چییە؟ کـەڕن؟" پاشـان سـەیری کـردم پێـی وتم: "ئەمانـە هـیچ نازانن!".

یەکێ لە کوڕەکان بە دەنگێکی گڕەوە وتی: "نامانەوێت بێزاریکـرێین و ناشمانەوێت وەڵامی پرسیاری هیچ هاوڵاتییەکی مەدەنی بدەینەوە".

مامبو بە تووڕەییـەوە وتـی: "ئێمـە هـاوڵاتی مـەدەنی نـین"، پاشـان بەرەوڕووی کوڕەکە ڕۆیشت: "تەنها مەدەنی کە لێرە بێت، ئێوەن. ئێوە جلی مەدەنیتان لەبەردایە، چ سەربازێکی سوپا جلی مەدەنی لەبەر دەکات؟ یان ئەم ژنانە بـەزۆر ئـەم جلانـەیان لەبـەرکردوون. کـەوا بێـت سـەربازێکی کەمتوانان".

-"ئێمە دژی (ئار یو ئێف) جەنگاوین. ئەوانە دوژمنی ئێمـەن، ئێمـە لە پێناو ئازادی جەنگمان بەرپاکرد، بەڵام ئەوان گوندەکەمیان سـووتاند و خێزانەکەمیان لەناوبرد، هەرکات ئەو سەربازە نامەردانەم بەرچـاوکەوێت، هەموویان لەناو دەبەم".

کوڕەکە تیشێرتەکەی داکەند تا شەڕ لەگەڵ مامبو بکات، بەڵام لەسەر قۆڵی تاتووی (ئار یو ئێف) کێشرابوو!

مامبو هاواری کرد "ئەوانە یاخیبوون...!" پێش ئەوەی خەنجەرەکەی دەربێنێت، کوڕەکە بۆکسێکی لە مامبو دا و خستی بە زەویدا. مامبو هەستایەوە لووتی پڕ خوێن ببوو.

کوڕەکە چەند خەنجەرێکی وەشاند و بەرەو لای ئێمە ڕایکرد، کوڕەکانی تریش بەدوایدا. دووبارە جەنگ دەستی پێکردەوە. ڕەنگە ئەو بێگانە بێنەقلانە واتێگەیشتبن ئەگەر لە جەنگ دوورمانخەنەوە، چیتر ڕەقمان بەرامبەر (ئار یو ئیف) نابێت، ڕەنگە نەزانن گۆڕینی جێی نیشتەجێبوونمان نامانکات بە کوڕێکی تر، ئێمە کەسانی مەترسیداربووین و ڕاهێنرابووین لەسەر کوشتن. ئەوان تەنها دەستیان کردبوو بە پرۆسەی گەڕاندنەوەی کەسایەتی ئێمە بۆ دۆخی جارانمان. ئەمە یەکەم دەرس بوو دەبوایە بیانزانیایە.

پاش ئەوەی کوڕەکان بەرەوڕوومان ڕایانکرد، نارنجۆکەکەم تێگرتن، بەڵام درەنگتر لەوادەی خۆی تەقییەوە. دەستبەجێ لە دالانەکەوە بازمان هەڵدایە حەوشەی خانووەکە و شەڕ دەستی پێکرد. هەندێکمان خەنجەرمان پێبوو. کوڕێکیان کە هیچی پێ نەبوو، لە دواوە توند ملی گرتم و دەیویست بمخنکێنێت، نەمدەتوانی خەنجەرەکەم بەکاربەرم. بە ئانیشك کەوتمە لێدانی تا وازی لێم هێنا، کە ئاوڕمدایەوە بینیم دەستی گرتووە بە سکییەوە. بە خەنجەرەکەم قاچیم بریندار کرد، پاش ئەوەی کەوتە سەرزەوی بە شەق بەربوومە دەموچاوی. ویستم دوایەمین خەنجەرم بوەشێنم، یەکێك

لە دواوە دەستمی قاش کرد، ویستی بمخات بە زەویدا، خۆی بە دەمدا کەوت، ئەلهاجی لەدواوە لە پشتی دابوو. خەنجەرەکەی لە پشتی دەرهێنایەوە بە هەردووکمان کەوتینە لێدانی ئەو کوڕەی لە زەوییەکەدا کەوتبوو تا لە جووڵە کەوت. نەمزانی لە هۆش خۆی چووە، یان مردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەلامەوە گرنگ نەبوو. لە ماوەی شەڕکردنمان کەس نەگریا، یان هاواری نەدەکرد جگە لەوە ئەمجۆرە شتانە پیشەی چەند ساڵەمان بووە. هێشتا لەژێر کاریگەری مادە بێهۆشکەرەکاندا بووین. پاش چەند خولەکێك سێ سەربازەکە و دوو پیاوە سیارالیۆنەکە هاتن "بوەستن... بوەستن"، برینندارەکانیان بردە لاوە. بازمان هەڵدایە سەر سەربازەکان و چەکەکانیانمان بردن، هەردوولا لە یاخیبووەکان و تەنانەت ئێمەش چەکمان پێبوو، سەربازەکان هەر زوو ڕایانکرد پێش ئەوەی لەلایەن ئێمەوە بگیرێن.

مامبو چەکی پێبوو، پێش ئەوەی یاخیبووەکە میل بێنێتەوە، مامبو تەقەی لێکرد، کەوت بە زەویدا، چەکەکەی لەدەست کەوت، یەکێکی تر لە کوڕەکان ویستی هەڵیگرێتەوە، مامبو تەقەی لەویش کرد. چەند کوڕێکی کوشت و هەندێکی تری بریندار کرد، بەڵام ئەوانی تر کۆڵیا نەدا دواجار یەکێکیان تەقەی لە دوو کوڕی ئێمە کرد. کوڕی دووەمیان کە لە نزیکەوە تەقەی لێکرابوو پێش ئەوەی گیانی دەرچێت، خەنجەرەکەی کرد بە سکی یاخیبووەکەدا و خستی بە زەویدا و چەکەکەی لێکەوت.

سەربازی زیاتر هاتن بۆ ماوەی ٢٠ دەقە یەکترمان دەکوشت و دەبڕی. سەربازەکان چەند فیشەکێکیان بە ئاسماندا تەقاند تا بمانوەستێنن، بەڵام

ئێمە گوێمان پێ نەدان. ناچاربوون تفەنگەکانمان ئاڕاستە بکەن، یان بە لێدانمان بمانوەستێنن. ٦ کەس کوژران، دووان لە ئێمە و ٤ لە یاخیبووەکان. ژمارەیەکی زۆرمان لێ بریندابوو. هەروەها ئەو پیاوانەی کە ئێمەیان هێنابوو. ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن گەیشت بە دەنگەکەی بۆ ئەو شەوە تازە لەدایکبووە خوێناوییە شیوەنی دەکرد. بە سەیرکردنی ڕوونـاکی گلۆپەکەی، سەرم گێژی دەخوارد. کەمێك دەستم بریندار بوو، دەستبەجێ شاردمەوە نەمدەویست ببرێم بۆ نەخۆشخانە. جگە لەوە برینێکی کەم بوو. دەستم شت و کەمێك خوێم لەسەر دانا و توند بە پارچە پەڕۆیەك بەستم. لەماوەی شەڕەکەدا مامبو چاوی یەکێ لە کوڕەکانی بە خەنجەرەکەی هەڵکۆڵیبوو. دواتر بیستمان کوڕەکە براوەتە دەرەوەی وڵات تا نەشتەرگەریی بۆ بکەن و چاوی پشیلە، یان شتێکی تر لەجێی چاوی خۆی دانێن. شەوی دواتر هەموو دەستخۆشیمان لە مامبو کرد بۆ ئەو کارە کورشندەیەی. خۆزگەم دەخواست لە سوپاکەی ئێمە بووایە. سەربازەکان چاودێرییان دەکردین تا دڵنیا بن کە دووبارە شەڕ دەست پێ ناکاتەوە. بۆ نانخواردن چووینە چێشتخانەکە، مامبو پێی وتین کاتێك چاوی کوڕەکەی هەڵکۆڵیوە، ئەو ویستویەتی بەرەو ڕووی ڕاکات و لێی بدات، بەڵام چاوی نەیبینیوە و سەری توند داوێتی بە دیوارەکەدا و بووراوەتەوە. هەموومان دەستمان کرد بە پێکەنین و مامبومان بەرزکردەوە. پێویستمان بە توندوتیژیی هەبوو تا کەمێك دڵخۆشمان بکات دوای ڕۆژێکی پڕ بێزاریی و گومان و پرسیار داخوا بۆچی فەرماندەکان ئێمەیان ناردووە بۆ ئێرە. ئاهەنگەکە کۆتایی هات کاتێ سەربازەکان هاتنە چێشتخانەکە و داوایان

لێکردین دوایانکەوین. چەکەکانیان ئاراستە کردبووین، بەڵام ئێمە پێیان پێدەکەنین. چووینە دەرەوە سواری ئۆتۆمبێلە سەربازییەکان بووین و چاوەڕوان بووین بەرەوشوێنێکی تر بگوێزرێینەوە. ئەوەندە دڵخۆش بووین کە هێرشمانکردووەتە سەر یاخیبووەکان، کاتی ئەوەمان نەبوو بیر لە هێرش کردنەسەر سەربازەکان بکەینەوە، جگە لەوە ژمارەیان زۆر زۆر بوو. ڕەنگە پەیوەندییان کردبێت تا سەربازی زیاتر ڕەوانە بکرێت، وادیارە زانیویانە ئێمە منداڵی یاریکردن نین. سەربازەکان توند چەکەکانیان ئاراستە کردبووین و چاویان لەسەرمان بوو، ئەلهاجی وتی: "ڕەنگە ئۆتۆمبێلەکە بڕواتە پێشەوە و بێتە دواوە، بەم شێوەیە یاییمان پێ دەکەن". هەموومان دەستمانکرد بە وتنی سرروودی نیشتمانی و دەهۆڵ لێدان.

بەڵام پێش و دوا نەبوو. ئەمجارە بردیانین بۆ (خانەی بێنین). کە سەنتەرێکی تر بوو لە شارۆچکەی (کیسی). کە دەکەوێتە دەرەوەی باشووری شاری (فری تاون).

خانەی بێنین بە خانەیەکی گەنجانی پەسەندکراو ناوبانگی هەبوو، کە لەلان حکومەتەوە بەڕێوەدەبرا. سەربازەکان بە وردی هەریەکەمانیان پشکنی پێش ئەوەی بچینە ژوورەوە. خوێنی دووژمنەکانمان هێشتا بە قۆڵ و جلەکانمانەوە بوو. گووتەکانی جاباتی هێشتا لە مێشکمدا دەنگی دەدایەوە "لە ئێستا بەدواوە هیچ یاخیبوویەك دەستگیر ناکەین، دەستبەجێ دەیانکوژین". زەردەیەك گرتمی دڵخۆش بووم، کە وامان بەسەر یاخیبووەکان هێنا، بەڵام هێشتا نەمدەزانی لەبەرچی بۆ ئەو شوێنە نێردرام. ئەو شەوە لە داڵانەکە دانیشتبووین سەربازەکانیش چاودێرمان

بوون. هەر خەیاڵم لای جی ٣یەکەم بوو، بیرم دەکردەوە ئاخۆ ئێستا سەربازەکانی سوپا سەیری چ فیلمێك بکەن. یان چەند ماریوجانا و کۆکاینی باشیان ڕێکخستبێت. مامبو لە سەربازەکانی پرسی: "هێی کوڕینە هەندێك ماریجوانامان بۆ پەیدا ناکەن؟"

بەڵام سەربازەکان پشتگوێیان خست. ئەو شەوە لەشم کەوتە لەرزین، ئەو دەرمانانەی چەند شەوێك پێش ئەوەی بهێنرێینە شار، بەکارم هێنابوون، کاریگەری بەرەو نەمان چووبوو. لە داڵانەکەدا هاتوچۆم بوو سەرم تا دەهات ئازاری زیاتر دەبوو.

# شانزه

زۆر تووڕە دەبووم ئەگەر مەدەنییەکان داوای ئەنجامدانی کارێکیان لێبکردینایە، دەنگیان... تەنانەت کاتێک بۆ نانی بەیانیش بانگیان دەکردین، ئەوەندە تووڕەی دەکردم کە بۆکسم لە دیوارەکەی تەنیشتم دەدا، یان لۆکەرەکەم، یان هەرچییەک لە تەنیشتم بووایە لە تووڕییدا لێم دەدا. چەند ڕۆژێك لەمەوپێش، ئێمە بوون و نەمانی ئەوانمان بەدەست بوو. لەبەرئەم شتانە ئەوەی پێمان دەوترا مەحاڵ بوو ئەنجامی بدەین، جگە لە نانخواردن. ژەمی بەیانیانمان نان و چا و نیوەڕوان برنج و شلەی کاساڤا و پەتاتە و بامیێ. ئەم شتانە هەرگیز دڵخۆشیان نەدەکردین. مادەی بێهۆشکەر و چەکەکانمان زیاتر لا مەبەست بوو. لە کۆتایی هەموو ژەمەخواردنێك پەرستارەکان و ئەندامەکانی نەخۆشخانە بچووکەکەی ناو بێنین، سەردانیان دەکردین و قسەیان لەگەڵ دەکردین و داوایان لێدەکردین لەکاتی خۆیدا ئامادەی نەخۆشخانەکە بین و یەك بە یەك لە لایەن پزیشکی دەروونییەوە قسەمان بۆ دەکرا، کە لە هەموو شتێك زیاتر ڕقمان لێی دەبووەوە. هەرکات دەستیان بە قسەکردن بکردایە، قاپ و کەوچك و کووری و خواردەمەنی و چیمان لەبەردەست بووایە، تێمان دەگرتن. تا دەرەوە ڕاومان دەنان و تێمان هەڵدەدان. دوا نیوەڕۆیەك دوای ڕاونانی پەرستار و ستافەکان، دۆلکەیەکی گەرمان خستە سەر سەری چێشتلێنەرەکە و ناچارمان کرد بە موبەقەکەدا بسووڕێتەوە، تا هەموو

دەستی سووتا و ڕازی بوو شیری زیاتر بخاتە نـاو چـایەکانمان. بـەهۆی ئـەم جۆرە کارانەوە، هەفتەی یەکەم وازمان لێهێنرا تا لەگەڵ ئەو ژینگە نوێیە ڕابێین. هەر ئەو هەفتەیە کێشـەمان کۆکـاین و ماریجوانـا بـوو. ئەوەنـدە تامەزرۆیان بووم لەتاوا پارچـە پەڕیـەکم لـوول دەکـرد و دەمسـووتاند و دەمکێشا. زۆرجار ناو گیرفانی شۆرتە سەربازییەکەم دەگەڕام کـە تـا ئـەو کاتەش لەبەرما بوو، بۆ کەمێك کۆکاین، یان ماریجوانـا، دەچـووینە نـاو نەخۆشخانەی خانەکەوە دەرمانی هێورکەرەوەمان دەهێنا لەگـەڵ حـەبێکی سپی و کەپسولی زەرد و سوورا، کەپسولەکانمان بـەتاڵ دەکـردەوە و حەبـە سپییەکەم ورد ورد دەکرد و تێکەڵ بەیەکمان دەکـردن، بـەڵام کاریگـەریی لەسەرمان نەبوو. هەموو ئەمانە تووڕەتر و توندوتیژی دەکـردین. بـە ڕۆژ لە هاوسێکانمان دەدا کە هاتبوونە دەرەوەی ماڵـەکانیان تـا گوڵـەکانیان ئاوبدەن. ئەگەر ڕایانبکردایە بەرد و سەتڵمان تێدەگرتن. تـا ئـەو کاتـەش هەندێك لەوانمان ناردبوو بۆ نەخۆشخانە. ستافەکان پشـتگوێیان خسـتین. شەو و ڕۆژ شەڕمان دەکرد لەسەر بچووکترین شت، یان نانخواردن، دەبوو بە شەڕ، کورسـی و کەلوپـەلی خانەکـەمان تێکدەشـکاند و دۆشـەکەکانمان هەڵدەدایە حەوشەکە. کـاتی نـانخواردن خـوێنی لێـو و دەسـت و قاچـمان دەسڕی. شەوان پاش شەڕ دۆشەکەکانمان دەهێنایە حەوشەکە و بـە هـێمنی لەسەری دادەنیشتین. تا کاتی نانخواردنی بەیانی. هەرکات لە نانی بـەیانی تەواو دەبووین، دەگەڕاینەوە حەوشەکە. دۆشەکەکانمان دەبرانەوە سەر جێـی خەوتنەکان. بە تووڕەییەوە دەمانهێنانـەوە دەرەوە و نـەفرەتمان لـەو کەسـە دەکرد کە بردبوونییە ژوورەوە. شەوێکیان لە دەرەوە بـووین بـاران دایکـرد.

لەبەر بارانەکەدا دانیشتین و دەموچاومان دەسڕی و گوێمان لە دەنگی بارانەکە دەگرت، تا بەیانی لەسەر ئیسفنجە تەڕەکان دانیشتبووین، ئەو ئیسفنجەی ڕۆژێك لە ڕۆژان دۆشەك بووە.

بۆ ڕۆژی دواتر، دوای نانی بەیانی هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو دۆشەکەکانمان هێشتا تەڕ بوون. دەستبەجێ چووینە لای پۆپای ئەو پیاوەی کە وەختی خۆی لە سوپا بووە، فەرمانمان پێکرد دۆشەکی وشکمان باتێ. "چاوەڕێ بکەن تا ئەوانەی دەرەوە وشك دەبنەوە".

یەکێك لە کوڕەکان وتی: "مەدەنییەکی وەکو تۆ چۆن دەتوانێت بەم شێوەیە قسەمان لەگەڵدا بکات؟" بە هەمووومان هێرشمان کردە سەری، یەکێك لە کوڕەکان چەقۆی لە قاچی دا و کەوت، خستی بە زەویدا. پاشان بە شەق تێی کەوتین و خوێنی لێدەڕۆیشت و بێهۆش کەوت. بە دڵی خۆشەوە گەڕاینەوە سەر دالآنەکە و هاوارمان دەکرد، بەڵام لەناکاو هەموو بێدەنگ بووین. بیری سوپاکەمم دەکرد و پێویستم بە توندوتیژی زیاتر بوو. چاودێرێك دەستبەجێ پۆپای بردبوو بۆ نەخۆشخانە، دوای چەند ڕۆژێك گەڕایەوە و زەردەیەك لەسەر لێوی بوو. لە موبەقەکە بەهێواشی پیاسەی دەکرد پاشان وتی: "هەڵەی ئێوە نەبوو کە من وام بەسەرهات". ئەمە زیاتر تووڕەی کردین، دەمانویست مەدەنییەکان ڕێزمان بگرن و لێمان بترسن، کە ئێمە سەربازین و لەهەر کاتێك بمانەوێت لەناویان دەبەین. ستافەکانیش کاتێك دەگەڕانەوە بە زەردەخەنەوە لێیان دەڕوانین وەکو ئەوەی بڕیاریان دابێت دەستبەردارمان نەبن. ئەمەش وای لێکردین زیاتر و زیاتر ڕقمان لێیان بێتەوە. دەستەکانم دەلەرزین، دووبارە سەرئێشە بۆ سەندنەوەی

تۆڵەی ئەم چەند ساڵە ڕووی تێکردم. لەسەر جێی خەوتنەکەم یان داڵانەکە لەبەر ئازار لوڵم دەخوارد، بەڵام کەس گوێی بە کەس نەدا. ئەلهاجی بۆ وێنە ئەوەندەی بۆکس لە دیوارەکان دابوو، جومگەکانی دەستی دەرکەوتبوون. بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە نەخۆشخانە لەژێر چاودێریدا بوو تا ئازاری خۆی نەدات. ڕۆژێك بڕیارمان دا پەنجەرەی یەکێك لە پۆلەکان تێکبشکێنن. نازانم لەبەرچی، بەڵام لەبری ئەوەی بەردی تێبگرین بە دەست شکاندم، چەند جارێك لێم دا تا شکاندم، بەڵام دەستم لەناو شووشەکەدا بەگیر هات و ئەو کاتەی دەرمهێنا خوێنێکی زۆرم لێ ڕۆیشت، دەمویست ئەو جانتایە بێنم کە کەلوپەلی فریاکەتنی سەرەتایی تێدا بوو تا دەستم تیمار بکەم، بەڵام پەرستارێك لەوێ بوو. داوای لێکردم لەسەر کاونتەرەکە دانیشم، هەرکات وردە شووشەکانی لە دەستم دەردەهێنا کە تا قووڵایی پێستەکەم ڕۆچووبوون، دەموچاوی گرژ دەکرد. هەرکات سەیری دەکردم، زۆر بە هێمنی و ڕێك و ڕەوان دانیشتبووم، دەیویست بزانێت هەست بە ئازار دەکەم، یان نا، سەری سوورمابوو، بەڵام بەردەوام بوو، بە نەرمی وردە شووشەکانی دەردەهێنا. هەستم بە هیچ نەدەکرد، تەنها دەمویست خوێنەکە بوەستێتەوە.

پەرستارەکە دەستی بە پاککردنەوەی برینەکەم کرد "ئەمە ئازاری دەبێت". پاشان دەستی کرد بە بەستنی برینەکە. "ناوت چییە؟" من پشت گوێم خست. "سبەی دووبارە سەردانم بکەرەوە تا باندجەکەت بۆ بگۆڕم". دەستی بەسەرمدا هێنا، بەڵام من لە خۆمم دوورخستەوە و چوومە دەرەوە.

بۆ ڕۆژی دوایــی ســەردانم نــەکردەوە، بــەڵام لەبــەر ئــازاری ســەرم لــە دالآنەکەدا بووڕابوومــەوە. کاتێك چاوم هەڵهێنا لە نەخۆشــخانە کــەوتبووم. پەرستارەکە ناوچەوانمی بە پارچە قووماشێکی تــەڕ دەســڕی. دەســتەکانیم گرتن و بەلاوەم نان و چوومە دەرەوە. لەبەر خۆرەکە هــەر ســەروخوارم بــوو. قوڕگم وشك و هەموو لەشم ئازاری هەبوو. هێڵنجم دا و شــلەیەکی ڕەنــگ سەوزم هێنایەوە و دووبارە بووڕامەوە. پاش چەند کاژێرێك چاوم هــەڵهێنا، هەمان پەرستار لە ژوورەکەم بوو. پــەرداخێك ئــاوی بــۆ هێنــام. "ئەگــەر دەتەوێت بڕۆیت دەتوانیت، بەڵام پێم باشە ئەمشەو لــە جێــدا بمێنیتــەوە"، وەکو دایکێك کە ئامۆژگاری منداڵە کەللەڕەقەکــەی دەکــات. پەنجــەکانی بەرەو ڕووم ڕاوەشاند. پەرداخە ئاوەکەم لێگرت و خواردمەوە، پاشان هەڵمدا بە دیوارەکەدا و شکاندم. پەرستارەکە خێرا لەســەر کورسییەکەی بــازی هەڵــدا. ویســتم بــڕۆم، بــەڵام نەمــدەتوانی بەرزببمــەوە. پەرســتارەکە بــە زەردەخەنەیەکەوە بەرەو ڕووم هات بەتانییەکەی پیا دامەوە و دەســتی کــرد بــە کۆکرنــەوەی وردە شووشــەکان. دەمویســت بەتانییەکــە لابــەرم، بــەڵام نەمدەتوانی چیتر بجوڵێم پێڵووی چــاوەکانم تــا دەهــات قوورســتر دەبــوون و بێهێزتر دەبووم.

❊ ❊ ❊

به چــرپەی پەرســتارەکە و کەســێکی تــر خەبــەرم بــووەوە. شــڵەژابووم نەمدەزانی چ ڕۆژێکە، یان کاژێر چەندە. "ماوەی چەندە لێرەم؟" بە دەســت کێشام بەلای جێی خەوتنەکەمدا تا پەرستارەکە بێتە لام. "سەیرکەن کــێ

قسه دەكات! ئاگاداری دەستت بە..."، كەمێك بەرزبوومەوە سەربازێك لە ژوورەكەم بوو كاتێك بینیم وا تێگەیشتم دەیەوێت بمباتەوە بۆ سوپا، بەڵام ئەو لەبەر هۆكاری تر لەوێ بوو. بە ڕووخسار و سیمایدا پێدەچوو سەربازی ناوشار بێت. جلی پاكوخاوێنی پۆشیبوو. چەكی پێ نەبوو. ئەو ئەفسەر بوو بۆ چاودێریی ئێمە هاتبوو تا بزانێت لە ڕووی سایكۆلۆجی و پزیشكییەوە چۆن چاودێریی دەكرێین، بەڵام ئەو پەرستارەكەی زیاتر لا مەبەست بوو وەك لە ئێمە. من خۆم ئەفسەر بووم، یان با ڕاستتر بڵێم جێگری ئەفسەر بووم.

بەرپرسیاری یەكەیەكی بچووك بووم كە لە چەند كوڕێك پێكهاتبوون، تا كارەكان بە خێرایی بەڕێوەبچن. گادافی و جاباتی فەرمانیان كردبوو ئەلهاجی و كانیێ و مۆریبا و جوومبا یەكەیەك پێك بێنن. ئەمجارەیان هەموومان پێكەوەین بێ ئەوەی لەدەست جەنگ ڕابكەین. هەموومان دەنێردراینە دەرەوەی گوندەكە تا خواردن و دەرمان و گاز و تەقەمەنی لە گوندەكانی ترەوە بهێنین. پاشان زانیاریم دەدایە گادافی تا هەموویان هێرش بكەنە سەر ئەو گوندەكە و هەموویان بكوژن، تا بتوانین بە زیندوویی بمێنینەوە. ڕۆژێكی هاوین خۆر تیشكی خۆی تێدەگرتین. گەیشتینە گوندێك، سەرەتا وامانزانی سێ ڕۆژمان دەوێت تا پێی بگەین، بەڵام دوای ڕۆژ و نیوێك بۆ ئیوارە بۆنی خواردەمەنیمان كرد و دەوری گوندەكەمان دا. چەند پیاوێكی چەكدار ڕاكشابوون، لەبەردەم خانووەكانیش شتی كۆكراوە دانرابوو، وادیاربوو بڕیاریان داوە گوندەكە جێبهێڵن. ئەگەر بە گادافیم بوتایە فریا نەدەكەوتین خواردەمەنییەكانیان ببەین. فەرمانم بە سێ كوڕەكە كرد لە شوێنی ستراتیجی دیاریكراودا بوەستن من و ئەلهاجی

چاوەڕێمان کردن تا چوونە جێیەکانیان. دووانمان لە ڕێگا سەرەکییەکەوە بە هێواشی چووینە پێشەوە. ٢ ئار پی جی و ٥ نارنجۆکمان پێ بوو، چەکەکەم ئاراستەی ئەو گرووپە کرد کە لە سەرەتاوە پلانم بۆیان دانابوو. پێش ئەوەی بە تەواوی نزیك بینەوە، ئەلهاجی بە گوێمدا چرپاندی کە دەیەوێت ئەو تەکنیکەی لە ڕامبۆوە فێری بووە، ئێستا تاقی بکاتەوە. هەر زوو بە ئاو و بە تف کەمێك قووڕاوی گرتەوە و دای لە دەموچاوی و چەکەکەی بە پشتییەوە هەڵگرت و خەنجەرەکەی بەرزکردەوە و بە هێواشی نزیکبووەوە. کاتێك ئەلهاجی لەپێش چاوم ون بوو. چەکەکەم ئاڕاستەی چەکدارەکان کرد. پاش چەند دەقەیەك ئەلهاجی لە پشتی خانووەکانەوە بە هێواشی دەرکەوت زوو زوو لەپشت دیوارەکان دادەنیشت، تا نەبینرێت. پاشان بەرەو ئەو پیاوە دەڕۆیشت کە لەسەر کوورسی لەبەر خۆردا دانیشتبوو چەکەکەی لەسەر کۆشی بوو، لە پشتییەوە ڕۆیشت و دەمی توند گرت و قوڕگی قاش قاش کرد. هەمان شتی دووبارە کردەوە، بەڵام هەڵەیەکی کرد دەبوو لاشەی کووژراوەکانی شاردبایەتەوە. چێژم دەبینی لە بینینی کارەکانی، بەڵام پیاوێك لاشەکانی بینی و دەستبەجێ ڕایکرد تا بەوانی تر بڵێت نەمتوانی ڕێگەی بدەم ئەو کارە بکات، بۆیە هەر زوو فیشەکم پێوەنا.

تەقە لەنێوانمان دەستی پێکرد، نەمدەزانی ئەلهاجی لە کوێیە پاش ماوەیەك لەبەر دەمم قووت بووەوە، خەریك بوو بیکوژم، بەڵام هەر زوو درکم بە دەموچاوە بە قوڕ سواغ دراوەکەی کرد. دەستمان کرد بە کارەکانمان تەنها فیشەکێکمان بە زیادە نەڕۆیشت. جگە لەوە، قەبارەمان یارمەتی زۆری دەداین، لەبەرئەوەی بچووك بووین بە ئاسانی لەپشت دەوەنەکانەوە

خۆمان دەشاردەوە و تەقەمان لەو پیاوانە دەکرد کە نەیاندەزانی ئەو فیشەکانە لە کوێوە سەرچاوە دەگرن. چووینە ناو گوندەکەوە هەموو فیشەکەکانمان بەتاڵ کردەوە و هەموویانمان لەناوبردن، بەم جۆرە دەستمان بەسەر گوندەکەدا دەگرت، بەڵام لە کۆتاییدا بینیمان هیچ کەس لە گوندەکە نەماوە تا کەلوپەلەکانیان پێ بگوێزینەوە. کانییێ و مۆریبا گەڕانەوە بۆ گوندەکە و چەکی پیاوە مردووەکانیان لەگەڵ خۆیان برد کە هێشتا توونەد گرتبوویان. ئێمە چاوەڕێ بووین. چاودێریی دەوروبەری گوندەکەمان دەکرد و کەمێك خواردەمەنی و دەرمانمان بەکارهێنا. پاش دوو ڕۆژ مۆریبا و کانییێ و گادافی و چەند سەربازێکی تر گەڕانەوە، چەند مەدەنییەکیشیان بۆ هەڵگرتنی کەلوپەلەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

گادافی پیرۆزبایی لێکردین "کەلوپەل و پێویستییەکان بۆ چەند مانگێك بەشمان دەکات. دەستتان خۆش بێت کوڕینە کارێکی باشتان کردووە".

سڵاومان لێکرد و گەڕاینەوە. بەهۆی ئەو هێرشەی ئەمجارەمان ئەلهاجی نازناوی (ڕامبۆی بچووك)ی پێ بەخشرا. ئیتر لەوکاتەوە هەموو هەوڵێکی دەدا تا ئەو نازناوەی بەردەوام بێت. من نازناوی (ماری سەوز)م پێ بەخشرا، چونکە وەك مار خۆم حەشاردەدا و لەناکاو بێ ئەوەی کەس هەست بکات دەستم بەسەر گوندەکەدا دەگرت. جاباتی ئەم نازناوەی پێ بەخشیم "تۆ بە سیما و ڕووخسارتدا کەسێکی مەترسیدار دەرناکەویت، بەڵام لەڕاستیدا مەترسیداریت، هەروەك ماری سەوز خۆت لەگەڵ سروشت تێکەڵ دەکەیت، هەرکاتێك بتەوێت، هەڵخەڵەتێنەر و کووشندەیت".

زۆر دڵم بەم نازناوە نوێیەم خۆش بوو، لەهەر هێرشێکدا هەموو هەوڵی خۆمم دەخستەگەڕ وەکو نازناوەکەم ڕەفتار بکەم.

*** 

درزێك لە بنمیچی ژوورەکەدا هەبوو، بە ئاستەم گوێم لە دەنگە گڕەکەی ئەفسەرەکە و پێکەنینە خێراکانی پەرستارەکە بوو. سەیری لای ئەوانم کرد، پەرستارەکە زەردەخەنەیەکی پانوپۆڕی لەسەر لێو بوو، وا پێدەچوو نووکتەی ئەفسەرەکەی پێخۆش بێت.

هەستامە سەرپێ و ڕۆیشتم بەرەو دەرەوەی نەخۆشخانەکە. پەرستارەکە بەدوامدا هاواری کرد "ئاو زۆر بخۆرەوە و سبەی شەو بۆ پشکنین سەردان بکەرەوە".

ئەفسەرەکە لێی پرسیم: "ئێرەت پێ چۆنە".

بە قێزەوە سەیرێکم کرد و تفم لە زەوییەکە کرد، ئەویش شانێکی هەڵتەکاند. ئەمیش سەربازێکی ژنانی تری ناو شارە!

لە هۆڵەکەدا پیاسەم دەکرد. سەرنجم دا لە دالآنەکە دوو کوڕ یاریی تێنسیان دەکرد. خەلکەکە دەیانویست بزانن چی ڕوودەدات. هەرچەندە هەندێکمان کەمێك گەڕابووینەوە بۆ دۆخی ئاسایی بەبێ دەرمانی بێهۆشکەر. هەندێجار بوورانەوە، یان ڕشانەوەمان لەگەڵدا بوو، بەلآم هەموو ئەمانە کۆتاییان پێهات. ئێستا کە ماوەی دوو مانگە لێرەین، کاتمان هەیە بۆ بیرکردنەوە. ئێستا گرێ توونەدەکانی ماوەی دوو ساڵی جەنگ بەرەو کرانەوە دەچن.

هەرکات بەلووعەکانم دەکردەوە هەستم دەکرد خوێن خووڕەی دێ بۆ ناو حەوزەکە، بۆ ماوەیەك چاوم تێدەبڕی تا دەبوو بە ئـاو، پاشـان دەمخـواردەوە، یان خۆمم پێ دەشت. کوڕەکان هەنـدێ جـار بـە هۆڵەکـەدا ڕایانـدەکرد و هاواریان دەکرد "یاخیبووەکان هاتن..." بـڕێ جـار منداڵـەکان لای چـەند بەردێکەوە دەگریان و دەیانوت ئەو بەردانە خێزانە مردووەکانیانن.

هەندێ جار هێرشمان دەکردە سەر ستافەکان و توونـد دەمانبەسـتنەوە. پرســیارمان دەربــارەی ڕێوشــوێنی ســوپاکانیان دەکــرد. هــەموو پێداویستییەکی خوێندنگەمان لە پێنووس و پەرتووك پێدرابوو. لە کاژێر ۱۰:۰۰ی بەیانی تا ۱۲ی نیـوەڕۆ هـەموو هـەینی و شـەممەیەك وانـەمان دەخوێنـد. هەرچـیمان پێـدەدرا دەمانسـووتاند. بـۆ ڕۆژی دواتـر هـەمان کەلوپـەلیان پێـدەداین، دووبـارە دەمانسـووتاندن. سـتافەکان هەربـەوە ڕادەگەیشتن کەلوپەلمان بدەنێ. ئەمجارەیان نـەیانوت "ئەمـە هەڵـەی ئێـوە نییە". وەکو هەموو جارەکانی تر کە پێیان دەوتین.

دوا نیوەڕۆیەك کەلوپەلەکانیان لـە داڵانەکـە بـۆ دانـابووین. مـامبو پێشنیاری کرد ئەو کەلوپەلانە بفرۆشینەوە. هەندێك لە کوڕەکـان وتیـان: "کێ شت لە ئێمە دەکڕێت؟ هەموویان لێمان دەترسن". مامبو کوڕەکـانی دڵنیا کردەوە "دەتـوانین بازرگانێـك بدۆزینـەوە کـە مـەیلی لـە کاروبـار هەبێت".

شتەکانمان خستە ناو جانتاکان و هـەر شـەشمان چـووینە دووکـانێکی نزیك لە خانەکە. شتەکانمان فرۆشت بە پیاوێك پێی وتین "بەلامەوە گرنگ نییە. دزیوتانە، یان نـا. ئێـوە شـتومەکتان هەیـە، منـیش پـارە. ئەمـە

کاسپییه". مامبو به زەردەخەنەوە پارەکەی ژمارد و لە لووتی هەموومانی نزیك کرەوە تا بۆنی بکەین "ئەمە پارەیەکی چاکە" مامبو ئەمــەی وت و بەڕاکردن گەڕاینەوە بۆ خانەکە، تا پێش کاتی نانی نیوەڕۆ لەوێ ئامادەبین.

دوای نــانخواردن مــامبو دەســتبەجێ بەشــە پــارەی هەریەکــەمانی بەسەرماندا دابەشکرد. هۆڵەکە پڕ بوو لە دەنگی ئێمە، هەرکەســە باســی پلانی خۆی دەکرد کە چی لە پارەکەی دەکات. ئەمە زۆر چێژبەخشــتر بــوو لە سووتاندنی کەلوپەلەکان. هەندێك لە کوڕەکان کۆکا کۆلا و شــیرینیان پێ کڕی. من و مامبو و ئەلهاجی بڕیارمان دا گەشتێك بــەناو پایتەختــدا بکەین. پێویست بوو ئامرازی گواستنەوە بۆ ناو شار پایدا بکەین.

ئــەو بەیانییــە بــە خێرایــی نانەکــەمان خــوارد. هەریەکــەمان بــە بیانوویەکەوە بۆی دەرچووین. من وام نیشــاندا دەچــم بــۆ نەخۆشــخانە بــۆ پشکنین. ئەلهاجی خۆی کرد بە ئاودەستخانەکە و مــامبو خــۆی کــرد بــە موبەقەکە و لە پەنجەرەکەوە ڕایکردە دەرەوە. نەماندەویســت کوڕەکــانی تــر پێمان بزانن، ئەوەك دوامانکەون و ستافەکان بــزانن. ئــەم ســیانەمان لــەو شوێنەی دیاریمان کردبوو، یەکمان بینی و لە سەرەدا بۆ پاس وەستاین.

ئەلهاجی پرسی: "لەمەوپێش سەردانی شارت کردووە؟"

وەڵامم دایەوە: "نەخێر".

-"پێش ئەوەی جەنگ رووبدات، ویستم بێمە شار و بخوێنم. بیســتبووم پایتەخت جوانە".

مــامبو وتــی: "ئێســتا بــە چــاوی خۆمــان دەیبیــنین. ئــەوە پاســەکە گەیشت".

پاسەکە گەیشت. دەنگی مۆسیقای سۆوکس دەهات، خەڵکی بەدەنگی بەرز پێکەوە دەدوان. لە دواوە دانیشتین و سەیری خانوو و باڵەخانەکانمان دەکرد، یەکێك لە پیاوەکان هەستا و دەستی کرد بە سەماکردن. مامبوش چووە ڕیزەوە هەموومان دەستمان کرد بە چەپڵە لێدان.

لە شەقامی کیسی دابەزین. خەڵکی بە هەردوولادا دەڕۆیشتن و سەرقاڵی ژیانی ڕۆژانەیان بوون، وەکو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت لە شارەکە. هەرئەوەندەی نەبرد ئێمەش تێکەڵیان بووین.

مامبو وتی: "پێم وتن خۆش دەبێت".

ئاماژەم بۆ بینایەك کرد: "سەیرکەن چەند درێژە!!!"

ئەلهاجی وتی: "ئەوەیان هەر زۆر درێژە!!"

مامبو پرسیاری کرد: "چۆن دەتوانن سەرکەون؟!"

بە سەرسامییەوە سەیری ئۆتۆمبێلەکانمان دەکرد. دووکانە لوبنانییەکان پڕ خواردەمەنی بوون. مینی مارکێت لە هەموو جێیەك هەبوو. ملم ئازاری دەهات ئەوەندە سەیری بیناکانم کردبوو. خەڵکی لە هەموو لاوە دەمەقاڵەیان بوو. بەرەو درەختی لۆکە ڕۆیشتین ئەو درەختەی هێمای نەتەوەیی سیاراليۆن بوو. کاتێگ گەیشتنە بەردەم هێماکە، هەموومان دەمان داچەقاند لە گەورەیی ئەو درەختە سەرمانسووڕما. ئەو درەختەمان تەنها لە پشتی پارەدا بینیبوو. لەژێر درەختەکە وەستابووین کە لە سەنتەری شارەکەدا بوو. دەکەوتە شەقامی سیانکا ستیڤنس و ڕێگای پادیمبا. گەلاکانی تارادەیەك کەسك بوون. مامبو وتی: "کەس باوەڕمان پێ ناکات ئەگەر ئەمانەیان بۆ بگێڕینەوە".

به درێـژایی ئـەو ڕۆژە لـە گـەڕان بـووین سـاردەمەنی و خواردنـەوەی ڤیمتومـان کڕی. ئاستەم بوو چێژ لە ساردەمەنییەکە وەربگیرێت. هـەر زوو لەبەر تیشکی خۆردا دەتوایەوە. لەبری ئەوەی لە پسـکیتەکە بخـۆم قـۆڵ و پەنجەکانی خۆمم دەلێسایەوە. تا بـەرەو ناوەنـدی شـار نزیکبووینایەتـەوە، قەرەباڵغتر دەبوو. هیچ کەسمان نەدەناسی. هەمووکەس بە پەلـە هـەنگاوی دەنا.

ئەلهاجی و مامبو لە دوای منەوە دەڕۆیشتن و پـرس و ڕایـان بـە مـن دەکرد لەبارەی ئەوەی لە کوێوە بڕۆین، یان کەی بوەستین. هەروەك چۆن لـە سوپا من سەرپەشتیان بووم.

دەمەو ئێوارە بوو پێویست بوو بۆ نانی ئێوارە بگەڕێینەوە بۆ خانەکـە، بەڵام پارەمان پێ نەمابوو. مامبو وتی: "دەچینە ڕیزی پێشـەوە هـەر کـە گەیشتین و پاسەکە وەستا، خۆمان هەڵدەیەینە خوارەوە و ڕادەکـەین". بـە خێرایی لە ڕیزی پێشەوە دانیشتین چاومان بڕییە ئەو پیاوەی پارەکانی کـۆ دەکردەوە. کاتێك نزیکبووینەوە، پیاوەکـە پرسـی کـێ دادەبـەزێت، پاشـان بەناو پاسەکەدا دەڕۆیشت و پارەی کۆدەکردەوە، ئەوانەی دادەبەزین دەستیان هەڵدەبڕی. کاتێك گەیشتە سەرەی ئێمـە، دەسـتم کـرد بـە گیرفانمـدا وەك ئەوەی پارەکەم دەربێنم. بە خێرایی پاڵم بە پیاوەکەوە نـاو بـە پێکەنینـەوە ڕامـانکرد. پیاوەکـە بـۆ ماوەیـەك بـە دوامانـدا ڕایکـرد، بـەڵام دواتـر دەستبەردارمان بوو و گەڕایەوە.

هەموو کوڕەکان بووە هاتوهاواریان دەربـارەی هـەموو ئەوشـتانەی لـە ناوەندی شـاردا بینیبوویـان. بیناکـان... ئۆتۆمبێـل و خواردەمەنییـەکان.

ستافەکان ناچاربوون هەفتەی جارێـك گەشـتێکی ناوەنـدی شـارمان پـێ بکەن، بەڵام هێشتا بەس نەبوو بۆ ئەو کوڕانەی دەیانەویست لە یـەك جـار زیاتر سەردان بکەن.

نازانم چی ڕوویدا، بـەڵام خـەڵکی چـیتر شـتومەکیان لـێ نـەدەکڕین. هەرچەندە داوای نرخێکی هەرزانترمان دەکرد، بەڵام کەڵکی نـەبوو. لەبـەر ئەوەی پارەمان نەبوو ناچار بووین نەچین بۆ ناوەندی شـار تـەنها هەفتـەی جارێك نەبێت. بۆ ئەم مەبەستەش پێویست بوو بەشداری وانەکان بین.

خوێندگەیەکی نافەرمی بوو. بۆ وانەکانی بیرکاری فێری کۆکردنـەوە و لێکدان و دابەشی درێژ دەبووین. بـۆ وانـەی ئینگلیـزی فێـری نووسـین و خوێندنەوەی وشەکان دەبووین و هەندێك جار مامۆستا چیرۆکی بە دەنگی بەرز دەخوێندەوە و ئێمەش دەماننووسـی، ئەمە تەنها بۆ بیرخسـتنەوە بـوو. زۆر گرنگیمان بە وانەکان نەدەدا، تەنها دەمانویست گەشتی هەفتانـەمان هەبێت. لە پۆلدا شەڕمان دەکـرد و دەسـتی یـەکترمان بـە پێنووسـەکان بریندار دەکرد. مامۆستاکە بـەردەوام بـوو، ئێمـەش بـە ناچـاری گوێمـان دەگـرت. پاشـان باسـی کەشـتییەکانمان دەکـرد کـە لـە بەنـداوی کـرۆ بینیبوومانن، یان هەلیکۆپتەرەکانی شەقامی لایـت فـووت بوەسـتن. لـە کۆتایی وانەکەدا مامۆستاکە دەیوت: "هەڵەی ئێوە نییە کە نـاتوانن بـە هێمنی لە جێی خۆتان دابنیشن، پاش ماوەیەك فێر دەبـن". بەمـە تـووڕە دەبووین. تا مامۆستاکە دەچووە دەرەوە پێنووسمان تێدەگرت.

پاشان نانی نیوەڕۆمان دەخوارد و سەرقاڵی یاریی تێنس، یان فووتبـۆڵ دەبووین. هەنـدێك جـار کوڕەکـان لەخـەو ڕادەپـەڕین هاواریـان دەکـرد و

ئارەقیان دەردەدا و بەسەری خۆیاندا دەکێشا تا ئەو وێنانە لە مێشکی خۆیان دەرکەن، کە هێشتا بە دوایانەوە بوون، هەرچەندە بەخەبەریش بوون.

هەندێکی تریان شەوان هەڵدەستان و هەرکەسێك لایانەوە بوایە هەوڵیان دەدا بیخنکێنن. پاش ئەوەی دوور دەخرانەوە بە هۆڵەکەدا ڕایان دەکرد. ستافەکان هەمیشە لە چاودێریدا بوون. زۆربەی جار لە چیمەنی مەیدانی فووتبۆڵەکە هەڵدەستان لە خەو خۆشیان نەیاندەزانی چۆن گەیشتوونەتە ئەوێ. چەند مانگێکی خایاند تا فێربووم بێ کاریگەری دەرمان بخەوم، بەڵام دوای کاژێرێك خەبەرم دەبووەوە، پاش ئەوەی خەوم بەو چەکدارە بێ ڕووخسارانەوە دەبینی کە بە خەنجەرەکانیان زیگزاکی قورگمیان هەڵدەدڕی. هەستم بە ئازاری قورگم دەکرد، لە خەو ڕادەپەڕیم و چەند بۆکسێکم بەهەوادا دەکێشا، پاشان دەچوومە گۆڕەپانی فووتبۆڵ و پیاسەم دەکرد و باوەشم بە ئەژنۆکانمدا دەکرد و زۆرم لە خۆم دەکرد یادگاری منداڵیم بیرکەوێتەوە، بەڵام نەمدەتوانی. یادگاری ماوەی دووساڵی جەنگ ببووە بەربەست. پێویست بوو تێکیبشکێنم تا چەند چرکەیەکی پێش جەنگم بێتەوە یاد.

***

وەرزی بارانبارین لە سیالیۆن لەنێوان مانگی پێنج و دە دایە. باران لە مانگی حەوت و هەشت و نۆ زۆر بەلێزمە دەبارێت.

سوپا ئەو یەکەیەی لەدەست دا کە من سەرپەرشتیم دەکرد. کاتی جەنگ مۆریبا جێی هێشتین. لەبن دیوارێکدا جێمانهێشت، خوێن لەدەمی

دەهاتــە دەرەوە. زۆر کاتمــان نــەبوو بــیری لــێ بکەینــەوە. لاواندنــەوە بــۆ مردووەکان بەشێك نەبوو لە پرۆسەی هەوڵدان بـۆ مانـەوە بـە زینـدوویی. پاشان لە دارستانەکە بەدوای بارەگای نوێدا دەگەڕاین پـێش ئـەوەی وەرزی بارانبارین دەست پێ بکات، بەڵام دەستمان نەکـەوت، زۆربـەی گونـدەکان نەشـیاو بـوون، چـونکە سـووتاندبوومانن، یـان چـەکداری تـر وێرانیـان کردبوون. جاباتی زۆر دڵتەنگ بوو فەرمانی کرد بەردەوام دەبـین لەگـەڕان تا شوێنێکی گونجاومان دەست دەکەوێت.

سەرەتا باران دایدەکرد و دەوەستا. پاش ماوەیەك بە بەردەوامی دایکـرد لەژێر گەڵای درەختەکان دەوەستاین، بەڵام بارانەکەی ئەوەندە بـەخوڕ بـوو تەنانەت گەڵاکانیش توانای بەرگرییان نەبوو.

بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك بـەناو ئـەو دارسـتانە شـێدارەدا بـەڕێگاوە بووین. بەیانییەکیان بارانێکی زۆر باری، لەناکاو تەقەمان بەرەو ڕوو کـرا، ئــار پــی جییــەکان لــەکار کــەوتبوون، بۆیــە دەســتبەجێ گەڕاینــەوە. چەکدارەکان زۆر دوامان نەکەوتن. جاباتی فەرمانی کـرد دووبـارە گـرووپ دروسـت بکەینـەوە و دوای چـەکدارەکان بکـەوین. جابـاتی وتـی: "گـەر دوایانکـەوین بـەرەو بارەگاکانیـان دەمانبـەن"، ئـەو ڕۆژە لەبـەر بارانـدا دەجەنگاین. بارانیش پەیتا پەیتا خوێناوی سەر گەڵاکانی دەشتەوە.

دەمەو ئێوارە چەکدارەکان کشانەوە. یەکێکیان بە بریندراری جێهێشـت. جاباتی پرسی بارەگاکەیان لە کوێیــە، بــەڵام وەڵامــی نــەبوو. یـەکێك لــە کوڕەکان بە تەنافێك ملی ڕاکیشا، بەڵام هــەر زوو گیــانی دەرچـوو. شـەو داهات چەکدارەکان لە دەوروبەری بارەگاکانیان ئامادەی جەنگ بوون چـیتر

نەکشانەوە جاباتی فەرمانی کرد: "تەقە بکەن و ڕاکەن" بووینە دوو دەستە. دەستەی یەکەم تەقەیان دەکرد و وا خۆیان دەردەخست کە دەکشێنەوە. کاتێک چەکدارەکان دوایان دەکەوتن، دەستەی دووەم بە هێواشی هەڵدەستانە سەرپێ و دوایان دەکەوتن. ئەم تاکتیکەمان چەند جارێك دووبارەکردەوە تا یاخیبووەکانمان بێ هێز کرد. بۆ بەیانی چووینە ناو گوندەکەوە، ئەوانەی نەیاندەویست گوندەکە چۆڵ بکەن کوشتمانن و نزیکەی هەشت پیاومان دەستگیر کرد، دەست و قاچیانمان بەستەوە و لەبەر بارانەکەدا ڕامانگرتن. ئاگر و تەختەی زۆر لە گوندەکەدا هەبوون کە یاخیبووەکان بۆ وەرزی بارانبارین ئامادەیان کردبوو، بەڵام ئێستا هەموو شت لەژێر دەستی ئێمەدا بوو. جلی وشکمان لەبەرکرد و دەوری ئاگرەکەمان دا. چەکەکەم دانا و دڵخۆش بووم دواجار لانەیەکمان دۆزییەوە. پێڵاوەکانمان وشککردەوە و پەنجەی قاچەکانم لە ئاگرەکە نزیککردەوە. سەرنجم دا زەرد هەڵگەڕاو و ڕزیون.

چەند خولەکێك لە گوندەکە بووین، دووبارە هێرشمان کرایەوە سەر. بە تووڕەییەوە سەیری یەکمان کرد و چەکەکانمان پڕ فیشەك کرد تا ئەمجارە بە یەکجاری لەناویان بەرین. بە درێژایی شە و و ڕۆژی دواتریش لە جەنگدا بووین هیچ لایەك وا بە ئاسانی دەستبەرداری گوندەکە نەدەبوون. ژمارەیەکی زۆرمان لێکوشتن و هەندێکمان لێ دەستگیرکردن. ئەوانی تریش بۆ ناو دارستانە سارد و باراناوییەکە ڕایانکرد. ئەوەندە تووڕە بووین لە دەستگیرکراوەکان نەماندەویست بیانکوژین. لەبری ئەوە بڕیارمان دا ئازاریان بدەین.

جاباتی وتی: "گەر بیانکوژین، فیشەکمان لەدەست دەردەچێت".

بۆیە فەرمانمان پێدەکردن تا چاڵ هەڵکەنن و گۆڕ بۆ خۆیان ئامادە بکەن لەژێر خانۆچکەکاندا دادەنیشتین ماریجواناکمان دەکێشا و سەیرمان دەکردن لەبەر باراندا چاڵ هەڵدەکەنن. جار جار فیشەکمان دەتەقاند تا خێراتر هەڵیکەنن. پاش تەواوبوونیان دەمانبەستنەوە و قاچیانمان بە خەنجەر قاش دەکرد، کاتێك هاواریان دەکرد بە شەق دەکەوتینە لێدانیان تا بێدەنگ بن، پاشان هەر پیاوێکمان دەخستە ناو چاڵەکەی خۆی و قووڕاومان دەکردن بەسەریدا، هەرچەندە دەیانویست بێنەدەرەوە، بەڵام زیاتر قوورمان پیایاندا دەکرد و هەر چەکەکانمانیان دەبینی خۆیان دەگەڕانەوە و بە چاوە غەمگینەکانیان لێیان دەڕوانین.

بە هەموو هێزی خۆیان دەیانویست بچنەدەرەوە گوێم لێیان بوو نەیاندەتوانی هەناسە بدەن، پاش ماوەیەك بێدەنگ دەبوون. یەکێك لە سەربازەکان وتی: "بەلایەنی کەمەوە نێژراون". هەموومان دەستمان کرد بە پێکەنین.

کاتێك گەڕامەوە بۆ لای ئاگرەکە، لەشم هەمووی برینی سەخت بوو. ڕەنگە برینی ئەو فیشەکانە بووبێت کە بەلامدا تێپەڕیبوون. ئەلهاجی لە بەستنی برینەکاندا یارمەتیدام. منیش پێکەنینم بە ژمارەی برینەکان دەهات کاتێك ئەلهاجی دەیانژماردن.

***

بۆ بەیانییەکەی یەکێك لە ستافەکان پێی دەوتم: "ئەمــە هەڵــەی تــۆ نییــە، بەڕاســتی هەڵــەی تــۆ نییــە، هــەرزوو ڕزگــارت دەبێــت"، پاشــان دەیبردمەوە ناو هۆڵەکە.

## حەڤدە

لەوکاتەوەی پەرستارەکە قسەی لەگەڵ ئەفسەرە ژنانییەکەی ناو شار کرد، من چیتر سەردانی نەخۆشخانەکەم نەکردەوە. پەرستارەکەش چیتر هەوڵی نەدا بمهێنێتەوە بۆ پشکنین، بەلاّم دوانیوەڕۆیەك سەیری یاریی تێنسمان دەکرد هەموو ئەندامانی خانەکە ئامادە بوون. یەکێك لە دواوە بە شانیدا کێشام. ئاوڕمدایەوە پەرستارەکە بوو. ئەوە یەکەمین جارم بوو ڕاستەوخۆ لێی بڕوانم. دانە سپییەکانی جیاواز لە پێستە ڕەشە بریقەدارەکەی دەیاننواند. جلێکی سپی و کلاّوێکی سپی لەسەردا بوو. کاتێك زەردەخەنەی دەکرد ڕووخساری بە تەنها پڕ جوانی نەدەبوو، بەڵکو پڕ سیحر دەینواند. بالاّبەرز و جووتێك چاوی گەورەی قاوەی هەبوو. بووتڵێك کۆکا کۆلای دایە دەستم "هەرکاتێك بتەوێت دەتوانی سەردانم بکەیت". بووتڵەکە سارد بوو. سەرم سووڕما، چوومە دەرەوە و لەگەڵ ئەلهاجی لەسەر بەردێك خواردمەوە.

ئەلهاجی بە گاڵتەوە پێی وتم: "دیارە تۆی چووە بە دڵدا"، هیچم نەوت.

پاشان پرسی: "ئەی تۆ بەدڵت نییە؟"

"نازانم ئەو تەمەنی لە من گەورەترە. جگە لەوە پەرستاری ئێمەیە".

ئەلهاجی سەری لەقاند: "مەبەستت ئەوەیە لە ژن دەترسیت".

ئەلهاجی بە قسەکەی مــن پێدەکــەنی. پــێم وت: "بــاوەڕ ناکــەم ئــەو هەستی بەو شێوەیە بێت کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە".

پاش ئەوەی خواردنەوەکەمان تەواو کرد. ئەلهاجی جێی هێشــتم بڕیــارم دا بڕۆم بۆ نەخۆشخانەکە. چــوومە ژوورەوە لــەوێ پەرســتارەکەم بــینی بــە تەلەفۆن قسەی دەکرد، ئاماژەی بۆکردم بێمە ژوورەوە.

زەردەخەنەیەکی کرد و دڵنیای کردمەوە بۆ هاتنی من بوو نــەك لەبــەر تەلەفۆنەکەی. سەرنجی دیوارەکەمۆدا ناوی هەموو کوڕەکان هەڵواسرابوو و لە تەنیشتیانەوە هێمایەك هەبوو تا بزانرێت ئەمانە بەشداری پشــکنینیان کردووە. لە تەنیشت ناوەکەی من هیچ هێمایەك نەبوو. پەرستارەکە پارچــە کاغەزەکەی لێکردەوەو خســتییە نــاو دۆلابــی ژێــر تەلەفۆنەکــە، پاشــان کوورسییەکەی لیّ نزیککردمەوە.

-"ئێستا پێم بڵێ ناوت چییە؟"

-"گەر ناوم دەزانیت، بۆ پرســیار دەکــەیت؟" بــە تووڕەییــەوە وەڵامــم دایەوە.

-"ڕاستە دەزانم، بەڵام حەز دەکەم خۆت پێم بڵێیت". پێــداگری کــرد و چاوەکانی زەق کردەوە.

-"باشە... باشە. ئیشمایل...".

سەری لەقاند و وتی: "ناوێکی جوانە. من نــاوم ئیســتەرە، مــن و تــۆ پێویستە ببینە هاوڕێ".

"دڵنیایت دەتەوێت ببیتە هاوڕێم؟"

کەمێك بیری کردەوە و وتی: "ڕەنگە نەمەوێت".

ماوەیەك بێدەنگ بووم. نەمدەزانی چی بڵێم. لەگەڵ ئەوەشدا نەمەویست متمانە بە هیچ کەسێك بکەم، من وا ڕاهاتبووم بە تەنها لە هەوڵی مانەوەدا بم. تەنیایم پێ باشتر بوو، چونکە مانەوەی بۆ ئاسانتر دەکردم. خەڵکانی وەکو جاباتی کە گوێڕایەڵی بووم و متمانەم پێکرد وای لێکردم گومانم لە هەموو کەس هەبێت، بەتایبەتی گەورەکان. بە بڕوای من خەڵکی تەنها بۆ سوودوەرگرتن لە یەکدی دەبوونە هاوڕێ، بۆیە پەرستارەکەم پشتگوێخست و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم کرد.

"من پەرستاری تۆم. گەر دەتەوێت ببینە هاوڕێ، هەرکاتێك بتەوێت دەتوانیت قسەم لەگەڵ بکەیت و پرسیارم لێ بکەیت، بەڵام پێش هەموو شتێك دەبێت متمانەت پێ بکەم".

ئەمەی وت و زەردەخەنەیەك گرتمی، چونکە منیش بیرم لە هەمان شت دەکردەوە. تەواو سەرسام بوو بە زەردەخەنە کتوپڕەکەم.

"زەردەخەنەیەکی جوانت هەیە پێویستە زیاتر پێ بکەنیت". ئەمەی وت و دەستبەجێ ڕووخسارمم توندوتیژ کردەوە.

"هیچ شتێکت پێویست نییە لە شار؟"وەڵامم نەدایەوە.

پاشان وتی: "ئەمە بەسە بۆ ئەمڕۆ".

چەند ڕۆژێك دوای یەکەمین گفتوگۆ، ئیستەر دیارییەکی بۆم کڕی. من لە گۆڕەپانەکە سەیری کوڕەکانم دەکرد کە تۆڕی ڤۆلیبۆڵەکەیان دەخولاندەوە و دەیانبردە حەوشەکە. ئەلهاجی لە نەخۆشخانە لە پشکنینی ئەو ڕۆژە گەڕایەوە و پێی وتم، ئیستەر دەیەوێت بتبینێت من نەمدەویست بڕۆم، یارییەکەم زیاتر لا مەبەست بوو. ئەلهاجی بە پاڵ پێوەنان و پەل

ڕاکێشان بردمییە بەردەم دەرگای چوونە ژوورەوە و بەزۆر بردمییە ژوورەوە و خۆی بە قاقا پێکەنینەوە ڕایکرد. هەستامەوە سەرپێ ئیستەر لەسەر کوورسییەك لە پشت مێزەکەی خۆیەوە دانیشتبوو بزەی دەکرد.

"ئەلهاجی پێی وتم دەتەوێت ببینیت".

پاکەتێکی پێچراوەی فڕێدایە بەردەمم. سەیرم کرد، دەبێت چی تێدا بێت ئەی دەبێت لەبەرچی ئەم پاکەتەی بۆ هێنابێتم، ئەویش چاوەڕێی دەکرد بیکەمەوە. کردمەوە ئامێرێکی ئیشپێکردنی کاسێت لەگەڵ کاسێتێکی ڕاپ بوو. لە خۆشیدا بازم هەڵدا و باوەشم پێیدا کرد، بەڵام هەر زوو دڵخۆشییەکەم شاردەوە و بە توندییەوە وتم: "بۆ ئەم شتانەت بۆ هێناوم. وامزانی من و تۆ هاوڕێ نین. جگە لەوە تۆ چۆن دەزانیت من حەزم لە گۆرانی ڕاپە؟"

"تکایە دانیشە". پاکەتەکەی لێ وەرگرتم، باترییەکانی خستە کاسێتەکەوە و ئیشی پێی کرد ئەو گۆرانییەی بەلامەوە خۆشترین بوو هاتە بەرگوێم. دەستم کرد بە ڕاوەشاندی سەرم. پێبیستەکانی لە گوێم لابرد و وتی: "پێویستە پشکنینت بۆ بکەم کاتێك گوێ لە گۆرانی دەگریت"، ڕازی بووم. تیشێرتەکەم داکەند و خۆمم کێشا. پاشان زمانی پشکنیم و ڕووناکی لە چاوەکانم دا. بەلامەوە گرنگ نەبوو لەبەر گۆرانییەکە زۆر بە وردی گوێم لە هەموو وشەکان دەگرت. گەیشتە سەر ئەژنۆکانم برینەکانم لەسەر ئەژنۆی لای چەپم بەدیارکەوت، دووبارە پێ بیستەکانی لە گوێم لابرد "ئەمانە چیین؟"

-"جێی فیشەکە".

غەم ڕووخساری داگرت. بە دەنگی لەرزۆکەوە، وتی: "دەبێت پێم بڵێیت چی ڕوویداوە تا منیش بتوانم چارەسەرت بۆ بکەم".

سەرەتا نەمدەویست، بەڵام ئەو پێی وتم تەنها ڕێگە کە بتوانێت بە باشترین شێوە چارەسەرم بکات، ئەوەیە هەموو شت بە وردی بزانێت، بۆ وێنە بزانێت چۆن جێ فیشەکەکان تیمار کراون. منیش هەموو شتێکم وت. نەک لەبەر ئەوەی دەمەویست. لەبەر ئەوە ئەگەر ئەو چیرۆکە سامناکەی ڕابردووم ببیستێت ڕەنگە کەمێک لێم بترسێت و چیتر پرسیارم لێ نەکات. کاتێک قسەم بۆ دەکرد چاوەکانی تێبڕیبووم. منیش لەگەڵ گێڕانەوەی ڕابردووم سەرم دادەژەند.

دووەم وشکترین وەرزی یەکێک لە ساڵانی جەنگ بوو. ڕۆژێک پێویستمان بە خواردەمەنی و چەک بوو. بۆیە وەک هەموو جارێک بڕیاردرا هێرش بکەینە سەر گوندێک. سەرەتا من لەگەڵ سوپاکەمدا بۆ سیخوڕی ڕۆیشتم. بە درێژایی ڕۆژ چاودێریی گوندەکەمان دەکرد و ژمارەی پیاوەکانیان لە ئێمە زیاتر بوون. چەک و تەقەمەنییان لە خۆیان بەستبوو. چەکەکانیان تازە بوون. دڵنیا نەبووم یاخیبوو بن، یان نا، ژمارەیان کەمتر بوون لەوانەی پێشتر هێرشمان کردبوونە سەر. هەندێکیان جلی مەدەنی و ئەوانی تر سەربازییان لەبەردا بوو. گەڕاینەوە سەربازگەکە و بە جاباتیم ڕاگەیاند. دەستبەجێ بەرەو گوندەکە ڕۆیشتین نزیکەی سێ ڕۆژ ڕێگا بوو. پێویست بوو گوندەکەی خۆمان باش بپارێزین، ئەوانەی لەوێ مابوونەوە لەبری ئەوەی لەگەڵمان بێن و کەلوپەل بگوێزنەوە، بارەگای نوێیان دروستکرد. ئەو شەوە گوندەکەمان جێهێشت، بە خێرایی دەڕۆیشتین و

جاربەجار ڕامان دەکرد. لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا، هەر ڕۆژەو جارێك وچانمان دەدا، خواردن و خواردنەوە و ماددەی بێهۆشکەر. تەقەمەنی و ڕەشاشمان پێبوو. هەرکەسە دوو چەکی هەڵگرتبوو. یەکێکیان بە پشتمانەوە و ئەوی تریان بە دەستمانەوە. تەنها دوو پیاو لە سەربازگەکە بەجێمابوون بۆ پارێزگاری. سێیەم ڕۆژ جاباتی ڕێگەی داین زیاتر لە دوو ڕۆژی پێشوو پشوو بدەین. پاشان تا ئێوارە بەڕێوە بووین تا گەیشتینە گوندەکە.

درەختی مانگۆ و پرتەقاڵ و گواڤای زۆر لە گوندەکە هەبوو، پێدەچوو پێشتر کێڵگە بووبێت، دەورمان لێدا و چاوەڕێی فەرمانی جاباتیمان کرد.

خۆمان حەشاردا. هەستمان کرد گوندەکە چۆڵە. من و جاباتی بەسەرسوورمانەوە سەیری یەکترمان کرد. بە چرپە پێم وت کە گوندەکە سێ ڕۆژ لەمەوپێش پڕ خەڵك بووە. بۆ ماوەیەکی تر چاوەڕێ بووین. سەگەکان دەوەڕین و بە گوندەکەدا ڕاکەڕاکیان بوو. کاژێرێك تێپەڕی. پێنج چەکدار هاتنەوە چەند سەتڵێکیان لە دالانی یەکێك لە خانووەکاندا لەگەڵ خۆیان برد بۆ ڕووبارەکە. شتێکی نامۆمان بەدی کرد چەند فیشەکێك لە دوامانەوە تەقێندران. ئەو کات تێگەیشتین یاخیبووەکان فێڵیان لێکردووین، دەیانەوێت بمانخەنە ناو گوندەکەوە تا لە مەودایەکی کراوەدا لەگەڵمان بجەنگن. بەدرێژایی شەو لە جەنگدا بووین. ناچاربووین بچینە ناو گوندەکە، هەر ئەو جێیەی ئەوان دەیانویست بچین. پێنج کەس لە ئێمە کوژران. یاخیبووەکانیش هێرشیان دەکردینە سەر. چووبوونە سەر درەختەکان و وەك باران فیشەك دەباری. سوپاکەم بەهەموو لایەکی گوندەکەدا پەرتەوازە بوون و بە خۆمەڵازانەوە لەپشت خانووەکانەوە

ڕامانکرد، پێویست بوو بە زووترین کات هەڵبێین پێش ئەوەی زۆر درەنگ ببێت. پێش هەموو شت پێویست بوو ئەو یاخیبووانەی لەسەر درەختەکانن بیانکوژین. هەموو لقی درەختەکانمان گوللەباران کرد ئەوانەی دەستبەجێ نەدەمردن، تەقەمان لێدەکردنەوە پێش ئەوەی بکەونە سەر زەوییەکە. پێویست بوو فیشەك بە هەموولایەکدا بتەقێنرێت تا ئەوانەی دەوروبەرمان هەموویان مردن، جگە لەوە پێویستمان بە جێیەك بوو تا لێی دەرچین. دووبارە جاباتی کۆیکردینەوە و پێی وتین پێویستە بەردەوام بین لە جەنگ ئەگینا ناچار دەبین بەدوای گوندێکی تردا بگەڕێین.

هەندێکمان بریندار ببوون، بەڵام ئەوەندە خراپ نەبوو کە نەتوانین بجەنگن. یەکێك لەوانە من بووم، چەندین جێی برینی فیشەك بە جەستەمەوە بوو، بەڵام گوێم پێ نەدەدا. یەکەمین کارمان بریتی بوو لە کۆکردنەوەی چەکی مردووەکان. دووبارە هێرشمان کردەوە تا گوندەکە بەتەواوی کەوتە ژێر دەستمان. بۆ ماوەی بیستوچوار کاژێر بە بەردەوامی دەکشاینەوە و دووبارە هێرشمان دەکردەوە، چەکی ئەوانەمان بەکاردەهێنا کە کوشتبوومانن. دواجار پێدەچوو گوندەکە لەژێر دەستی خۆماندا بێت، دەنگی تەقە نەما و دەوەنەکانی پشت درەختە مانگۆکان بێ جووڵە بوون.

لە خانۆچکەکەدا جانتاکەی پشتم پڕ تەقەمەنی کردەوە، فیشەك وەك و باران دووبارە داباری بەسەرماندا. سێ جار فیشەك لە قاچی دام، جاری سێیەم لە قاچمدا گیربوو. نەمدەتوانی بڕۆم لەسەر زەوییەکە ڕاکشام تەقەم لەو لایە دەکرد کە فیشەکی لێوە دەردەپەڕی.

هەستم بە لەرەیەك كرد لە بڕبڕەی پشتمدا، بەڵام ئەوەندە دەرمانم پێدرابوو هەستم بە ئازار نەدەكرد، هەرچەندە قاچم ئاوسابوو. پزیشكە سەربازییەكە دەستبەجێ بردمییە یەكێك لە خانووەكان و هەوڵی دا فیشەكە دەربێنێت، هەركات دەستی بۆ برینەكەم دەبرد، دەمبینی پەنجەكانی لە خوێندا سوور ببوون.

ناوچەوانمی بە پارچە پەڕۆیەكی تەڕ سڕی. چاوەكانم قورستر بوون و لەهۆش خۆم چووم. ڕۆژی دواتر هۆشم هاتەوە، نازانم چی ڕوویدابوو، هەستم دەكرد دەمارەكانی قاچم بڕاون و بزمار كوتراوەتەوە بە ئێسقانەكانمدا. ئەوەندەم ئازار هەبوو دەنگم دەرنەدەهات بگریم. بۆیە بە هێواشی فرمێسكەكان بە ڕووخسارمدا دەهاتنە خوارەوە. بنمیچە لە پووش دروستكراوەكە بە بەرچاومدا لێڵ ببوو، چاوەكانم زۆریان لەخۆیان دەكرد تا ئەو جێیە بناسنەوە كە لێی بووم. گوندەكە بێدەنگیی لێنیشتبوو. تێگەیشتم چەكدارەكان ڕاونراون. ئەوە كەمێك دڵخۆشی كردم. دووبارە دەمارەكانم گرژ بوون، لەبەر ئازار لێوی خۆمم دەگەست. پێڵووی چاوە قورسەكانم لێكنا. توند قەراغی جێخەوە تەختەكەم گرت. دەنگی پێی چەند كەسێكم هاتە بەرگوێ كە دەهاتنە خانووەكەوە، هەر زوو ناسیمنەوە، دكتۆرە سەربازییەكە هەناسەیەكی نائومێدیی هەڵكێشا "ئەم كوڕە ئازار دەكێشێت و هیچ دەرمانێكمان لەبەر دەست نییە تا چارەسەری بكەم. هەموو دەرمانەكان لە گوندەكەی ترە، ماوەی شەش ڕۆژی دەوێت تا یەكێك دەرمانەكان دەهێنێت و دەگەڕێتەوە. تا ئەو كاتە دەمرێت". جاباتی وتی:

"پێویستە بیبەینەوە بۆ سەربازگەکەی تر. هەرچیت لەدەست دێت بیکە، هەرچۆنێك بێت دەبێت ئەم کوڕە زیندوو بێت". پاشان چووە دەرەوە.

"بەڵێ گەورەم" ئەمجارەیان هەناسەیەکی قووڵتری هەڵمژی بە هێواشی چاوەکانم کردنەوە و بە ڕوونی هەموو شتێکم دەبینی، سەیری ڕووخسارە نارەقاوییەکەیم کرد و هەوڵم دا بزەیەك بە ڕوویدا بکەم. پاش ئەوەی گوێم لە قسەکانیان بوو، سوێندم خوارد دوای چاکبوونەوەم بە هەموو توانامەوە بجەنگم و هەموو شتێك بکەم بۆ سەرخستنی سوپاکەم. دکتۆرەکە لە تەنیشت جێخەوەکەمەوە دانیشت و سەیری قاچمی کرد و بە میهرەبانییەوە پێی وتم: "بە زووترین کات چارەسەر دەکرێیت. ئازا بە ئەی پیاوی بچووك".

"بەڵێ گەورەم" ویستم دەستم بەرز بکەمەوە تا سڵاوی لێ بکەم، بەڵام ئەو بە نەرمی دەستمی دانایەوە. دوو سەرباز هاتنە خانووەکەوە بە دکتۆرەکەیان وت، کە جاباتی فەرمانی کردووە من ببرێمەوە بۆ بارەگاکەی پێشوومان. لەسەر جێخەوەکە هێنایانمە خوارەوە و خستیانمە سەر جۆلانەیەك و بردیانمە دەرەوە. سەرەتا تیشکی خۆر کوێری کردم، بەڵام دواتر گەڵای درەختەکان چواردەوریان دام. لە ڕێگا چەند جارێك لە هۆش خۆم چووم و هۆشم هاتەوە، هەرکات چاوەکانم دەکردەوە، هەستم دەکرد دەنگی ئەوانەی لەگەڵم هاتبوون لە دوورەوە دەنگی دەدایەوە. هەرگەیشتینە بارەگاکە، دەستبەجێ دکتۆرەکە چارەسەری قاچمی کرد. سەرەتا دەرزییەکیان لێدام، تا ئەوکاتە نەمدەزانی لە بارەگاکە دەرزیمان هەیە. لە حاڵەتێکی وەك ئەوەی مندا نەمدەتوانی بپرسم لە هەموو ئەوانەی ڕوویان

ده‌دا. كۆكاینیان دامێ، چونكه‌ داوام ده‌كرد پاشـان ده‌رزیـیـان كـرد بـه‌ناو قاچمدا. پێش ئه‌وه‌ی كاریگه‌ری ده‌رمانه‌كه‌ ده‌ست پـێ بكـات، دكتۆره‌كـه‌ ده‌سـتی بـه‌ نه‌شـته‌رگه‌ریی كـرد. دوو سـه‌رباز قۆڵیـان گـرتم و پارچـه‌ په‌ڕۆیه‌كیان خسته‌ ده‌مه‌وه‌. دكتۆره‌كه‌ مقه‌ستێكی خسته‌ ناو قاچمه‌وه‌ و بـه‌ دوای فیشه‌كدا ده‌گه‌ڕا له‌به‌ر ئازار ده‌سه‌پاچه‌ بووم، به‌ ڕوونی هه‌سـتم بـه‌و كانزایه‌ ده‌كرد له‌ناو قاچمدا. هه‌موو ئێسقانه‌كانم هه‌ڵناوسان. لـه‌ هێكـڕا دكتۆره‌كه‌ فیشه‌كه‌كه‌ی ده‌رهێنا، ئازارێك ڕێك له‌ ناوقه‌دمـه‌وه‌ بـه‌ پشـتما هات بۆ ملم و ده‌ستبه‌جێ له‌ هۆش خۆم چووم.

بۆ ڕۆژی دوایی هۆشم هاته‌وه‌. به‌ ژووره‌كـه‌دا چـاوم گێـڕا. ده‌رمانـه‌كان كاریگـه‌رییان ده‌سـت پێكردبـوو له‌سـه‌رم. لـه‌ ته‌نیشـتمه‌وه‌ كه‌لوپـه‌لی نه‌شـته‌رگه‌رییه‌كه‌ی لـێ بـوو له‌گـه‌ڵ پارچـه‌ په‌ڕۆیـه‌ك كـه‌ لـه‌ خوێنـدا گه‌وزابوو. ئاخۆ چه‌ندم خوێن لێ ڕۆیشتبێت؟!

ده‌ستم برد بۆ قاچم و بینیم به‌ستراوه‌ته‌وه‌، بـه‌ هێواشـی خـۆم گه‌یانـده‌ ده‌ره‌وه‌، سـه‌ربازه‌كان و دكتۆره‌كـه‌ دانیشـتبوون. پرسـیم: "چـه‌كه‌كه‌م لـه‌ كوێیه‌؟"

دكتۆره‌كه‌ جی ٣یه‌كه‌ی دامێ و ده‌ستم كرد به‌ پاكردنه‌وه‌ی پاشان چه‌ند فیشه‌كێكم به‌ ئاسماندا ته‌قاند. دانیشتم و پاڵم دایه‌وه‌ به‌ دیواره‌كه‌وه‌ و هه‌ر زوو قاچم له‌بیركرد، ماریجوانام كێشا و نانم خوارد و پاشان كه‌مێك كۆكاین و براون -براونم هه‌ڵمژی. بۆ مـاوه‌ی سـێ ڕۆژ سـه‌رقاڵی ئه‌مـه‌ بـووم. تـا دووبـاره‌ گه‌ڕاینـه‌وه‌ بـۆ باره‌گـا نوێیه‌كـه‌. پـێش ئـه‌وه‌ی بـڕۆین هـه‌موو

گوندەکەمان سووتاند. فیشەکمان نا بە دیوارەکانەوە، تا ئەوانەی دوای ئێمە دێن سوود لە گوندەکە نەبینن.

سەربازەکان هەڵیانگرتم، بەڵام ئەمجارە چەکەکەم پێبوو و خۆم چاودێریی لای ڕاست و چەپم دەکرد. لە بارەگا نوێیەکە بۆ ماوەی سێ هەفتە ئەلهاجیم ڕاسپارد کارەکانم بەڕێوە ببات. خۆم بە مادەی بێهۆشکەر و پاککردنەوەی چەکەکەم سەرقاڵ کرد. هەموو کات پزیشکە سەربازییەکە برینەکەمی پاك دەکردەوە و پێی دەوتم: "زۆر بەختت هەبوو". پێم وانەبوو بەختم هەبووبێت، پێم وابوو خۆم ئازام و توانای شەڕکردنم هەیە. ئەوکات وا بیرم دەکردەوە جەنگ و شەڕکردن پەیوەندی بە مەشق و ڕاهێنانەوە هەیە، هەموو ئەمانە وایان لێدەکردم هەست بکەم لە مردن پارێزراوم. لە کۆتایی ئەو سێ هەفتەیە چەند چەکدارێکی یاخیبووەکان نزیکبوونەوە، جاباتی هەرزوو زانی. دوو سارغیم لە قاچم بەست و دوای سوپاکەم کەوتم تا هێرش بکەینە سەر یاخیبووەکان پێش ئەوەی نزیکتر ببنەوە. زۆربەیمان کووشتن و هەندێکمان دەستگیرکردن و هێنانمانەوە بۆ ناو سەربازگەکە.

جاباتی ئاماژەی بۆ دەستگیرکراوەکان کرد: "ئەمانە بەرپرسیارن لەو فیشەکەی لە قاچی تۆدا بوو، ئێستا کاتی هاتووە فێریان بکەیت جارێکی تر کاری وا دووبارە نەکەنەوە، نە بەرامبەر بە تۆ، نە هاوڕێکانت".

دڵنیا نەبووم یەکێك لەوان فیشەکی بە منەوە نابێت، بەڵام هەموو یاخیبوویەك ئەو کارە دەکات. هەموویان ڕیز کرابوون، شەش کەس دەبوون فیشەکم بە قاچی هەموویانەوە نا و جێم هێشتن تا ئازار بچێژن پاشان فیشەکم بەسەریانەوە نا، تا لە گریان بوەستن. پێش ئەوەی بیانکوژم

سەیری چاوەکانیانم دەکرد کە پاڕانەوە و هیوای مانەوەیان بە زیندوویتی تیا بەدی دەکرا، ئەوەش ئەوەندەی تر بێزار و تووڕەی دەکردم.

***

کاتێك بەسەرهاتەکەم تەواو کرد، ئیستەر فرمێسك بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە، نەیدەزانی باوەشم پیادا بکات، یان دەست بەسەرمدا بهێنێت. لە کۆتاییدا چاوەکانی تێبڕیم تا دڵنیام بکاتەوە لەوەی دەیڵێت، وتی: "تۆ تەنها کوڕێکی بچووك بوویت. هەموو ئەوانەی ڕوویانداوە هەڵەی تۆ نەبوون، هەر کات ویستت دەتوانیت قسەم بۆ بکەیت، من ئامادەم گوێت لێبگرم".

تووڕەیی گرتمی و پەشیمان بوومەوە لەوەی ئەزموونی جەنگم لای مەدەنییەك باسکردووە، ئەم ڕستەیە کە هەموو ستافەکانی ئەوێ بەکاریان دەهێنا "هەڵەی تۆ نەبووە"، هەموو کات تووڕەی دەکردم.

هەستامە سەرپێ و لە نەخۆشخانەکە چوومەدەرەوە. ئیستەر بەدوامدا هاواری کرد: "سبەینێ لە نەخۆشخانەی (کۆننەت) ناوت دەنووسم بەمەستی پشکنینی گشتی" پاش کەمێك وتی: "ئامێری گۆرانییەکەت لای من دابنێ، نەوەك کوڕەکانی تر لێت بسەنن و بیشکێنن. من بۆت هەڵدەگرم. هەموو ڕۆژێك لێرەم هەرکات بتەوێت دەتوانیت سەردانم بکەیت و گوێی لێ بگریت".

ئامێرەکەم هەڵدا و پەنجەم خستە ناو گوێیەکانم تا چیتر گوێم لە ڕستەی "هەڵەی تۆ نییە" نەبێت. ئەو شەوە لە دالانەکە دانیشتبووم و

گوێم لە چەند کوڕێك دەگرت کە باسی یاریی فۆلیبۆڵەکەیان دەکرد، کە من لەکیسم چووبوو. دەمویست بیر لە کاتی منداڵیم بکەمەوە، بەڵام مەحاڵ بوو. هەموو ئەوەی هات بە مێشکمدا، یەکەمین جار بوو کە قورگی پیاوێکم هەڵدڕی. وێنەکەی هەروەك ڕووناکییەك لە شەوێکی تاریکی باراناوی هەمیشە لە مێشکمدا بوو.

هەرکاتێك بیرم لێدەکردەوە، دەنگی هاوارێك دەهاتە بەر گوێم کە بڕبڕەی پشتمی ئازار دەدا. چوومە ژوورەوە لەسەر جێیەکەی خۆم دانیشتم و چاوم بڕییە دیوارەکە. هەوڵم دا چیتر بیری لێ نەکەمەوە، بەڵام ئەو شەوە سەرئێشە دەسەپاچەی کردم.

سەرم لەسەر زەوییە چیمەنتۆ ساردەکە دەخولاندەوە. چار نەبوو پاشان چوومە ژووری خۆشتن و سەرم دایە بەر ئاوی سارد، هێشتا چار نەبوو. ئەوەندەم ئازار هەبوو نەمدەتوانی بڕۆم. بە دەنگی بەرز هاوارم کرد و گریام. دەستبەجێ پەرستاریان بانگ کرد چەند حەبێکی خەویان دامێ، هیشتا سوودی نەبوو. هەرکە سەرئێشەکەم وەستا، هێشتا نەمدەتوانی بەرەنگاری خەوە ناخۆشەکان ببمەوە کە دەمزانی لەهەرکاتێکدا بێت ڕووم تێدەکەن.

نیستەر گوێگرێکی باشی خەوەکانم بوو، هەرکات دەیویست سەرنجی خۆی بدات لەسەر خەوێکم، پرسیاری لێدەکردم "دەتوانم شتێك بڵێم دەربارەی خەوەکەت؟" هەمیشە بە نەخێر وەڵامم دەدایەوە. پاشان داوای ئامێری ئیشپێکردنی گۆرانییەکەم لێدەکرد.

دوا نیوەڕۆیەك نیستەر ئیشی ئەو ڕۆژەی نەبوو بە جلی ئاساییەوە و تەنورەیەکی کاوبۆیەوە هات بۆ خانەکە لەبری جلە سپییەکانی. لە

تۆیۆتایەکی سپیدا لەگەڵ دوو پیاو بوو. پیاوێکیان شۆفێرەکە و ئەوی تریان لێکۆڵەرەوە بوو لەو منداڵانەی لەگەڵ جەنگدا بەگیر هاتبوون. سەر بە رێکخراوێکی کاپۆلیك بوون، هاوشانی (یونسێف) و (ئێن جی ئۆ)* بوون، تا خانەی زیاتری وەکو (بێنین) دابمەزرێنن.

ئیستەر بە دڵێکی خۆشەوە لێی پرسیم: "ئێستا دەتبەین بۆ پشکنین، پاشان گەشتێك بەناو شارەکەدا دەکەین. پێت چۆنە؟"

"بە دڵنیاییەوە" هەمیشە پێم خۆش بوو بچمە ناو شارەوە. "هاورێکەم ئەلهاجی دەتوانێت بێت؟"

"بە دڵنیاییەوە دەتوانێت"، وەکو خۆی زانیبێتی پرسیاری لێدەکەم.

بەرەو فری تاون بەرێکەوتین. لێکۆڵەرەوەکە لە کورسییەکەی پێشەوە ناوڕیدایەوە و تەوقەی لەگەڵ کردین "ناوم لێسلییە، زۆر خۆشحاڵم بە ناسینتان ئەی پیاوە بەرێزەکان".

پاشان لە ناوێنەکانەوە چاودێریی دەکردین. ئیستەر لە تەنیشت من و ئەلهاجی بوو، جاربەجار ختووکەی دەداین و دەستی دەکردە ملمان، گەر نەمهێشتایە، هەردوو دەستی دەکردە ملی ئەلهاجی و بە هێواشی ئانیشکی لێدەدام پێش ئەوەی دەست بکاتە ملم.

لە ناوجەرگەی شار ئیستەر بیناکان و درەختەکانی پیشان دەدام لە شەقامی والکلەیس جۆن. بازرگانەکان گۆرانیان بە دەنگی بەرز لێدەدا و زەنگیان لێدەدا تا سەرنجی خەڵك رابکێشن. کوڕ و کچەکان

---

* NGO: رێکخراوێکی ئەهلییە.

فێنککەرەوەیان لەسەریان دەبەست و هاواریان دەکرد "وەکو سەهۆڵ ساردە... بیرەی سارد... وەکو سەهۆڵ ساردە...".

شارەکە هەمیشە سەرسامی دەکردم بە هاتوچۆی خەڵکەکە و سەرقاڵییان و ئەو دەنگە نامۆیانەی بازرگانەکان دەریان دەکرد. ئەوکاتەی گەیشتینە نەخۆشخانەکە. پیاوێکم بینی جلی کۆنەی دەفرۆشت و پشانی خەلکەکەی دەدا.

پزیشکەکە دەستی لە شوێنی برینەکانم دەدا و دەیگوشین "هەست بە هیچ دەکەیت؟" هەستم بە بێتاقەتی کرد جلەکانم لەبەر کردەوە و چوومەوە بۆ هۆڵی چاوەڕوانی، کە ئیستەر و لێسلی و ئەلهاجی لێبوو، هەموویان بزەیان لەسەر لێو بوو. ئیستەر بەرەو ڕووم هات و لوتی ڕاکێشام تا دڵخۆشم بکات. پاشان چووین بۆ مارکێتێکی گەورە خۆم بە تاقیکردنەوەی کاسێتەکانەوە خەریك کرد و ئیستەر و ئەلهاجی سەیری جلی فووتبۆڵیان دەکرد. ئیستەر دەستێ جلی بۆ ئەلهاجی کڕی و لێسلی کاسێتێکی بۆب مارلی بۆ من کڕی.

هەر لە منداڵیمەوە گوێم لە مۆسیقای ڕاگەی دەگرت. ماوەیەك بوو لێی دابڕابووم سەیری کاسێتەکانم کرد و دەمویست گۆرانییەکانم بێتەوە یاد، سەرم هاتە ئێش. پێدەچوو ئیستەر سەرنجی دابێتم لەبەر ئەوە بەپەلە کاسێتەکەی لێوەرگرتم و خستییە جانتاکەی. پاشان هاواری کرد "کێ کۆکا کۆلای دەوێت؟" دڵم خۆش بوو، بە خێرایی خۆم گەیاندە ڕیزەوە، بووتڵێکی ساردی بۆ هەریەکەمان کڕی تا گەیشتینەوە خانەکە چێژم لێدەبینی. بەدرێژایی ئەو ڕۆژە زەردەخەنەم لەسەر لێو بوو.

ئێستا پرۆسەی چاکبوونەوە و گەڕانەوەم بۆ بارودۆخی پێشوو کۆتایی پێهاتووە. لێسلی بە کاتێکی گونجاوی زانی تا پێمان بڵێت چ پلانێکی بەدەستە بۆ ئێمە. ئەو کارەکەی ئەوە بوو جێیەك بۆ ئێمە دابین بکات.

"هەرکاتێك ویستت قسەم لەگەڵدا بکەیت، بڕۆ بەلای ئیستەر ئەویش پەیوەندیم پێوە دەکات". لەکاتی خواردنەوە کۆکا کۆلاکەم سەرم بۆ لەقاند.

پێش ئەوەی ئیستەر بچێتە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە. منی هێنایە لاوە خۆی نزمکردەوە تا بەرێکی لە چاوانم بڕوانێت، من چاوەکانیم پشتگوێخست "کاسێتەکەی (بۆب مارلی) لای من دەبێت سبەینێ، دەتوانیت بێیت گوێی لێبگریت".

چووە ناو ئۆتۆمبێلەکە و دەستەکانی ڕاوەشاند بۆمان. ئەلهاجی جلە وەرزشییەکانی لەبەر کردبوو لە هەوادا شەقی لە تۆپی خەیاڵی هەڵدەدا، کاتێ گەیشتینەوە دالآنەکە. هەموو کوڕەکان دەوروخولی جلەکانی ئەلهاجییان دا. ڕەنگی سپی و سەوز و شین بوو وەك ئالآی ولآتەکە. ژمارە ١١ بە پشتییەوە نووسرابوو. ئەلهاجی بە خۆفشانەوە بە دالآنەکەدا دەهات و دەچوو، پاشان وەستا و وتی: "شارەکە هەروەك پشتی دەستم شارەزام. دەزانم لەکوێ ئەم شتانە دەست دەکەوێت".

بۆ ماوەی یەك هەفتە ئەو جلانەی دانەکەند تەنها بۆ خۆشتن نەبێت، چونکە دەیزانی یەکێك دەیبات. بۆ چەند کاژێرێك دەیدا بە کوڕەکانی تر لەبری سابوون، یان دەرمانی ددان، تەنانەت نانی نیوەڕۆش! لە کۆتایی

هەفتەیەدا ئەوەندەی دەرمانی ددان و کەلوپەلی تر هەبوو، هەموویانی لە بازاڕێکی نزیك خانەکە دەفرۆشتەوە.

ڕۆژێك دوای گەڕانەوەمان لە شار. دەستبەجێ دوای تەواوبوونی وانەکانم چووم بۆ نەخۆشخانە و چاوەڕێی ئیستەر بووم. سەری سووڕما کاتێك مـنی بینی چاوەڕێم دەکرد لەبەردەم دەرگای ژوورەکەیدا. دەستی لـە سـەرمەوە دا وتی: "هەوالّی خۆشم پێیە. ئەنجامەکانت لای پزیشکەکە دەرچوون و هـیچ شتێکی مەترسیدارت نییە تەنها دەبێـت دلّنیـا بم کـە دەرمانـەکانت بـە ڕێکوپێکی وەردەگریت، ئەوکات دوای چەند مانگێکی تر دووبارە پشـکنین دەکەینەوە". دەرگای ژوورەکەی کردەوە و بێ ئـەوەی هـیچ بلّـیم دوایکـەوتم خۆی دەیزانی لەبەرچی هاتووم، بۆیە کاسێت و ئامێرەکەی دامـێ لەگـەلّ پێنووس و دەفتەرێکی تێبینی زۆر جوان.

"دەتوانیت گۆرانییـەکان لێـرەدا بنووسـیتەوە و ئەگـەر حـەزت کـرد بەیەکەوە فێریان دەبین"، پاشـان دەسـتی کـرد بـە تەلـەفۆنکردن. سـەرم سووڕما ئەو چۆن دەزانێت من حەز بە نووسـینی تێکسـتی گۆرانییـەکان دەکەم؟ پاشان بۆم دەرکەوت لە ڕێگـەی قوتابخانەکـەوە ئـەو زانیارییـانـەی دەربـارەی مـن دەسـتکەوتبوو. لـەوێ پرسـیارمان پێـدەدرا تـا وەلاّمیـان بدەینەوە، لە سەرەتادا پرسیارەکان گشتی بوون، هیچ تـووڕەی نـەدەکردین، بە یادگاری سالآنی جەنگ. بۆ نموونە حەزت لە چ جۆرە گۆرانییەکە؟ گوێ لە ریگەی دەگریت. ئەگەر وایە کێ و لەبەرچی گوێی لێدەگریت؟ ئەم پرسیارانەمان لێدەکرا، لەسـەر پەڕەیـەك وەلاّمـان دەدایـەوە، یـان لـە پۆلەکـەدا باسمـان دەکـرد و وەلاّمـەکان دەدرایـەوە بـەو پەرسـتارەی

بەرپرسیاربوو لـە هەریـەکێکمان. ڕۆژانـی دواتـر، دوای نیـوەڕۆ چـاوەڕێی ئیستەر دەبـووم پاشـان بەشـێك لـەو گۆرانییانـەم بـۆ دەوت کـە لەبـەرم کردبوون. گۆانییەکان یارمەتییان دەدام بیر بکەمەوە لەو شتانەی لـەکاتی جەنگدا بەسەرم هاتبوون. هەستم بە ئاسوودەیی و دەکـرد لەگـەڵ ئیسـەر زیاتر لەبارەی گۆرانییەکانی بۆب مارلی و ڕەن-دی. نێم. سی قسەم لەگەڵ دەکرد.

هەفتەی دووجار لێسـلی سـەردانی دەکـردم گـوێی لـە گۆرانییـەکان دەگرت و باسی مێژووی راستەفارییەکان*ی دەکرد. حەزم لـە چـیرۆکەکانی ئەسیوبیا و شاژنی شـیبا و پاشـا سـۆلۆمۆن دەکـرد، منـیش وەك ئـەوان ڕێیەکی دوورم بڕیبوو تا بەیەکجاری جێیەك بۆ خۆم بدۆزمەوە.

خۆزگەم دەخواست گەشـتەکەم هێنـدەی ئـەوان بـە مانـا و پڕخۆشـی بووایـە. شـەوێکیان بـەدەم خوێندنـەوەی تێکسـتی گۆرانییەکـەوە خـەوم لێکەوت. ماوەی مانگێك بوو، بە باشی نەخەوتبووم. بۆیە شەوانە گـۆرانی و نووسینەوەی تێکستەکانی بۆب مارلی یارمـەتی دەدام خـۆم لـە خـەوی ناخۆش بەدوور بگرم، بـەڵام شـەوێکیان خـەوێکم بـینی جیـاواز لەوانـەی پێشووتر، لە خەوما لەگەڵ جونیەر لـە ڕووبـاری مـاتروجۆنگ مەلـەمان دەکرد، خۆمان هەڵدەدایە قـووڵایی ڕووبارەکـە و گوێچـکە ماسـییەکانمان

* ڕاستەفانییەکان: ئاینێکـە سـەرەتاکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ جامایکاییـەکان. کاتێـك لەلایەن پیاوێکی سپی پێستەوە چەوسێندرابوونەوە. خەڵکی شوێنکەوتووی ئەم ئاینـە پێیان وایە خودا زەوی دروستکردووە تەنها بۆ خۆشگوزەرانی خەڵکی، تا بە ئازادی بژین و بەڕای ئەوان ئەمە هەموو ویستی خودایە.

دەردەهێنایەوە و لەسەر بەردەکان دامانـدەنان و دووبارە دەچـووینەوە قوولایی.

لە کۆتاییدا جونیەر گوێچکە ماسی زیاتری هێنا و براوە بوو، بەڕاکردن گەڕاینەوە ماڵەوە. خواردن ئامادەکرابوو، بەلام هیچ کەس لەوێ نەبوو، ئاوڕمدایەوە تا بە جونیەر بڵێم چی ڕوودەدات؟ ئەویش لەوێ نەمابوو بەدوای ڕووناکیدا دەگەڕام، دەترسام و ئارەق بە ناوچەوانمدا دەهاتە خوارەوە، چرایەکم دۆزییەوە و لە موبەقەکە پاکەتێك شقارتەی لێبوو. چراکەم داگیرساند. هەر ژوورەکە ڕووناك بووەوە، چەند پیاوێکم بینی بە دەوری ژوورەکەدا وەستابوون. ڕووخساریانم نەدەبینی. وا دەردەکەوتن مرۆڤێکی بێ سەر بن، هەندێکیان پۆستاڵی سەربازییان لەپێدا بوو. ئەوانی تر پێ پەتی بوون.

هەموویان چەك و چەقۆیان پێبوو، کەوتنە یەك کوشتن و قووڕگی یەکیان هەڵدەدڕی، بەلام دووبارە زیندوو دەبوونەوە و یەکترییان دەکووشتەوە. خوێن بە هەموولایەکدا فیچقەی کرد و ژوورەکەی پڕ کرد. خوێن تا دەهات بەرز دەبووەوە بۆ سەرەوە، دەنگی گریانیان زیاتر شپرزەیان دەکردم. دەستم گرت بە گوێمەوە تا چیتر گوێم لە گریانیان نەبێت، بەلام هەستم بە ئازاریان دەکرد هەرکات یەکێك بە چەقۆ لێی بدرایە من خراپتر هەستم پێدەکرد.

دەستم کرد بە گریان. لەناکاو پیاوەکان ون بوون، دەرگای ژوورەکە کرایەوە بە جلی خوێناوییەوە چوومە دەرەوە، دایکم و باوکم و هەردوو

براکەم لە دەرەوە بوون، بزەیان دەکرد وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت و بە درێژایی ئەم هەموو ماوەیە پێکەوە بووبێتین.

"دانیشە ئەی هاروهاج" باوکم پێی وتم.

دایکم لەبەر خۆیەوە پێکەنی "وازی لێبێنە".

بەرامبەر باوکم دانیشتم، بەڵام نەمدەتوانی لەگەڵی نان بخۆم. لەشم سڕ ببوو. ئەوانیش سەرنجیان نەدەدا کە هەموو گیانم لە خوێناودایە!

باران دایکرد، هەموویان چوونە ژوورەوە، من لە دەرەوە مامەوە تا کەمێك خوێنی جەستە و جلەکانم پاك بێتەوە، پاشان هەستامە سەرپێ تا بچمە ژوورەوە، بەڵام خانووەکە چیتر لەوێ نەمابوو، سەرم سووڕمابوو سەیری ئەملاولای خۆمم دەکرد.

کاتێك خەبەرم بووەوە لە جێی خەوتنەکەم کەوتبوومە خوارەوە، هەستامە سەرپێ و چوومە دەرەوە و سەیری ئاسمان و تاریکی شەوم دەکرد. ئەوە یەکەمین جارم بوو خەو بە خێزانەکەمەوە ببینم.

ڕۆژی دواتر چوومەوە بۆ لای ئیستەر. خۆی هەستی کرد شتێك ڕوویداوە بە دەنگێکی نزمی وەکو چرپە پێی وتم: "دەتەوێت پاڵکەویت؟"

سەیری لایەکی ترم کرد وتم: "دوێنێ شەو ئەم خەوەم بینی نازانم چی بکەم".

هاتە نزیکەوە و لامەوە دانیشت "دەتەوێت بۆم باس بکەیت؟"

وەڵامم نەدایەوە.

"یان وابزانە بە تەنهایت و بەدەنگی بەرز باسی دەکەیت. من هیچ قسە ناکەم، وا بزانە لێرە نیم. تەنها ئەو کاتانە نەبێت کە خۆت پرسیارم

لێدەکەیت"، بێدەنگییەکە بۆ ماوەیەك درێژەی هەبوو، پاشان دەستم کرد بە گێڕانەوە.

لە سەرتاوە هەر گوێی دەگرت وردە وردە کەوتە پرسیارکردن دەربارەی ئەو ژیانەی پێش جەنگ هەمبوو، لە کۆتایی هەموو باسێکدا دەیوت: "ئەمانە هیچی هەڵەی تۆ نین".

هەمان ڕستە کە ستافەکان دەیانوت، بەڵام ئەو جۆرەی ئیستەر دەیوت جیاواز بوو، هەستم کرد بە ڕاستی هەڵەی من نەبوو. هێزی زیاتری دامێ تا زیاتر بیر بکەمەوە. تا زیاتر قسەم لەگەڵ ئیستەر بکردایە، زیاتر هەستم بە شەرم دەکرد لە ڕووداوە سامناکەکان، لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەهێشت ئیستەر هەستم پێ بکات. هەرچەند متمانەی تەواوم بە ئیستەر نەبوو تەنها دەمویست گوێم لێ بگرێت. ئەو هەرگیز دادگایی نەدەکردم بۆ ئەو شتانەی کردبوومن. هەمیشە بە چاوی بانگهێشتی دەکردم و بە زەردەخەنەکەی بەخێرهاتنی دەکردم و پێی دەوتم کە من تەنها منداڵێك بووم.

ئێوارەیەك ئیستەر بردمی بۆ ماڵی خۆیان بۆ نانی ئێوارە. پاش نانی ئێوارە پیاسەمان کرد، چووینە لای بەندەرەکە لە شەقامی ڕاودۆن، لە کەناری دەریاکە دانیشتین و چاومان بڕییە مانگ، باسی ئەو وێنانەم دەکرد کە لەناو مانگدا دەمبینین کاتێك منداڵتر بووم. ئیستەر سەرسام بوو.

سەیری مانگمان دەکرد و باسی شێوەکانی ناریمان دەکرد.

وێنەی ژنێکم بینی کە منداڵەکەی لەباوەش گرتبوو.

کاتێك گەڕاینەوە، چیتر سەیری ڕووناکی شارەکەم نەکرد چاوم بڕییە ئاسمان و هەستم دەکرد مانگ دوامان دەکەوێت.

کاتێك منداڵ بووم دایەگەورە پێی دەوتم ئاسمان قسە لەگەڵ ئەو کەسانە دەکات کە سەیری دەکەن و گوێی لێدەگرن. پێی دەوتم: "لە ئاسماندا هەمیشە وەڵامێك هەیە، هەمیشە ڕوونکردنەوە هەیە بۆ هەموو شتێك... هەموو ئازارێك... بۆ چەشتنی هەموو ئازارێك... خۆشییەك، یان شپرزەیی و دوودڵییەك" ئەو شەوە دەمویست ئاسمان قسەم لەگەڵ بکات.

## هەژدە

دوای پێنج مانگ مانەوە لـە خانـەی بێـنین. ڕۆژێـك لەسـەر بـەردێك دانیشتبووم لەدوای پۆلەکەوە. ئیسـتەر بـێ ئـەوەی هـیچ بڵێـت، لامـەوە دانیشت. دەفتەری تێکست گۆرانییەکانیشی پێبوو. بە هێواشـی پـێم وت: "هەست دەکەم هیچ هۆکارێکم نەماوە تا بژیم"، بە هێواشی دەسـتم کـرد بـە گریـان "هـیچ کەسـم نـەماوە... کـەس نییـە چـیرۆکی منـداڵیم بـۆ بگێڕێتەوە". کەمێك مشەمشم کرد.

ئیسـتەر دەسـتی کـردە ملـم و لـە خـۆی نزیـك کردمـەوە، کـەمێك ڕایوەشاندم تا بەئاگا بم لێی و وتی: "وابزانە من لە خێزانی تـۆم. وابزانـە من خوشکتم".

-"بەڵام من خووشکم نەبوو".

-"بەڵام ئێستا هەتە، ئەمـە جـوانی دەسـتپێکردنی خێزانـی نوێیـە، دەتوانیت هەموو ئەندامێکی خێزانت هەبێت". چـاوی تێـبڕیم و چـاوەڕێی کرد تا شتێك بڵێم.

-"باشە دەتوانیت ببیت بە خوشکم- بـۆ ماوەیـەکی کـاتی"، وشـەی کۆتاییم بە دەنگی بەرز وت.

-"کێشـە نییـە، کەواتـە سـبەینێ دێـت بـۆ بینـینی خوشـکە کاتییەکەت".

دەموچاوی داپۆشی، وەکو ئەوەی دڵ غەمگین بێت گەر بڵێم نا.

"باشە باشە، پێویست ناکات دڵت ناخۆش بێت" هەردووکمان کەمێك پێکەنین.

پێکەنینەکەی هەمیشە ئابیگالی بیردەهێنامەوە، ئەو کچەی لە خوێندنگەی ناوەندیی لەگەڵم بوو. لە شارۆچکەی (بۆ).

هەندێ جار خۆزگەم دەخواست ئیستەر ئابیگال بوایە.

تا پێکەوە باسی ژیانی پێش جەنگ بکەین. دەمویست پێبکەنین بێ ئەوەی گوێ بدەین بە هیچ، بەڵام ئەمجارە نەمەتوانی.

لە کۆتایی هەموو پێکەنینێکدا دڵتەنگیی دەیگرتم.

هەندێك جار سەیری ئیستەرم دەکرد کاتێك سەرقاڵی کاغەزەکانی بوو.

هەرکات هەستی دەکرد سەیری دەکەم، کاغەزێکی لولکراوی تێدەگرتم، بێ ئەوەی سەیرم بکات.

پێدەکەنیم و کاغەزەکەم دەخستە گیرفانمەوە وەك ئەوەی شتێکی گرنگی بۆم نووسیبێت.

ئەو ڕۆژە کە ئیستەر لامەوە هەستا و ڕۆیشت، جار بەجار ئاوڕی دەدایەوە و دەستی رادەوەشاند، تا بە تەواوی لەپشت یەکێك لە گردەکان لەبەرچاو ون بوو. پێکەنیم و بۆ ماوەیەکی کاتیی، تەنیایی خۆمم لەبیر کرد.

ڕۆژی دواتر ئیستەر پێی وتم کە میوان دێت بۆ سەنتەرەکە. ستافەکان داوایان لە کوڕەکان کردووە ئەو بەهرانەی هەیانە، پیشانی بدەن. بە شێوەیەکی سەرەکی پێویست بوو شتێك بکەین کە تیایدا باشین.

ئیستەر پێشنیازی کرد "دەتوانیت یەکێك لـە گۆرانییـەکانی راگـەیی بڵێیت".

"ئەی وتارەکانی شکسپیرت پێ چۆنە؟"

"خراپ نییە، بەڵام پێم باشە گۆرانی بڵێیت". پاشان دەستی کردە ملم. زۆر هۆگری ئیستـەر ببووم، بەڵام دەرم نەدەخست هـەرکات باوەشـی پێمـدا دەکرد، یان دەستی دەکردە ملم، هەستم دەکـرد دەسـتبەجێ لـە بەندیخانـە رادەکەم. هەرکاتێك دەڕۆیشت، سەیرم دەکرد ڕۆیشـتنێکی تـاك و تـەنیقی هەبوو، وا دەردەکەوت بەسەر زەوییەکەوە سەوڵ لێبدات. هـەموو ڕۆژ دوای تەواوبوونی وانەکانم سەردانیم دەکرد و باسی ئەو ڕۆژەم بۆ دەکرد. ئەلهاجی و مامبو گاڵتەیان پێدەکردم "ئیشمایل کچە هاوڕێکەت لێرەیە، ئەم دوای نیوەڕۆیە دەتبینین؟"

ئەو ڕۆژە لیژنە ئەوروپییەکە گەیشتن. (یونسێف) و (یو ئێن) و (ئـێن جی ئۆ) لەگەڵ قافڵەیەك ئۆتۆمبێلی تر، کـە بـۆ چـاودێریان یاوەرییـان بوون، گەیشتنە سەنتەرەکە. قاتیـان لەبـەردابوو، بۆینباخیـان بەسـتبوو، تەوقەیان لەگەڵ یەك دەکرد پـێش ئـەوەی بـەناو سـەنتەرەکەدا بگـەڕێن. هەندێك لە کوڕەکان بـە دوایانـەوە بـوون. مـن و مـامبو لـە داڵانەکـەدا دانیشتبووین. هەموو میوانەکان زەردەخەنـەیان دەکـرد و بۆینباخـەکانیان توونـد دەکـردەوە، یـان تێبینیـان دەنووسـی. هەنـدێکیان سـەیری جێـی خەوتنـەکانیان دەکـرد. هەنـدێکیان چـاکەتەکانیان داکەنـدبوو. یـاریی دەستشکانەوە زۆرانبازیـان لەگـەڵ کوڕەکـان دەکـرد. پاشـان برانـە ژووری

نانخواردن کە بە جوانی ئامادە کرابوو بۆ پیشاندانی بەهرەکانمان. (کامارا) دامەزرێنەری سەنتەرەکە چەند وتەیەکی پێشکەشکرد.

پاشان کوڕەکان دەستیان کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی (جالْجالۆکەی برا) و چیرۆکی ئەژدیهاکان.

هەندێك لە کوڕەکان چەند سەمایەکی هۆزەکییان پێشکەشکرد. مـن چەند دێڕێکم لە شانۆی جوولیەس قەیسەر پێشکەشکرد لەگەڵ شـانۆیەك بە سەمای هیپ-هۆپ، کە باسی لە ژیـانی کـوڕە سـەربازێك دەکـرد بـە هاوکاری نیستەر نووسرابوو. دوای ئەوە بوومە کەسێکی دیار و ناسراو لـە سەنتەرەکە.

ڕۆژێك کامارا بانگی کردمە نووسینگەکەی خـۆی و پێـی وتم: "تـۆ و هاوڕێکانـت سـەرنجی ئـەو میوانانـەتان ڕاکێشـا بـەلای خۆتانـدا. ئەمـە گەورەترین نیشانەیە کە دەری دەخـات تواناتـان هەیـە بگەڕێنـەوە دۆخـی ئاسایی".

زۆر دڵم خۆش بوو، ئەوە یەکەمین جار بوو پاش ئەو هەموو سـاڵە لـە ئارامی و ئاشتیدا بەهرەکانم پێشکەش بکەم. بەڕێز کامـارا وتـی: "پێـت چۆنە ببیتە دەمڕاستی خانەکە؟"

"بڵێم چی..." بە دوودڵییـەوە پرسـیارم کـرد. نەمـدەزانی چـی بڵـێم، هەستم دەکرد هەموو ئەم شتانە زۆر گەورەکران.

"لــە ســەرەتادا هــەر کێشــەیەك هــەبوو، یــان چــیرۆکی منداڵــە سەربازەکانمان لابوو بۆ تۆی دەنووسین، بیانخوێنـەرەوە، هـەرکات ڕاهاتیـت دەتوانیت خۆت دەربارەی ڕووداوەکان بدوێیت و باس لـە ئـەزموونی خـۆت

بکەیت". ڕووخساری توندگیری بەڕێز کامارا پێی وتم، کە ئەوەی دەیڵێت پێویستە جێبەجێ بکرێت. هەفتەیەك زیاتری نەبرد بەناو (فری تاون)دا دەگەڕام و منداڵە سەربازەکانم بەسەر دەکردەوە "ئێمە توانای گەڕانەوەمان هەیە بۆ ژیان و دۆخی ڕابردوومان". پاشان خۆمم بە نموونە دەهێنایەوە. بە هەموو کەسێکم دەوت کە منداڵان زۆر زوو دەگەڕێنەوە سەر باری ئاساییان، تەنها ئەگەر مەودایان پێ بدرێت. لە کۆتایی شەش مانگ مانەوەم لە خانەی بێنین. هاوڕێی منداڵیم محەمەد هات بۆ سەنتەرەکە. دوایەمین جار کە بینیم ئەو کاتە بوو، کە لەگەڵ تالۆی و جونیەر (مۆگبوعۆ)م جێهێشت تا بەشداری لە نواندنی بەهرەکان بکەین لە (ماتروجۆنگ). محەمەد نەهات لەگەڵمان، ئەو یارمەتی باوکی دەدا لە چاکردنی بنمیچی موبەقەکەیان. لەوکاتەوە بیرم دەکردەوە ئاخۆ چی لێ بەسەرهاتبێت هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە دووبارە بیبینمەوە. ئەو ئێوارەیە لە کۆبوونەوەی خوێندنگەی ناوەندیی (ست. ئێدوارد) بووم، کاتێك گەڕامەوە کوڕێکی پێست کاڵی زەعیفم بینی، ئێسقانی ڕوومەتەکانی دەرپەڕیبوون. لەسەر سەکۆکە بە تەنها دانیشتبوو. ڕووخساری نامۆ نەبوو، بەڵام دڵنیاش نەبووم. هەر نزیکبوومەوە بەرزبووەوە هەستایە سەرپێ "چۆنی! منت لەبیرە؟"

پاشان ئەو گۆرانییەی وت کە ئەوکات دەمانزانی و دەستی کرد بە سەما، منیش دەستبەجێ چوومە لایەوە و سەمام لەگەڵ کرد. باوەشمان کرد بە یەکدا. هێشتا لە من بالآبەرزتر بوو. پێکەوە دانیشتین و باسی منداڵیی خۆمان دەکرد.

کەمێك ڕووی بەولادا کرد و وتی: "هەندێك جار بیر لەو کاتە خۆشانە دەکەمەوە کە پێکەوە بەسەرمان بردبوون، سەماکردن لە نوانەدنی بەهرەکان، مەشقکردن لەسەر سەمای تازە و فووتبۆڵ تا تۆپەکەمان لەبەرچاو ون دەبوو. هەموو ئەمانە زۆر لە مێژە ڕوویان داوە. زۆر سەیرە... دەزانی؟"

-"دەزانم... دەزانم...".

پاشان بە بیری هێنامەوە: "کوڕێکی هاروهاج بوویت!"

-"دەزانم... دەزانم...".

لە سەرەتای تێپەڕبوونی حەوت مانگ مانەوە. دووبارە لێسلی گەڕایەوە، بانگکرام تا دانوستان بکەین. ئەو لە ژوورێکی نەخۆشخانەکە چاوەڕێم بوو، هەرکە چوومە ژوورەوە لەبەرم هەستا و سڵاوی لێکردم. لە ڕووخساریدا هەردوو هەستی دڵخۆشی و خەمناکی دەبینران. پێویست بوو بپرسم چی لەئارادایە.

"تۆ باشیت؟"

"بەڵێ" سەری خوراند و شتگەلێکی لەبەرخۆیەوە وت: "ببوورە کە ئەم باسە دەورووژێنمەوە دووبارە، دەزانم دڵت تەنگ دەکات، بەڵام دەبێت ڕاستگۆ بم لەگەڵت". دەستی کرد بە پیاسەکردن بەناو ژوورەکەدا "ناتوانین هیچ ئەندامێکی خێزانەکەت بدۆزینەوە لە شارەکە، لەبەر ئەوە پێویستە خانەخوێیەك بتگرێتە خۆ. هیوادارم پێت باش بێت. دوای ئەوەی بەتەواوەتی گەڕایتەوە بارودۆخی ئاسایی، سەردانت دەکەمەوە تا بزانم ژیانت چۆن دەگوزەرێت".

پاشان دانیشت و سەیری کردم "هیچ پرسیارێك، یان تێبینییەك هەیە؟"

"وابزانم... بەڵێ. پێش ڕوودانی جەنگ باوکم پێی وتبووم کە مامێکم لەناو شار دەژی، بەڵام نازانم تەنانەت شێوەی چۆنە".

-"ناوی چییە؟"

-"ناوی (تۆمی)یە، وەختی خۆی باوکم پێی وتم ئیشی دارتاشی دەکات".

لێسلی ناوی مامە ئەفسووناوییەکەمی بە لامسەرلایی لە پەڕەیەکدا نووسی.

پاش ئەوە وتی: "پەیمان نادەم، بەڵام دەبینین چیمان پێدەکرێت، بەم زووانە سەردانت دەکەمەوە". پاشان بەهێواشی کێشای بە شانمدا و وتی: "بیستوومە کاری باش دەکەیت، بەردەوام بە".

چووە دەرەوە، پێم وانەبوو بتوانێت لە شارێکی وا گەورەدا بتوانێت مامم بدۆزێتەوە. بەتایبەتی بەو زانیارییە کەمەی کە هەیەتی. ژوورەکەم جێهێشت و چوومە لایەکی تری بیناکە تا ئیستەر ببینم.

سەرقاڵی دانانی کەلوپەلی پزیشکی نوێ بوو لەناو ئەو تاکانەی بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوون.

هەر منی بینی، زەردەیەکی کرد، بەڵام لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو. چاوەڕێم کرد تا تەواو بوو.

دوایەمین قوتووی دانا و وتی: "ئێ، چاوپێکەوتنەکە چۆن بوو".

هەموو شتێکم پێ وت، لە کۆتاییـدا هەڵوێسـتی گوومانـاویم نوانـد بەرامبەر دۆزینەوەی مامم، نیستەر بە وردی گوێی ڕاگرتبوو، وتی: "جارێ نازانرێت... ڕەنگە بیدۆزێتەوە". ڕۆژێکی شەممە بـوو، دوای نیـوەڕۆ لەگـەڵ نیستەر و محەمەد قسەم دەکرد. لێسلی بە زەردەخەنەیەك خـۆی بـە ژووردا کرد. وامزانی خانەخوێیەکی دۆزیوەتەوە و لە کۆتاییـدا "دەنێردرێمـەوە"، ئەم دەستەواژەیە لەگەڵ منداڵە سەربازەکاندا بەکاردەبرا کاتێك دەگەڕانەوە بۆ لای خێزانەکانیان، یان ئەو جێیەی پێشتر لێی دەژیان.

نیستەر پرسی: "ئەو هەواڵە خۆشە چییە؟" لێسلی سەیری ڕووخساری پڕ پرسیاری منی کرد و گەڕایەوە لای دەرگاکە و کردییەوە. پیـاوێکی بـاڵا بەرز بە زەردەخەنەیەکی ڕاستەقینە هاتـە ژوورەوە، کـە ڕووخسـاری وەکـو کوڕێکی منداڵ دەردەکەوت.

دەستەکانی درێژ بوون. سەیری لای منی دەکرد. پێستی وەك باوکم کاڵ نەبوو.

لێسلی بە خۆ فشانەوە وتی: "ئەمە مامتە".

" تەندروستیت چۆنە ئیشمایل؟"

پاشان نزیکبووەوە و نووشتایەوە و توند باوەشی پێدا کـردم، قۆڵـەکانم لە جێی خۆیان ڕەق بوون.

لەسەرەتادا بیرم دەکردەوە چی دەبێت ئەگـەر ئەمـە مـامم نـەبێت و وا خۆی نیشان بدات، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەندامێکی خێزانەکەمە، چونکە دەستی کرد بە گریان کە ڕوون بوو لە ناخی دڵییەوە دەگریا. جگـە لەوە پیاوانی وڵاتی ئێمە بەناستەم دەگرین.

لەتەنیشتمەوە خۆی نووشتاندەوە و وتی: "بمبـوورە ئـەم هـەموو سـاڵە سەردانم نەکردیت، دەبوایە بمکردایە، بەڵام تـازە نـاتوانین بگەڕێینـەوە بـۆ ڕابردوو با سەرلەنوێ دەست پێ بکەینەوە. زۆر بەداخم بۆ هەموو ئەوانـەی لەدەستت چوون. لێسلی هەموو شتێکی پێ وتووم".

بە چاوی سوپاسەوە لە لێسلی ڕوانی، پاشان بەردەوام بوو و دەستی لە ملم کرد "پاش ئەوەی لێرە تەواو بوویت، دەتوانیت بێیـت لەگـەڵم بـژیت. تۆش کوڕی منیت، هەرچەندە هیچی وام نییە، بـەڵام شـوێنی حەوانـەوە و خواردنت پێ دەدەم، لە هەمووشی گرنگتر خۆشەویستی خۆمت پێشـکەش دەکەم".

ماوەیەکی زۆر بوو کەس بە "کوڕم" بانگی نەکردبووم.

نەمدەزانی چی بڵێم. وا دەردەکەوت هەموویان چاوەڕوانی وەڵامـی مـن بن. سـەیری مـامم کـرد و زەردەخەنـەم کـرد "زۆر سوپاسـت دەکـەم کـە سەردانت کردووم. و جێی حەوانەوەت پێشکەش کردووم، بەڵام من بەڕاستی ناتناسم".

کـەمێك پێکـەنی و دەسـتی بەسـەرمدا هێنـا: "وەکـو وتم ئەمـە سەرەتامانە تا دووبارە دەست پێ بکەین و یەکترمان خۆش بوێت".

هەستامە سەر پێ و باوەشم پێیدا کرد، ئەویش لە جاری یەکەم توندتر باوەشی پێداکردم و ناوچەوانمی ماچ کرد. کەمێك لە بێدەنگیـدا وەسـتاین پێش ئەوەی دووبارە دەست بە قسـەکردن بکاتـەوە "بەڕاسـتی نـاتوانم بـۆ ماوەیەکی زۆر بمێنمەوە، هەندێك کاروباری دەرەوەی شارم ماوە تا تـەواویان بکەم، هەموو کۆتایی هەفتەیەك سەردانت دەکەم، یان پـێم باشـە ڕۆژێـك

لەگـەڵم بێیـت تـا بزانیـت لـە کـوێ دەژیـم و ژنەکـەم ببینیـت لەگـەڵ منداڵەکانم —خێزانەکەی خۆت".

لە کۆتایی قسەکەیدا دەنگی دەلەرزی دەیویست ڕێ لە گریان بگرێـت. دووبارە دەستێکی بەسەرمدا هێنا و بەدەستەکەی تریشی تەوقـەی لەگـەڵ لیسلی کرد.

لیسلی وتی: "بەڕێز، لەمڕۆ بەدواوە لـە هـەموو شـتێکی ئـەم پیـاوە ئاگادار دەکرێیتەوە".

"سوپاس" دەستی گرتم و تا لای ئۆتۆمبیلەکە ڕۆیشتم لەگـەڵیان کـە لەگەڵ لیسلیدا پێی هاتبوون. پێش ئەوەی بچێتە ناو ئۆتۆمبێلەکە مـامم باوەشی پیادا کردمەوە و وتی: "زۆر لـە باوکـت دەچـیت. تـۆ ئـەوم بـەبیر دەهێنیتەوە ئەو کاتانەی پێکـەوە گـەورە بـووین، هیـوادارم وەك و باوکـت کەللەڕەق نەبیت". هەردووکمان پێکەنین و ئیستەر و محەمەد ماڵئاواییـان لێکردن.

هەر ئۆتۆمبێلەکە لەبەرچاو ون بوو، ئیستەر وتی: "لە پیاوێکی بـاش دەچێت".

محەمەد وتی: "پیرۆزە ئـەی پیـاو، ئێسـتا دوور لـەو هـەموو شـێتییە ئەندامێکی خێزانەکەت هەیە لە شار".

"وابـزانم وایـە". نەمـدەزانی چـی لـەو دڵخۆشـییەم بکـەم هێشـتا نەمدەتوانی خۆم بدەمە دەست ئەو هەستە.

محەمەد گوێچکەی ڕاکێشام: "دەی... تۆزێك دڵخۆش بە".

پاشان لەگەڵ ئیستەرە هەڵیانگرتم و بردیانمەوە بۆ نـاو نەخۆشـخانەکە. ئیسـتەر کاسـێتی بـۆب مـارلی خسـتە سـەر و گـۆرانی (سـێ باڵنـدە بچووکەکە)مان دەوت (گوێ مەدە بە هیچ شتێك... چونکە لـە کۆتاییـدا هەموو شتێك باش دەبێت...).

ئەو شەوە لە دالآنەکەدا لەگەڵ ئەلهاجی و مامبو و محەمەدا دانیشتم.

وەك و هەموو کات بێدەنگ بووین. دەنگی ئۆتـۆمبێلێکی فریاکـەوتن بێدەنگییەکەمانی تێکشکاند. بیرم دەکردەوە مامم لەو کاتەدا دەبێت چـی بکات. وێنەی ئەوەم لە مێشکمدا بوو کە هەموو ئەنـدامانی خێزانەکـەی کۆدەکاتـەوە و باسـی منیـان بـۆ دەکـات. ڕەنگـە بـە هێواشـی بگـری و خێزانەکەشی دوای ئەو بگرین. بەشێك لـە مـن حـەزی دەکـرد ئـەوان تـا دەتوانن بگرین بۆ ئەوەی کاتێك من دەبینن، توانـای گریانیـان نـەمابێت. هەرگیز پێم خۆش نەبوو خەڵکی لەبـەر ئـەو شـتانەی بەسـەرم هـاتوون، فرمێسك هەڵڕێژن.

سەیری ئەلهاجی و مامبوم کرد کـە چـاویان بڕیبـووە تـاریکی شـەو، دەمویست باسی مامم بکەم، بەڵام هەستم بە تاوان دەکرد، چـونکە ئـەوان هیچ کەسێکیان نەبوو. جگە لەوە نەمدەویست ئەو بێدەنگییـە تێـك بـدەم کە دوای لورەلوری ئۆتۆمبێلەکە دووبارە ڕووی تێکردبووینەوە.

هەروەك و مامم پەیمانی دابوو، هەموو کۆتـایی هەفتەیـەك سـەردانی دەکردم. لە یەکـەم ڕۆژی سـەردانی بـە ئیسـتەرم وت: "مـامم دێـت بـۆ سەردانم، لە خوارەوەی ڕێگاکە لای درەختە مانگۆکەوە بینیم".

ئیستەر پێی وتم: "زۆر دڵخۆش دیاریت"، کەمێك لێم وردبووەوە: "پێم وتی ئەو لە پیاوێکی باش دەچێت".

مامم بە ناوچەوانی ئارەقاییەوە هاتە ژوورەوە و پێش ئەوەی باوەشم پیا بکات، ناوچەوانی بە پارچە دەستەسڕەکەی سڕی، لە ماوەی باوەش پیاکردنەکە سڵاوی لە ئیستەر کرد، پاشان زەردەخەنەیەکی ئەوەندە گەورە هاتە سەر لێوی کە منیشی هێنایە پێکەنین. جانتاکەی لەسەر زەوییەکە دانا و چەند بسکیتێك و خواردنەوەی ساردی دایە دەستم.

پاش ئەوەی دیارییەکانی دایە دەستم، وتی: "وابزانم وزەت پێویست دەبێت بۆ کاتی پیاسەکەمان".

ئیستەر وتی: "پێویستە سەردانی گردەکە بکەن"، هەردووکمان سەرمان لەقاند. پاشان وتی: "من لێرە نابم ئەوکاتەی دەگەڕێنەوە. خۆش حاڵ بووم بە بینینت بەڕێز".

پاشان سەیری کردم و وتی: "سبەینێ دەتبینمەوە".

من و مامم چووینە دەرەوە و بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتین کە ئیستەر پێشنیازی کردبوو. لە سەرەتادا بێدەنگ بووین. گوێم بۆ دەنگی پێیەکانمان ڕاگرتبوو بەناو ڕێگا خۆڵاوییەکەدا. هەستم بە جووڵەی مارمێلکەکان دەکرد کە لە پێشبڕکێدا بوون تا بەسەر درەختی مانگۆوە هەڵگەڕێن. هەستم بە مامم دەکرد کە چاوی لەسەرم بوو.

پاشان پرسیاری کرد: "شتەکان بەگشتی چۆنن؟ باش هەڵسوکەوتت لەگەڵ دەکەن؟"

"هەموو شتێك باشە".

"هیوادارم وەکو باوکت بێدەنگ نەبیت" دووبارە ناوچەوانی سڕی
"باوکت زۆر باسی ماڵەکەی خۆی دەکرد؟"

"هەندێك جار، ئەوەندە زۆر نا، کە خۆزگەم دەخواست".

سەرم هەڵبڕی و چاوە پڕ میهرەبانییەکانی مامم بینی. ڕێگاکە تا دەهات باریکتر دەبووەوە کاتێ بنی گردەکەمان بڕی. پێم وت کە باوکم هەمیشە باسی ئەو کەتنانەی دەکرد کە بە منداڵی دەتانناپەوە پێکەوە.

پێم وت کە باوکم باسی ئەو چیرۆکەی بۆ کردووم کاتێك چوونەتە ناو دەوەنەکە تا ئاگری تێبەردەن، پاشان دەستیان لە شانەی هەنگەکان داوە و ڕایانوەشاندووە، هەنگ تا ناو گوندەکە بە دوایانەوە بوون. لەبەر ئەوەی باوکم باڵای کورتتر بووە، هەموو هەنگەکان بەسەری مامەوە نیشتوونەتەوە پاشان خۆیان هەڵداوەتە ناو حەوزێك ئاوەوە و هەنگەکان بەسەریانەوە نیشتوونەتەوە. بۆ هەناسەدان هاتوونەتەوە دەرەوە و ڕایانکردووەتەوە بۆ ناو گوندەکە.

"بەڵێ، بیرمە. هەموویان زۆر لێمان تووڕە بوون کە ئەو هەنگانەمان لەگەڵ خۆمان هێنابوو. بە پیاوی پیریانەوە دەدا کە توانای ڕاکردنیان نەبوو. یان هەندێك منداڵی بچووك. من و باوکت دەرگاکەمان داخست و لەژێر جێخەوەکە خۆمان شاردەوە و بەو ژاوەژاوەی دەرەوە پێدەکەنین".

مامم قاقای لێدەدا، منیش پێدەکەنیم، هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و وتی: "ئاه... من و باوکت بەزمان زۆر هەبوو. ئەگەر تۆش بەقەد ئێمە هاروهاج بوویت، ئەوا سەربەستیت دەدەمێ، چونکە تاوانە بۆ من سەرزەنشتی تۆ بکەم".

بە دڵێکی غەمگینەوە وتم: "وابزانم کاتی هاروهاجییەکانم بەسەرچوون".

"ئاه، هێشتا منداڵیت، کاتت هەیە بۆ هاروهاجی"، پاشان بێدەنگ بووین و گوێمان بۆ دەنگی با ڕاگرت کە بەناو درەختەکاندا لە هاتوچۆدا بوو.

چێژم لە پیاسەکەم دەبینی، چونکە مەودام هەبوو تا باسی منداڵیم بکەم باسی گەورەبوون لەگەڵ باوکم و جونیەر، کاتە خۆشەکانی پێش جەنگ. تا زیاتر باسی باوکمم بکردایە زیاتر بیری دایکمم و برابچووکەکەم دەکرد. هەستم دەکرد من لەگەڵیان گەورە نەبووم. ئەو کاتانەش چی دی ناگەڕێنەوە. ئەوەش دڵتەنگی دەکردم. هەوڵم دا هەموو ئەوانە بۆ مامم باس بکەم، ئەو هەر گوێی دەگرت، چونکە ئەوانی نەدەناسی. بۆیە داوای لێکردم باسی خێزانەکەم بکەم ئەوکاتەی هەموومان لە (ماترجۆنگ) پێکەوە دەژیاین، ئەوکاتەی دایك و باوکم پێکەوە بوون. ئەو کاتەش هیچی وانەبوو باسیان لێوە بکەم، چونکە من زۆر منداڵ بووم کە ئەوان بڕیاری جیابوونەوەیان دابوو.

لەماوەی پیاسەکردنەکەمان زۆر باش مامم ناسی. لەوکاتەوە پەرۆشی سەردانەکانی بووم لە کۆتایی هەموو هەفتەیەکدا، هەمیشە دیاری بۆ دەهێنام و باسی ئەو هەفتەیەی بۆ دەکردم. باسی ئەو بنمیچەی دەکرد کە بۆ خانوویەکی دروستکردبوو یان ئەو مێزە جوانەی پۆڵیشی کردبوو. یان ئامۆزاکانم چەند باشن لەگەڵ خوێندندا. پاشان سڵاوی ژنەکەی پێدەگەیاندم. منیش زۆربەی کات باسی ئەو هەفتەیەم بۆ دەکرد، ئەو

یارییانـــەی بەشـــداریم تیایانـــدا کردبـــوو. ئـــەو بەهرانـــەی پێشکەشـــی میوانەکانمان کردبوون. زۆربەی کات پیاسەمان دەکـرد بەسـەر گردەکـەدا. ئەوەندە شارەزای ئەو ڕێگەیە ببووم دەمتـوانی چـاوەکانم دابخـەم و هـەموو بەردی سەر ڕێگاکە ببڕم.

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی کۆتـایی هەفتـەدا، مـامم بردمـی بـۆ مـاڵی خۆیان تا خێزانەکەی ببینم. ڕۆژی شەممە. ئەو لە گردێکی ڕۆژئاوای (فـری تاون) دەژیا کە بە نیـو ئینگلانـد ڤیلـل ناسـرابوو. ئـەو ڕۆژە زووتـر لـە کاتەکانی تر هـات بـۆ خانەکـە تـا مـن ببـات. لۆرییـەکمان گـرت بـۆ ناوجەرگەی شـارەکە. لەسـەرەتادا مـن و مـامم بێـدەنگ بـووین، پاشـان دەستمان کرد بە پێکەنین، چونکە ئەو دوو پیاوەی تەنیشتمان باسییان لەوە دەکـرد کـام خواردنـەوەی گـەڵای دارخورمـا باشـترینە، ئـەوەی لـە دارخورمایەکی سـاغەوە لێدەکرێتـەوە، یـان لـە دارخوورمایـەکی بـڕراوە کاتێك کەوتووەتە سەر زەوییەکە. ئەو کاتەی دابەزین پیاوەکان هێشـتا لـە باسی ئەوەدا بوون. بە هێواشی بەرەو ماڵی مامم ڕۆیشتین. مـامم دەسـتی لە ملم کردبوو، دڵخۆش بووم بە پیاسەکەمان لەهەمان کاتدا خەمم بـوو گەر خێزانەکەی من قبوڵ نەکەن. بەو شێوەیەی ئەو قبـوڵی کردبـووم بـێ ئەوەی پرسیار دەربارەی ساڵانی جەنگ بکات.

بـە گردەکـەدا چـووینە سـەرەوە، هـەرنزیك بووینـەوە لـە ماڵەکـەی، هێنامییـە لاوە و پێـی وتم: "تـەنها ژنەکـەم لـە ڕابـردوو و ئـەزموونی سەربازیت ئاگادارە. منداڵەکانم هێشتا ئـەوە نـازانن. پـێم وانییـە ئێسـتا

تێبگەن لەو بابەتە وەك ئەوەی من و ژنەکەم لێی تێدەگەین". سەرم لەقاند و بەردەوام بووین.

پاش چەند بەرز و نزمییەك گەیشتینە خانووەکەی مامم. بەسەر شارەکەدا دەیڕوانی. لە دالآنەکەوە دیمەنی بەندەرەکە و دەریا دەبینرا. دیمەنێکی جوانی هەبوو. ئەمە ئەو جێیە بوو کە دەبووە ماڵی من. خانووەکە کارەبا و ئاوی نەبوو. موبەقەکە لە خانووەکە جیاکرابووەوە و لە چینکۆ دروستکرابوو. چەند مەترێك لە حەوشەکەوە لەژێر درەختێکی مانگۆوە توالێتێك و جێیەکی خۆشتنی لێبوو. بیری ماتروجۆنگی خستمەوە.

هەر چووینە سەرەوە، لە دالآنەکەدا ژنی مامم هاتە دەرەوە، ڕووخساری دەبریقایەوە وەك ئەوەی بە درێژایی ژیانی پۆڵیشی کردبێت. لەبەردەم دەرگاکە وەستابوو، پێش ئەوەی بەتوندی باوەشم پێدا بکات، ڕۆبەکەی لەخۆیەوە پێچا. هات و باوەشی پیادا کردم، هەستم دەکرد لوت و دەمم بە قۆڵییەوە دەچەسپێت.

بەریدام و لە بەردەمم وەستا و ڕوومەتەکانمی گوشی. "بەخێربێیت کورم" ژنێکی باڵا کورتی قژ ڕەش بوو، چاوەکانی کاڵ بوون و ڕوومەتەکانی خڕ بوون.

مامم منداڵی نەبوو، بۆیە منداڵی ئەندامانی تری خێزانەکەی بەخێو دەکرد. چوار منداڵ بوون. ئالیی لە هەموویان گەورەتر بوو، ماتیلدا، کۆنا، سۆمبۆ لە هەموویان بچووکتر بوو. تەمەنی شەش ساڵان بوو.

"گەر حەزت لە کاری دارتاشییە، بە دڵنیاییەوە دەتکەم بە وەستا لای خۆم، بەڵام من باوکت بناسم تۆ حەزت لە خوێندنە". زەردەخەنەیەکم کرد و هیچم نەوت. ئالیی هاتە دەرەوە و ڕووخسەتی لە مامم وەرگرت تا من لەگەڵ خۆی ببات بۆ سەیرکردنی یارییەکی فووتبۆڵی ئارخۆیی. مامم وتی ئەو ڕێگە دەدات ئەگەر من خۆم بمەوێت، لەگەڵ ئالیی چووم بۆ گۆڕەپانێکی یاریکردن ناوی (برووکفیلد) بوو.

هەموویان کاروبارەکانیان جێهێشتبوو، هاتبوونە دالانەکە تا باوەش بە "براکەیان"دا بکەن وەك ئەوەی مامم وتبووی.

پاش ئەوەی ئالیی باوەشی پیاداکردم، وتی: "پێمخۆشە کوڕێکی تر بێتە خێزانەکەوە". لەگەڵ مامم دەستیان کرد بە پێکەنین، منیش بزەیەکم بەڕوویاندا کرد.

ئەو دوانیوەڕۆیە زۆر بێدەنگ بووم، دوای یەکترناسینەکە هەریەکەیان چوون بەلای کاروباری خۆیانەوە. لەگەڵ مامم و ئامۆژنمدا مامەوە. لە دالانەکە دانیشتین چاوم بڕیبووە شار. دیمەنێکی تەواو جوانی هەبوو. هەرکات ئاوڕم دەدایەوە بۆ مامم، بە زەردەخەنەیەکی پان لەسەر لێوەکانی سەیری دەکردم. ئامۆژنم زوو زوو قاپی گەورەی پڕ برنج و شلە و گۆشت و ماسی بۆ دەهێناین لەگەڵ پلانتین*.

ئەوەندەی دەرخوارد دام گەدەم کشابوو. پاش نان خواردن، مامم کەلوپەلی دارتاشی پیشان دەدام لەگەڵ مێزی ئیش کردنەکەی کە لەدەرەوە دانابوو. لایەکی حەوشە بچووکەکەی داگیرکردبوو.

---

* میوەیەکی هاوشێوەی مۆزە.

تالیی کە چاوەڕوانی دەستپێکردنی یارییەکە بـوو، وتـی: "پێمخۆشـە لەگەڵ ئێمە دەژیت، دەتوانین لە یەك ژووردا پێکەوەبین".

ئەو لە من گەورەتربوو، خوێندنی ناوەندیی تەواوکردبوو، زۆر ڕووخۆش و هەڵسوکەوت جوان بوو. بە جوانی دەدوا. پێش ئەوەی یارییەکە دەسـت پـێ بکات، کچێك دەستی ڕاوەشاند بۆمان. جوانترین و کراوەتـرین زەردەخەنـەی هەبوو. زۆر پێدەکەنی. دەمویست بپرسم ئەو کچە کێیە. "ئـەوە ئامۆزامـە لەوبەری شەقامەکە لە ماڵێکی خانـەخوێ دەژی، نـاوی ئەمیناتایـە، زوو دەیناسیت...".

ئەمیناتا دووەم کچی مامم بوو، کە دایکیان جیابوو. دواتر لـە تـالیی نزیکتربوومەوە وەك لە منداڵەکانی تر. بەدرێژایی ئـەو پیاسـانەی لەگـەڵ مامم دەکرد، بۆم دەرکەوت باپیرەم ژنی زۆری هەبووە و بـاوکم هـیچ کـات باسی براکانی تری نەدەکرد. باوکم تەنها منداڵ بووە لە دایکی خۆی.

بە درێژایی یارییەکە هەر بـیرم لـەو خێزانـە دەکـردەوە کـە زۆربـەیانم نەدەناسی. زۆر دڵخۆش بـووم بـەڵام وا ڕاهـاتبوون دەرینـەبرم. تـالیی بـە درێژایی یارییەکە پێدەکەنی، من تەنها زەردەخەنەیەکیشـم پـێ نـەدەکرا. کاتێك گەڕاینەوە، مامم لە داڵانەکە بوو چاوەڕێی دەکـرد تـا بمباتـەوە بـۆ خانەکە. دەستی گرتم و بـەرەو شـوێنی وەسـتانی پاسـەکان ڕۆیشـتین. بـە درێژایی گەڕانەوە بێدەنگ بووم تەنها ئەو کاتە نەبێت کە سوپاسی مـامم کرد بۆ ئەو بڕە پارەیەی پێی دابووم، گەر لەکاتێکدا ویستم خۆم سـەردانی بکـەم. هەرگەیشـتینە سـەنتەرەکە باوەشـی پیـادا کـردم و وتـی: "زوو دەتبینمەوە، کوڕەکەم".

# نۆزدە

دوو هەفتەی پێشوو لیسلی پێی وتبووم کە دەنێردرێمەوە و تێکەڵ بە ژیانی ئاسایی کۆمەڵ دەبم و لەگەڵ مامم دەژیم. ئەو دوو هەفتەیە درێژتر بوو لەو هەشت مانگەی لە خانەکە بەسەرم بردبوو. زۆر غەمی ژیانی ناو خێزانم بوو، ساڵانێك بوو بێ ڕێنمایی هیچ کەسێك ژیانم بەسەردەبرد. لەوە دەترسام مامم بە سوپاسگوزارم نەزانێت، سەرەڕای ئەوەی پێویست نەبوو بمگرێتە خۆی. ئەگەر خۆم لە ئەندامانی ئەو خێزانە بەدووربگرتایە، چۆن دەمتوانی بەرگەی خەوەناخۆشەکان و سەرئێشەکان بگرم؟ چۆن باسی ئەو شتانە بکەم کە دڵتەنگیان دەکردم، بەتایبەتی لەگەڵ منداڵەکان. ئەو هەستانەی توانای شاردنەوەیانم نەبوو لەتاوا خۆیان بە ڕووخسارمەوە هەڵدەواسی کە ئەم شتانەی بە ئیستەر وت، پێی وتم کە هەموو شتێك باش دەبێت، بەڵام چاوەڕێی وەڵامێکی زیاتر لە دڵنیاکردنەوە بووم. هەموو شەوێك ڕادەکشام و چاوم دەبڕییە بنمیچەکە و دەمپرسی لەبەرچی من لەدوای ئەو جەنگە مامەوە؟ بۆ لەناو هەموو خێزانەکەم هەر من زیندوو مام؟ نەمدەزانی بۆ. وازم لە یاریی فووتبۆڵ و تێنس هێنا، ڕۆژانە سەردانی ئیستەرم دەکرد سڵاوم لێدەکرد و لەبارەی تەندروستییەوە پرسیارم دەکرد و پاشان ون دەبووم لە مێشکی خۆمدا و لە بیرکردنەوەدا نووقم دەبووم. دەبێت ژیان دوای سەنتەرەکە چۆن بێت؟ هەندێ جار ئیستەر لەبەر دەممدا چەقەنەی لێدەدا تا بێمەوە سەرخۆم. شەوانە لە داڵانەکە لەگەڵ مامبو،

محەمەد و ئەلهاجی دادەنیشتین. ئەو کاتەی من دەهاتمەوە سەرخۆم ئەوان کورسییەکانیان جێهێشتبوو، بێنەوەی من هەستی پێ بکەم. ئەو ڕۆژەی پێویست بوو خانەکە جێبهێڵم هەموو کەلوپەلەکانم لە زەرفێك نا، جووتێ کالە و چوار تیشێرت و سێ شۆرت و فلّچە و دەرمانی دان و ڤازلین و دوو پانتۆڵ و دوو کراس و بۆینباخێك کە بۆ کۆبوونەوە و دانووستانە ڕەسمییەکان بۆیان کڕیبووم لەگەڵ چەند کاسێتێك و ئامێری کاسێتەکان. چاوەڕێ بووم و دڵم خێراتر لێی دەدا، خێراتر لەو کاتەی دایکم بۆ یەکەمین جار بردمی بۆ خوێندنگەی ناوخۆ. دەنگی ئۆتۆمبێلەکە لە دوورەوە هات لەسەر ڕێگا خۆڵەکە هەڵبەز و دابەزی بوو. زەرفەکانم هەڵگرت و بەرەو بینای نەخۆشخانەکە ڕۆیشتم تا لەوێ چاوەڕێ بم. مامبو و ئەلهاجی و محەمەد لەسەر پلیکانەکانی بەردەم دەرگاکە دانیشتبوون، ئیستەریش هاتە دەرەوە و بزەی دەکرد. ئۆتۆمبێلەکە پێچێکی کردەوە و لەلایەکی ڕێگاکە وەستا. دوانیوەڕۆ بوو، ئاسمان شین بوو، بەڵام خۆر بێڕەنگ لەپشت تەنها هەورێکەوە خۆی حەشاردابوو. لێسلی لە پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکە دانیشتبوو چاوەڕێی منی دەکرد تا بمبات بۆ ماڵە نوێیەکەم. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتم: "من دەبێت بڕۆم"، دەستم درێژ کرد تا تەوقە لەگەڵ محەمەد بکەم، بەڵام ئەو بە توندی لە باوەشی گرتم. مامبوش باوەشی پیاکردم و توند گوشیمی هێشتا محەمەد باوەشی پیادا کردبووم، وەك ئەوەی ئەمە ماڵئاوایی هەتاهەتایی بێت. (دوای ئەوەی خانەکەم جێهێشت، مامبو گەڕابووەوە بۆ ئەوێ، چونکە خێزانەکەی ڕازی نەبوون بیگرنە خۆیان). ئەلهاجی تەوقەی لەگەڵ کردم دەستی یەکترمان گوشی و چاومان

بڕییه یەك، وەك ئەوەی هەردووكمان بیری هەموو ئەوانەمان كەوتبێتەوە كە بەسەرماندا هاتبوون. بە هێواشی كێشام بـە شـانیدا وەك ئـەوەی دڵنیـای بكەمەوە كە هەردووكمان باش دەبین، ئەویش بزەیەكی كرد وەك ئەوەی لـە مەبەستەكەم گەیشتبێت. دوای ئەوەی تەوقەمان كـرد كـەمێك گەڕایـەوە دواوە و سڵاوی سەربازی لێكردم بە چرپە وتی: "ماڵئاوا سەرۆكی سـوپا"، بزەیەكم كرد و نەمتوانی سڵاوی لێ بكەوە دوای ئـەوە چـیتر نەمبینییـەوە لەم خانوو بۆ ئەو خانوو دەگوێزرایەوە. پاشان ئیستەر بە چاوی پڕ فرمێسك توندتر لە جارانی پێشوو باوەشی پیاكردم، من بە ساردی باوەشـم پیـاكرد سـەرقاڵی شـاردنەوەی فرمێسـكەكانم بـووم. پارچـە كاغـەزێكی خسـتە دەستمەوە "ئـەوە ناونیشـانی منـە، هـەركات ویسـتت دەتـوانی سـەردانم بكەیت".

دوای چەند هەفتەیەك سەردانی ئیستەرم كردەوە، بەڵام كاتەكە گونجـاو نەبوو، لەسەر ڕێی ڕۆیشتن بوو بۆ سەر كارەكەی، باوەشی پیـاكردم ئـەجارە منیش باوەشم پیاكردەوە، بەمە دڵی خۆش بوو، پێكەنی و چـاوی تێـبڕیم و وتی: "هەفتەی ئایندە سەردانم بكەرەوە تا كاتی زیاتر بەسەر بەرین"، جلە سپییەكانی لەبەركردبوو و بەڕێوە بوو بۆ پشكنینی منداڵـە نەخۆشـەكان. كارێكی ئاستەم بوو لەگەڵ ئەو هەموو چیرۆكی جەنگەدا بژیت. من تەنها لەگەڵ یەك چیرۆك دەژیام كە تا ئەوكاتەش بە شـەوانە خـەوە ناخۆشـەكان ئازاریان دەدام. بۆچی ئیستەر ئەو كارە دەكات؟ بۆ ئـەوانی تـر ئـەو كـارە دەكەن؟ ئەو كاتە دوایەمین جارم بوو بیبینمـەوە، خۆشـم دەویسـت، بـەڵام هەرگیز پێم نەوت.

هەرکە گەیشتم، مامم لە ئۆتۆمبێلەکەوە هەڵیگرتم و تا لای دالآنەکە بردمی "ئەمڕۆ وەك سەرۆك پێشوازیت لێدەکەم، پلەی سەرۆکایەتی لەدەست دەدەیت گەر قاچت بکەوێتە سەر زەوی. ئەوەش هەر ئێستا ڕوودەدات". پاشان دایناام و پێکەنی، بەڵام من زەردەخەنەیەکم بەڕوویدا کرد و زۆر لە دڵەڕاوکێدا بووم. هەر چوار ئامۆزاکەم ئالیی و سێ کچەکە هاتن و باوەشیان پیادا کردم. ڕووخساریان بە زەردەخەنە دەدرەوشایەوە.

ئامۆژن وتی: "ڕەنگە برسیت بێت، بۆ بەخێرهاتنت ژەمە خوانێکی ساکی تۆمبۆیم بۆ ئامادەکردوویت". گەلای کاساڤای لەگەڵ مریشك بۆ ئامادە کردبووم. مریشك ئامادەکردن نیشانەی ڕێزێکی گەورە بوو زۆر بە کەمی ئامادە دەکرا. خەڵکی تەنها لە بۆنەکانی سەری ساڵ، یان کرسمس مریشکیان لێدەنا. پوورە سالیی دەستی گرتم و لەسەر کورسییە بێ پشتەکەی تەنیشت مامەوە دایینیشاندم. خواردنەکەی هێنا من و مامم لە یەك قاپ بەدەست دەمانخوارد خواردنێکی بەتام بوو، لەکۆتاییدا پەنجەکانم لێسانەوە و چێژم لە ڕۆنی دارخورماکە دەبینی. مامم سەیری کردم و پێکەنی: "سالیی ئەمجارەش سەرکەوتووبوویت. ئەوەتا ئەمیش لامان دەمێنێتەوە".

پاش ئەوەی دەستمان شت، ئالیی بانگ کرا بۆ دالآنەکە تا ژووری نوستنەکەم پیشان بدات. زەرفەکانم کۆکردەوە و چووینە خانوویەکی تر کە لەپشت ژووری نووستنەکەی مامەوە دروستکرابوو، ڕێگای نێوان هەردوو خانووەکان بە بەردی لەسەر یەك هەڵچنراو گیرابوو. ئالیی دەرگاکەی بۆ گرتم چوومە ناو ژوورێکی پاك و جوان ڕێکخراو. سەر جێگاکان

ڕێکخرابوون جلەکان نوتوکراو و هەڵواسرابوون. پێڵاوەکان بۆیاخکرابوون و لەسەر ڕەفە بە ڕێکوپێکی ڕیزکرابوون. زەمینەی ژوورەکە قاوەییەکی بریقەدار بوو. ئالیی دۆشەکێکی لەژێر جێی خەوتنەکە دەرهێنا و پێی وتم کە لەسەر زەوییەکە دەخەوم. پاشان پێی وتم پێویستە هەموو بەیانییەك دۆشەکەکە بخەمەوە جێی خۆی، پاش ئەوەی لە چۆنێتی ڕێکخستنی ژوورەکە تێگەیشتم، چوومەوە دەرەوە و لە داڵانەکە لەگەڵ مامم دانیشتم.

دەستی کردە ملم و لووتمی ڕاکێشا: "ئێستا بە شارەکە ڕاهاتوویت؟"

-"زۆر نا".

-"ئالیی دەتباتە دەرەوە، یان پێویستە خۆت بە تەنها بڕۆیت تا ون دەبیت و ڕێگاکەت دەدۆزیتەوە، ئەوەیان باشترین ڕێگەچارەیە بۆ شارەزابوون". لەبەر خۆیەوە پێکەنی. پاشان دەنگی بانگ هەموو شارەکەی پڕ کرد.

-"دەبێت بڕۆم بۆ نوێژ. ئەگەر شتێکت پێویست بوو بە ئامۆزاکانت بڵێ. "پاشان لەسەر سەکۆی سەر پێپلیکانەکان کترییەکی هێنا و دەستنوێژی گرت و بە گردەکەدا چووە خوارەوە بۆ مزگەوتێکی نزیك. پورە سالیش سەرپۆشێکی دا بەسەریدا و دوای مامم کەوت.

هەناسەیەکم هەڵکێشا و بەتەنها لە داڵانەکەدا مامەوە. چیتر دوودڵ نەبووم، بەڵام بیری خانەکەم دەکرد. ئەو ڕۆژە پاش ئەوەی مامم و ئامۆژنم لە نوێژ گەڕانەوە، هەموو خێزانە نوێیەکەم لە داڵانەکەدا کۆبوونەوە و گوێیان لە کاسێتی چیرۆك دەگرت بە دەنگی چیرۆك گێڕەوەیەکی بەناوبانگ بە

ناوی (لیلیە گبۆمبا). مـامم دەسـتەکانی هـەڵگلۆفین و دەسـتی نـا بـە دوگمەی PLAY.

چیرۆکەکە باسی لە پیاوێك دەکـرد کـە دڵـی خـۆی لـە ماڵـەوە لـێ بەجێدەمێنێت، کاتێك بە هەموو جیهاندا گەشت دەکات. وەختی خۆی ئەو چیرۆکەم لـە مـاڵی دایـە گـەورە بیسـتبوو. هـەموویان گوێیـان گرتبـوو پێدەکەنین. منیش جار بەجار زەردە دەیگـرتم بـە درێـژایی ئـەو شـەوە زۆر بێدەنگ بووم بۆ ماوەیەك وا بووم، بەڵام دواجار ڕاهاتم لەناو خێزانێـك کـە هەمیشە دڵخۆش بوون.

دوای ڕۆژێ، یان دوو ڕۆژ لە مانەوەم لە ماڵە نوێیەکەم. ئالیی جوتێـك پێڵاو و کراس و قایشی جوانی دامێ.

"ئەگەر دەتـەوێت وەکـو پیـاوێکی بـەڕێز دەرکـەویت، پێویسـتە بـەم شێوەیە خۆت بگۆڕیت". پاشان پێکەنی. ویستم بپرسم بۆچی ئـەم شـتانەم دەداتێ، ئەو بەردەوام بوو: "ئەمە نهێنییە. ئەمشەو دەتبەم بۆ ئاهەنگ تـا کەمێك کاتی خۆش بەسەربەریت. هەرکە مامم خەوت دەڕۆین".

ئەو شەوە بە نهێنی چووینەدەرەوە، ڕۆیشتین بۆ یانەیـەکی سـەماکردن. ئەوکاتەی چووینە ژوورەوە، ئەو کاتانەم بیر کەوتەوە کـە لـە خوێندنگـەی ناوەندیی بووم، شەوانە بۆ ئاهـەنگ گێـڕاین دەچـووین بـۆ یانـەکان و تـا بەرەبەیان سەمامان دەکرد، پاشان تیشێرتە ئارەقاوییـەکانمان دادەکەنـد و لەبـەر هـەوای بەرەبـەیان دەوەسـتاین. پاشـان دەگەڕاینـەوە بـۆ ژوورە ناوخۆییەکانمان. هەریەك لەو شەوانە ناوێکی تایبەت بە خۆی هـەبوو وەك

(گەڕانەوە بۆ خوێندنگە)، (دانانی پێنووسەکانمان-بە بۆنەی تەواوبوونی خوێندنگە)، یان (شەوی بۆب مارلی).

"ئەوە گەیشتین" ئالیی دەستمی ڕاوەشاند و چەقەنەی لێدا. ژمارەیەکی زۆر گەنج لە ڕیزەکەدا وەستابوون تا بچنە ژوورەوە. کوڕەکان کراسی ئوتوکراویان لەبەر کردبوو، خستبوویانە ناو پانتۆڵەکانیان و کچەکان جوان خۆیان گۆڕیبوو، عەزیی و پێڵاوی پاژنە بەرزیان لەپێ کردبوو کە هەندێکیان لەو کوڕانە درێژتر بوون کە لەگەڵیان هاتبوون. سووراوی ڕەنگاوڕەنگیان لە لێویان دابوو.

ئالیی زۆر دڵخۆش بوو لەگەڵ چەند کەسێك لە پێشمانەوە قسەی دەکرد، منیش هەر سەیری ئەملاولا و گڵۆپەکانی بەردەم دەرگای چوونەژوورەوەم دەکرد. گڵۆپێکی گەورەی شینی لێبوو کە کراسە سپییەکانی جوانتر دەردەخست. دواجار سەرەمان هات و ئالیی پارەی هەردووکمانی دا. دەنگی گۆرانی بەرز لە ژوورەوە دەهات. ساڵانێکی زۆر بوو نەچووبووم بۆ یانە. بۆیە دوای ئالیی کەوتم بۆ بارەکە لەسەر دوو کورسی بەرز دانیشتین.

ئالیی هاواری کرد تا گوێم لێ بێت "من دەچم بۆ سەماکردن". منیش هەر بە یانەکەدا چاوم دەگێڕا و لە جێی خۆمەوە کەوتمە سەماکردن. لەناکاو کچێکی پێست تا ڕادەیەك ڕەش بە زەردەخەنەیەك بەرەو لای خۆی ڕاکێشام، پێش ئەوەی هیچ بکەم کەوتە سەماکردن لە نزیکمەوە. ئاوڕم بۆ ئالیی دایەوە ئەویش پێکەنی و قامکی دۆشاومژەی بەرز کردەوە. پاشان

گۆرانییەکە گۆڕا بۆ گۆرانییەکی خاو دەستمی بەرەولای خۆی ڕاکێشا و منیش بە ناسکی دەستەکانیم گرتن. هەستم بە ترپەی دڵی دەکرد دەیویست چاو ببڕێتە چاوەکانم، بەڵام من ڕووم وەرگێڕا. لەناکاو چەند کوڕێك دووریانخستەوە لێم. کاتێ بەرەو دەرگای دەرەوە بڕا ماڵئاوایی لێکردم.

پاشان ئالیی هاتە تەنیشتم و چووەوە لای بارەکە، منیش بەدوایدا ڕۆیشتم پاڵمان دایەوە بە مێزەکە و ڕوومانکردە گۆڕەپانی سەماکردنەکە. ئالیی زەردەخەنەی دەکرد "بینیمیت چەند پیاوێکی نەرمیت!"

-"بەڕاستی من هیچم نەکرد. ئەو دەیویسیت سەما بکات، منیش نەمەتوانی بڵێم نا".

"بێگومان تۆ هیچ ناڵێیت، ئەویش سەمات لەگەڵ دەکات"، بە گاڵتەوە پێی وتم. لەو کاتەدا بیری ئەو هێرشەم کەوتەوە کە بۆ سەر یەکێك لە خوێندنگەکان کردمان، مەیدانی سەمای خوێناویی هاواری مامۆستاکان و قوتابییەکان. ئالیی بە هێواشی پیایدا کێشام هاتمەوە سەرخۆم، بەڵام هێشتا دڵم تەنگ بوو. بە درێژایی شەو سەمامان دەکرد و پێش ئەوەی مامم لەخەو هەستێت، گەڕاینەوە.

شەوێکیان بەتەنها گەڕامەوە بۆ یانەکە. هەمان ئەو کچەی یەکەم شەوم بینی. ئەویش بە تەنها هاتبوو، پێی وتم: "ببوورە بۆ ئەو شەوە براکانم دەڕۆیشتنەوە پێویست بوو لەگەڵیان بڕۆم، ئەگینا دایك و باوکمان غەمیان دەبوو".

بۆ ماوەی سێ هەفتە پێکەوە بووین، بەڵام پرسیاری زۆر دەکرد وەك خەڵکی کوێیت؟ چۆن گەورە بوویت لە (ئەپلاین)؟ ئەپلاین وشەیەکی ناو زمانی کریۆ بوو، زیاتر لەناو (فری تاون)دا بەکاردەبرا. ئاماژەیە بۆ شار و گوند و بەشە دواکەوتووەکانی وڵاتەکە، لە شێوازی هەڵسوکەوتیان و شوێنی ژیانیان. منیش نەمدەویست وەڵامی بدەمەوە، بۆیە خۆی وازی لێم هێنا. ئەمە چیرۆکی پەیوەندییەکانمە لەگەڵ کچەکانی (فری تاون)، ئەوان دەیانویست هەموو شتێك بزانن، منیش ئامادە نەبووم بۆیان باس بکەم. بەلاشمەوە ئاسایی بوو، خۆم حەزم دەکرد تەنها بم.

ڕۆژێك لێسلی سەردانی کردم و پرسیاری لێکردم کە چۆنم و بە چییەوە سەرقاڵم و تەندروستیم چۆنە. لەبری ئەوەی پێی بڵێم سەرئێشەیەکی توندم تووش بووە لە ئەنجامی چەند یادگارییەکی وەك سووتاندنی گوندەکان و ئەو دەنگە جەرگبڕانە و هەستکردن بە قوورسبوونی سەرم و ملم کاتێك بەردیان لەسەردادەنا لە خەونەکانمدا، وتم هەموو شتێك باشە.

لێسلی دەفتەرێکی تێبینی دەرهێنا و چەند شتێکی نووسی، پاشان وتی "داوایەك هەیە پێویستە ئاگادار بیت، زۆر گرنگە".

بە گاڵتەوە وتم: "هەمیشە هەواڵت پێیە، وانییە؟"

"زۆر گرنگە"، پاشان لە دەفتەرەکەی بەردەستی وردبووەوە و بەردەوام بوو "لە UN چاوپێکەوتن لەگەڵ دوو کوڕ دەکرێت تا بنێردرێن بۆ شاری نیویۆرك لە ئەمریکا و باس لە ژیانی منداڵانی سیرالیۆن بکەن و ڕێگەچارەکان دیاری بکرێت. بەڕێز کامارا بەڕێوەبەری خانەکە پێشنیازی کرد تۆ هەڵبژێردرێیت. ئەمە ناونیشانەکەمە ئەگەر پێت خۆشە". پاشان

پارچە وەرەقەیەکی دایە دەستم کاتێك لێی وردبوومەوە پێی وت: "خۆت بگۆڕە بۆ چاوپێکەوتنەکە. وەرە بۆ ئۆفیسەکە گەر پێت خۆشە منیش لەگەڵت دێم". پاشان لێم وردبووەوە و بەدوای وەڵامێکدا دەگەڕا من هیچم نەوت. بە زەردەخەنەیەك کە دڵنیابوو بەشدار دەبم، چووە دەرەوەی ژوورەکە.

ڕۆژی چاوپێکەوتنەکە ئاسایی خۆم ئامادەکرد، جووتێ کالەم لەپێکرد لەگەڵ پانتۆڵێکی ڕەش و کراسێکی سەوز خستمە ناو پانتۆڵەکەوە و بە شەقامی (سیاکا ستیڤنس)دا چوومە خوارەوە بەرەو ئەو شوێنەی لێسلی ناونیشانەکەی دابوومێ. بە کەسم نەوت بۆ کوێ دەچم. دەمویست لای ئالیی باسی بکەم، بەڵام دوودڵ بووم گەر پێم بوتایە زیاتر لەوەی دەیزانی و مامم پێی وتبوو ژیان و ڕابردوومی بۆ دەردەکەوت.

نزیکەی نیوەڕۆ بوو، ڕێگاکە تەواو گەرم بوو. بازرگانەکان سەرنجی خەڵکەکانیان ڕادەکێشا. ئۆتۆمبێلێك وەستا و شۆفێرەکە ئاوی دەکرد بە مەکینەکەیدا و بۆڵەبۆڵێکی لەبەر خۆوە کرد "ئەم مەکینەیەم لە مانگایەك زیاتر ئاو دەخواتەوە..."، خوارەوەی کراسەکەم ئارەقاوی ببوو. کاتێك گەیشتمە بینایەکی بەرز، پێش ئەوەی بچمە ژوورەوە، کەمێك لە بەرزییەکەیم ڕوانی. چوومە ژوورەوە لە هۆڵەکە نزیکەی بیست کوڕی لێبوو هەموویان لە من جوانتر خۆیان گۆڕیبوو لەگەڵ دایك و باوکیان بوون. سەیری شێوازی دروستکردنی بیناکەم دەکرد، هەمیشە پێم سەیر بوو چۆن خەڵك ئەو دیوارە چیمەنتۆیانە وا بەرز دەکەنەوە. لە نیوەی بیرکردنەوەدا بووم. پیاوێك لە دواوە بە شانمیدا کێشا، ویستی بزانێت بۆ چاوپێکەتن لەوێ بووم؟ سەرم لەقاند و ئیشارەتی بۆ سندووقێکی کانزایی

کرد کە هەموو کوڕەکان چووبوونە ناوی. لەوێ بە دوودڵییەوە وەستام، کوڕەکان پێم پێدەکەنین، پێویست بوو دەست بە ژمارەیەکدا بنێم تا سندووقەکە بکەوێتە کار، ئەوە یەکەمین جارم بوو بچمەوە ئەو جێیە. یەکێك لە کوڕەکان پەنجەی نا بە ژمارە ٥ دەرگای سندووقەکە داخرایەوە. سەیری ئەملاولای خۆمم کرد هەموویان بێدەنگ بوون، بۆینباخ و کراسەکانیان چاك دەکرد. ئەو کات کەمێك هاتمەوە سەرخۆم. دەرگاکە کرایەوە من دوایەمین کەس بووم کە چوومە دەرەوە. ژوورێکی گەورەی کراوە بوو چەند قەنەفەیەکی چەرمی قاوەیی تێدابوو. پیاوێك لەپشتی مێزێك دانیشتبوو ئیشارەتی بۆ کردم تا جێیەك بدۆزمەوە و دابنیشم.

کوڕەکانی تر هەر زوو دانیشتن. من دوور لەوان جێیەکم دۆزییەوە و سەیری ئەملاولام دەکرد لە پەنجەرەکەوە سەیری بیناکانی ترم دەکرد. هەستامە سەرپێ تا سەیری دەرەوە بکەم و بزانم بیناکە چەند بەرزە. هەر زوو بانگ کرام. پیاوێکی پێست کاڵ (دڵنیا نەبووم خەڵکی سیرالیۆن بێت یان نا) لەسەر کورسییەکی چەرمی ڕەشی گەورە دانیشتبوو، بە زمانی ئینگلیزی پێی وتم: "تکایە دانیشە، پاش کەمێکی تر دێمە لات".

پاشان چاوی بە چەند پەڕەیەکدا خشاند و تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و ژمارەکەی لێدا، هەرکە پیاوەکەی تر وەڵامی دایەوە، ئەم پێی وت: "با دەست پێ بکات". پاشان تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

ڕووی تێکردم و ماوەیەك چاوی تێبڕیم. بە دەنگێکی نزم بە ئینگلیزی پێی وتم: "ناوت چییە؟" سەیری لیستەکەی بەردەمی کرد.

"ئیشمایل" پێش ئەوەی ناوی دووەمم بڵێم، چاوی بە لیستەکەدا خشاند.

سەری لەسەر لیستەکەی هەڵبڕی و سەیری کردم "بەڕای تۆ لەبەرچی پێویستە بچیتە نەتەوە یەکگرتووەکان و باس لەو ژیان و بارودۆخە بکەیت کە کاریگەری هەیە بۆ سەر منداڵانی وڵاتەکەت".

"ئەوەی ڕاستی بێت. من بەشێکم لەم وڵاتە، نەك هەر بەدەست جەنگەوە چەشتوومە، بەڵکو خۆشم تیایدا بەشداربووم. و بەپرۆسەی گەڕانەوە بۆ باری ئاسایدا بڕاوم. بەپێی ئەو ئەزموونەی من هەمە، تێگەیشتنێکی باشم هەیە لە ڕووداوەکان. نەك ئەم کوڕە شارییانە کە هاتوون بۆ چاوپێکەوتن. بەتەمان چی بڵێن کە چوونە ئەوێ؟ هیچ شتێك دەربارەی جەنگ نازانن تەنها چەند هەواڵێکیان پێگەیشتووە و لەبارەی جەنگەوە"، سەیری پیاوەکەم کرد کە زەردەخەنەی دەکرد، ئەمە تووڕەی کردم.

پاشان لێی پرسیم: "هیچ شتێکی ترت هەیە بیڵێیت؟"

"نەخێر، تەنها دەمەوێت هۆکاری ئەم زەردەخەنەیەت بزانم"، پاشان لەسەر کورسییە چەرمەکە پاڵمدایەوە.

پیاوەکە وتی: "ئێستا دەتوانیت بڕۆیت"، هێشتا هەر زەردەخەنەی لەسەر لێو بوو.

چوومە دەرەوە و دەرگاکەم لەدوای خۆم دانەخستەوە. لەبەردەم سندووقە ئاسنینەکە بۆ ماوەی چەند دەقەیەك وەستام. نەمدەزانی چۆن بیبەمە سەرەوە. کوڕەکانی چاوەڕێی چاوپێکەوتنەکە بوون پێم پێدەکەنین. پیاوەکەی

پشت مێزەکە بەرەو ڕووم هات و دەستی نا بە ژمارە یەك. کاتێك هاتمە دەرەوە لە بیناکە سەیری نەخشە سەرنجڕاکێشەکەیم دەکرد لە دڵی خۆمدا دەموت گەر محەمەدم بینی، هەموو ئەم شتانەی بۆ باس دەکەم.

ئەو دوا نیوەڕۆیە بە پیاسە گەڕامەوەماڵەوە. زۆر خەیاڵم لای چاوپێکەوتنەکە نەبوو، تەنها پێم سەیر بوو ئەو پیاوە زەردەخەنەی دەکرد، ئەو شتانەی من پێم وتبوو، جێی پێکەنین نەبوون. ئۆتۆمبێلی سەربازی و مارسیدی بینز بەلامدا فیشکەیان کرد تالأی نەتەوەییان هەڵکردبوو، جامەکانیان ڕەش بوو، بۆیە نەمدەزانی کێ لێیدەخوڕێت.

گەیشتمەوە ماڵەوە و لە نالیم پرسی ئەو پیاوە بەهێزە کێیە بەم شێوەیە بە شارەکەدا دەگەڕێت. پێی وتم ناوی (تێجان کابا)یە هەشت مانگ لەمەوبەر بە سەرۆکی نوێ هەڵبژێردراوە لەلایەن پارتی خەڵکی سیرالیۆن.

لە مارسی ١٩٩٦. من هیچم دەربارەی نەبیستبوو.

ئەو شەوە مامم زەرفێك فستقی هێنایەوە و ئامۆژنم لەسەر سینییەکی گەورە هێنایە دالأنانەکە، هەموو دەورمان لێدا و گوێمان لە چیرۆکێکی تری (لێلێە گبۆمبا) گرت.

چیرۆکی ئەمجارە باسی لەوە دەکرد، چۆن هاوڕێکەی ناسیوە پێش ئەوەی هەردووکیان لەدایك بن. دایکیان دراوسێ بووە هەردووکیان دووگیان بوون، بۆیە جار بەجار ئەمان یەکیان دەبینی لە سکی دایکیاندا. زۆر بە خۆشی باسی لەو کاتانە دەکرد کە بەسەریان بردووە، وەك: ڕاوکردن و یاریکردن و چۆن گوێیان لەناو جیهانی ئێمە گرتووە. چیرۆکێکی

پێکەنیناوی تا ڕادەیەك هەڵگیڕاوە. مام و ئامۆژن و ئامۆزاکانم بێ وەستان پێدەکەنین تەنانەت دوای تەواوبوونی چیرۆکەکەش. منیش دەستم کرد بە پێکەنین لەبەر ئەوەی مامم دەیویست شتێك بڵێت، بەڵام لەبەر پێکەنین دەنگی دەیبڕی و نەیدەتوانی وشەی دواتر بڵێت. مامم بە کەمێك پێکەنینەوە وتی: "پێویستە ئەمە دووبارە بکەینەوە، پێکەنین بە سوودە بۆ ڕۆحمان". شەوباشمان لە یەك کرد و چووین بۆ خەوتن.

بەیانییەك بەڕێز کامارا سەردانی ماڵی مامی کرد. پێی وتم لە چاوپێکەوتنەکەدا سەرکەوتوو بووم و هەڵبژێردراوم بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان. من تەنها بە محەمەدم وتبوو لەو بڕوایەدا نەبووم هەرگیز بچمە نیویۆرك. ئەو بەیانییەی بەڕێز کامارا سەردانی کردم، مامم ڕۆیشتبوو بۆ ئیش. ئامۆژنم لە موبەقەکە بوو، ئەو جۆرەی سەیری کردم بۆم دەرکەوت کە دەیەوێت پێم بڵێت مامم هەر زوو بەو سەردانەی بەڕێز کامارا، دەزانێت پێویستە خۆم بە مامم بڵێم دەربارەی گەشتەکە.

"بەیانیتان باش" بەڕێز کامارا سەیری کاژێرەکەی کرد تا دڵنیا بێت هێشتا بەیانییە.

"بەیانیت باش".

"ئامادەیت بچیتە ناو شار و ئامادەکاری بکەین؟" بە ئینگلیزی پێی وتم لەبەر ئەوەی هەڵبژێردرابووم.

ماڵئاوایم لە ئامۆژنم کرد و خۆم فڕێدایە ئۆتۆمبێلەکەوە تا پاسپۆرتم بۆ دروست بکەن.

خۆشبەختانە بەڕێز کامارا لەمەوپێش کاتی چاوپێکەوتنەکەی دانابوو، لەبەر ئەوە پێویست نەبوو لە ڕیزدا بوەستین. لە کاونتەرەکە بەڕێز کامارا وێنەی من و دۆکیومێنت و کرێی دا. پیاوکە لەپشت کاونتەرەکە وتی: "دەبێت بیسەلمێنیت خەڵکی سیرالیۆنیت"، کە ئەمەی وت، زۆر تووڕە بووم، دەمویست بە هەموو هێزی خۆم شەپازلەیەکی لێ بدەم. ویستم تێی بگەیەنم ئاستەمە زانیاری کەسێتی لەماوەی جەنگدا بمێنێت. ئەو پیاوە بێ ئەقڵە باوەڕی بە ڕاستییەکان نەدەکرد کە بۆم ڕوون دەکردەوە. بەڕێز کامارا بردمییە لاوە و داوای لێکرم لەسەر کورسییەك چاوەڕێ بکەم و خۆی قسەی لەگەڵ پیاوەکە کرد و داوای کرد بەڕێوەبەرەکەی ببینێت.

پاش چەند کاژێرێك لە چاوەڕوانی کەسێك توانی کۆپییەك لە بڕوانامەی لەدایکبوونم پەیدا بکات و داوایان لێکردین چوار ڕۆژی تر سەردان بکەینەوە.

"یەکەمین هەنگاومان تەواو کرد، ئێستا پێویستە کاری ڤیزە دەست پێ بکەین"، هیچم نەوت، تووڕە و هیلاك بووم و دەمویست بچمەوە ماڵەوە.

کاتێك گەیشتمەوە ماڵەوە، مامم بە زەردەخەنەوە سەیری کردم کە دەیویست بڵێت "چی ڕوویداوە؟"

پێم وت کە هەڵبژێردراوم بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان لە شاری نیویۆرك تا باس لە جەنگ بکەم لە سیرالیۆن، مامم باوەڕی نەکرد "خەڵکی درۆ دەکەن ڕێگە مەدە بەم جۆرە پەیمانانە هیوات بەرز بکەنەوە. باوەڕ بەهەموو کەس مەکە کوڕم".

هەموو بەیانییەك بە گاڵتەوە پێی دەوتم: "ئـێ ئـەمڕۆ چـی دەکـەین؟ پلانەکانمان داڕێژین بۆ ئەمریکا؟"

بەڕێز کامارا بردمی بۆ بازاڕ. جانتایـەکی گـەورەی سـەفەرکردنی بـۆ کڕیم لەگەڵ هەندێك جلوبەرگ زۆربەیان کراسی قۆڵ درێژ بوون، پـانتۆڵی فـەرمی و چـەند کراسـێکی سـیارالیۆنیی ڕەنگـاوڕەنگی بـۆ کـڕیم، سەرقۆڵەکان و ئێخەکـەی بـە ئەتـەمینی ڕەنگـاوڕەنگی نـەخش کرابـوو. دامێنی پانتۆڵەکانی قەدکرابوو، شتەکانم پشانی مامم دا هێشـتا بـاوەڕی نەکرد "ڕەنگە بیەوێت شێوازێکی ئەفریقاییت پێ ببەخشـێت لـەبری ئـەم پانتۆڵە دەڵبانەی لەبەریان دەکەیت".

هەندێك جار من و مامم دەچووین بۆ پیاسە دوای ئیش. هەمیشە لێی دەپرسیم چۆنم. و بە "باشم" وەڵامم دەدایەوە، پاشان دەستی دەکـردە ملـم و لە خۆیی نزیك دەکردمـەوە. دەیزانی دەمـەوێت شتێکی بۆ باس بکەم، بـەڵام وشەی گونجاوم نەبوو تا پێیـان دەسـت پـێ بکـەم. دەمویسـت پێـی بڵـێم هــەرکات لەگــەڵ ئامۆزاکــانم دەچــووین بــۆ هێنــانی دار، ئـەو ســاتانەم بیردەکەوتەوە کە دەستگیرکراوەکانمان بە دارەکاندا هەڵدەواسـی و تەقـەمان لێدەکردن خوێن بە دارەکاندا دەهاتە خوارەوە و هەرگیز لێ نەدەبوونەوە. لە ڕۆژە باراناوییەکاندا پێم نەوتبوو ماوەی چەند ساڵێکە لە دیمەنی منداڵێك دوورم کە دەستی باوکی دەگرێت، یان سەرپۆشەکەی دایکـی. یـان دەسـتی دایك و باوکی دەگرێت. خۆزگەم دەخواست لەتوانامدا بوایە بگەڕامایەتەوە بۆ ڕابردوو تا شتەکان بگۆڕم و سەرلەنوێ دەست پێ بکەمەوە.

داوام لێکرا بەیانییەکی ڕۆژی دوو شەممە بچمە باڵیۆزی ئەمریکا و پیاوێك بە ناوی (دکتۆر تامبا) ببینم. لەسەر ڕێگاکە وەك هەموو ڕۆژانی تر قەرەباڵغی شارەکە سەرنجی ڕاکێشام، دەنگی مەلا هەموو شارەکەیان پڕ کردبوو. دەنگی بازرگانەکان کە کەلوپەلەکانیان بە دەرگای دووکانەکانیانەوە هەڵواسیبوو و سەرنجی خەڵکیان ڕادەکێشا.

هەرگەیشتمە بەردەم باڵیۆز، خەڵکی ڕیزیان گرتبوو، ڕووخساریان پڕ بێتاقەتی و غەمگین بوو وەك ئەوەی لەبەردەم دادگا وەستابێتن و بڕیاری ژیان و مردنیان بۆ دەرچێت. چارم نەبوو منیش لە ڕیزەکە وەستام. پاش کاژێرێك چاوەڕوانی، (دکتۆر تامبا) لەگەڵ کوڕێکی تر هات و بانگی کردم. لە پیاوێکی بە کەرامەت دەچوو چیتر چاوەڕێمان نەکرد لە ڕیزەکە. کوڕەکەی لەگەڵ دکتۆر بوو، ئەویش منداڵی سەرباز بوو تەوقەی لەگەڵ کردم "سڵاو، من ناوم (با)یە زۆر خۆشحاڵ دەبم لەگەڵ تۆ بچم بۆ ئەم گەشتە". تەوقەم کرد و لە دڵی خۆمدا وتم گەر مامم لێرەبوایە پێی دەوتی "مەهێڵە هیوات بەرزبکەنەوە ئەی پیاوی گەنج".

لەناو باڵیۆز لەسەر چەند کوورسییەکی ڕێکوپێك دانیشتین و چاوەڕێی چاوپێکەوتنەکەمان بووین. ژنێکی سپی پێست لەپشت پەنجەرەیەك دانیشتبوو. دەنگی بە مکەبەرەکە دەهاتە بەرگوێ. "هۆکاری سەردانەکەت بۆچی دەگەڕێنیتەوە؟" چاوی لەسەر وەرەقەکانی بەردەمی لانەبرد.

گەیشتە سەرەی ئێمە پاسپۆرتەکانمانی پێبوو. سەیری نەدەکردم هەر پەڕەی پاسپۆرتەکەمی هەڵدەدایەوە. سەرم لێشێوابوو بۆ ئەم پەنجەرەیە وەها دانراوە کە مرۆ سەری لێ دەرناکات. پێی وتم: "بە مایکرۆفۆنەکە

قسه بکه"، پاشان بەردەوام بوو: "هۆکاری سەردانەکەت چییە بۆ ئەمریکا؟"

"بۆ کۆنفرانسێك دەچم".

"باس لە چی دەکات کۆنفرانسەکە".

"بەگشتی دەربارەی منداڵانی هەموو جیهانە کە بەهۆی چییەوە دەناڵێنن".

"ئەم کۆنفرانسە لە کوێیە؟"

"لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرك".

"شایەتی دەدەیت بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت؟" لە بیرکردنەوەدا بووم. پاشان وتی: "هیچ حساب بانکییەك، یان موڵکێکت هەیە شایەتی گەڕانەوەت بدات؟"

لە دڵی خۆمدا وتم گەر سەر هەڵبڕێت و سەیرێکی ڕووخسارم بکات، ئەو دوو پرسیارەی کۆتایی لێ نەدەکردم. هیچ کەس لە تەمەنی مندا حساب بانکی نەبوو، خەونیشی بە هەبوونییەوە نەدەبینی. موڵك بە ڕادەیەکی زۆر کەم. (دکتۆر تامبا) پێی وت کە ئێمە سەر بە ڕێکخراوی منداڵانی تێوەگلاو بە جەنگەوەین و دوای چاوپێکەوتنمان لە ئەمریکا دەگەڕێینەوە بۆ سیالیۆن.

دوایەمین پرسیاری لێکردم: "کەس دەناسیت لە ئەمریکا؟"

"نەخێر، هەرگیز نەچوومەتە دەرەوەی ئەم وڵاتە، ئەوەی ڕاستی بێت ئەمە یەکەم جارمە لەم شارەم".

پاسپۆرتەکەمی داخست و لەلاوە داینا و وتی: "کاژێر چوار و نیو وەرەوە".

لە دەرەوە (دکتۆر تامبا) پێی وتین ڤیزەکانمان وەرگرتووە و هیچ شتێك نەماوە تەنها دەبێت چاوەڕوانی ڕۆژی گەشتەکە بین. ئەو کات لەوە دەچوو بەڕاستی بڕۆم بۆ ئەمریکا، هەرچەندە پاسپۆرتەکەم هەر لە دوورەوە بینیبوو.

***

جانتاکانم هەلگرت. پانتۆلێکی قاوەیی سیالیۆنیم لەبەرکرد کە دامێنەکەی بە زیگزاکی نەخش کرابوو. لەگەڵ تیشێرتێك. مامم لە دالآنەکە دانیشتبوو. کە لە ژوورەکەی ئالیی هاتمە دەرەوە، بە زەردەخەنەوە وتم: "وا بەرێدەکەوم بۆ فرۆکەخانە"، زانیم مامم بەتەوسەوە شتێك دەڵێت.

"پەیوەندیم پێوە بکە. ئا من تەلەفۆنم نییە. پەیوەندی بکە بە ئەمیناتا ئەو دێت بەدواما".

پاشان قاقای لێدا.

منیش قاقام لێدا "باشە وا دەکەم".

مامم وتی: "ئاه... منداڵان وەرن ماڵئاوایی لە براکەتان بکەن، هەرچەندە نازانم بۆ کوێ دەچێت، بەلآم دڵنیام پێویستی بە دۆعاکانمان دەبێت".

ماتیلدا و کۆنا و سۆمبۆ بە جامێك ئاوەوە هاتنە دەرەوە تا ئاو برێژن و باوەشیان پیادا کردم و هیوای گەشتێکی خۆشیان بۆ خواستم، پورم لە

موبەقەکەوە هاتە دەرەوە و بۆنی خواردنی لێدەهات، باوەشی پیادا کردم قاقایەکی لێدا و وتی: "بۆ هەر جێیەك دەڕۆیت پێویستە بۆنی وڵاتەکەتت پێوە بێت، ئەمە کۆلۆنیای منە بۆ تۆ".

مامم هەستا و باوەشی پیاکردم: "هیوام سەلامەتی تۆیە، دوای ماوەیەك بۆ نانی ئێوارە دەتبینمەوە". پاشان گەڕایەو و لەسەر کورسییەکەی دانیشت.

# بیست

یەکەمین جار بیرۆکەی گشتیم دەربارەی نیویۆرك لە گۆرانی راپەوە پێگەیشت. دەمهێنایەوە بەرچاوی خۆم کە خەڵکانی ئەوێ فیشەك بەیەکەوە دەنێن و هەڵدێن. خەڵکی بەسەر شەقامەکانەوە نابینرێن، تەنها ئەوانە نەبێت کە شەوانە بە ئۆتۆمبێلە سیباقەکانیانەوە دەسوورێنەوە و بەدوای یانەی شەوانە و توندوتیژی و شەڕدا دەگەڕێن. بەڕاستی ئەوەندە بەشەوق نەبووم تا بچمە ئەو شێتخانەیە، خۆم لە وڵاتەکەمدا زۆرم چەشتبوو. کاژێر ٤:٣٠ پاش نیوەڕۆ گەیشتینە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی (جۆن. ف. کەنەدی). دەرەوە تاریك ببوو. لە (دکتۆر تامبا)م پرسی بۆ دەرەوە لە ئێستاوە تاریك بووە. وتی: "لەبەر ئەوەی زستانە". وتم: "ئۆه!" بەڵام هێشتا پێم سەیربوو. وشەی (زستان) لە تێکستێکی شکسپیرەوە فێر ببووم. وامزانی دەبێت دووبارە سەیری فەرهەنگ بکەمەوە.

(دکتۆر تامبا) پاسپۆرتەکانی لێوەرگرتین و خۆی هەموو کارەکانی تەواوکرد. جانتاکانمان وەرگرتەوە و چووینە دەرەوە. پێم باش نەبوو دەستبەجێ بچینە دەرەوە، بەڵام (دکتۆر تامبا) دەمێ بوو ڕۆیشتبوو. هەرچووینە دەرەوە، لەلایەن بایەکی ئێجگار ساردەوە بەخێرهاتن کراین.

لەشم بەستی، هەستیش بە دەموچاوم نەدەکرد. پێموابوو گوێچکەکانم کەوتوونەتە سەر زەوی. دانم جیڕکردەوە و پەنجەکانم لەبەر سەرما نازاریان دەهات.

بایە ساردەکە بەناو جلە هاوینەکانمدا هاتــە نــاو لەشمــەوە وەك ئــەوەی هیچم لەبەردا نەبێت. موچوڕکەم پیا دەهات و دەستبەجێ ڕامکــردەوە نــاو تێرمینالەکە. لە هەموو ژیانمدا سەرمای وام هەست پێ نــەکردبوو. چــۆن کەسێك دەتوانێت لەم وڵاتە بژی؟

دەستەکانم لە یەك دەخشاند و لە جێی خۆم بەرز دەبوومەوە تا کــەمێك گەرمم بێتەوە.

با لە دەرەوە لەگەڵ دکتۆرا وەستابوو دەستەکانی لــەخۆی پێچــابوو لــە سەرمادا دەلەرزی. (دکتۆر تامبا) چاکەتی لەبەردابوو، مــن و بــا پێمــان نەبوو. من لە تێرمینالەکە چاوەڕێ بووم تــا دکتــۆر تامبــا تەکســییەکی ڕاگرت، دەستبەجێ بەخێرایی خۆمم تێفڕێدا و دەرگاکــەم داخســتەوە. وردە شتی سپی لە ئاسمان دەکەوتنە خوارەوە و وا دەرەکــەوت لەســەر زەوییەکــە کەڵەکە بن. ئەو شتە سپییە چی بێت؟ لە دڵی خۆمدا دەمپرسی. دکتــۆر ناونیشانەکەی بە شۆفێرەکە وت و دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەو پارچــە پەڕەیەی بەدەستییەوە بوو. شۆفێرەکە پرسی:

"یەکەمین جارتانە لێرەن؟ هەستتان چۆنە بەرامبەر ئەم دیمەنە جوانەی زستان؟"

دکتــۆر وتــی: "بــەڵێ، ئەمــە یەکــەمین جــارە"، پاشــان خــۆی بــە دۆکیۆمێنتەکانی ئێمەوە سەرقاڵ کرد. هەرگیز لە ژیانمدا وشەی "بــەفر"م نەبیستبوو.

ئەوە وشەیەك نەبوو لە سیرالیۆن باس بکرێــت. تــەنها لــەو فیلمانــەی دەربارەی (کرسمس) بوون بەفرم بینیبوو. لە دڵی خۆمــدا وتم ڕەنگــە لێــرە

هەموو ڕۆژ کرسمس بێت. گەیشتینە ناو شار، لەوە دەچوو یەکێك لە ئاسمانەوە ئەو بینا بەرزانەی دانابێت. پێدەچوو هەندێك لەو بینایانە لە گلۆپی ڕەنگاوڕەنگ دروستکرابن. شارەکە لەبەر ڕووناکی دەدرەوشایەوە، ئەوەندە بە جۆش بوو نەمدەزانی سەیری کام لا بکەم.

وامزانی بیناکانی (فری تاون) بەرزن، بەڵام ئەم بینایانە تەواو بەرز بوون، وام هەست دەکرد سەریان لە ئاسمان گیرکردووە. ژمارەیەکی زۆر ئۆتۆمبێل لەسەر شەقامەکە بوون، هۆڕنیان لێدەدا، تەنانەت کاتێك کە ترافیکەکەش سوور بوو. پاشان خەڵکی دەپەڕینەوە چاوی خۆمم سڕی تا دڵنیا بم بەڕاستی خەڵکی نیویۆرك دەبینم. ئەوەندە مەترسیدار نەبوون وەك ئەوەی من بیستبووم. ڕووناکی زیاتر دەبینرا وەك لە (فری تاون). هەر چاوم دەگێڕا تا عەموودی کارەبایی و وایەر ببینم، بەڵام هیچم بەدی نەکرد.

لە شەقامی چلوحەوت گەیشتینە (هۆتێل ڤاندیربیلت).

کوڕێك بەرەو ڕوومان هات و جانتاکانی بردینە سەرەوە. لەگەڵ دکتۆر تامبا چووینە لای دێسکەکە و هەریەکەمان کلیلی ژوورەکانمان وەرگرت.

ئەوە یەکەمین جارم بوو لە ژیانمدا ژووری تایبەت بە خۆمم هەبێت. لە هەمووشی گرنگتر تەلەفزیۆنی تایبەت بە خۆمم هەبوو کە بە درێژایی شەو تەماشام دەکرد. هەستم بە گەرمای ژوورەکە دەکرد، جلەکانم داکەند و لەبەردەم تەلەفزیۆنەکەدا ئارەقە و ئاوم دەردابوو. بیرم لە سەیر و سەمەرەیی ئەو شارە دەکردەوە کە دەرەوەیان سارد و ناو ماڵەکانیان گەرمە! دوای چەند ڕۆژێك تێگەیشتم کە ئامێری گەرمکەر لە ژوورەکەدا هەیە و بە بۆری ئاوی گەرم و هەڵم کار دەکات و لەسەر بەرزترین پلە دانرابوو.

مـــن هـــەر نەشمـــدەزانی شـــێوەی چـــۆنە تـــا بـــزانم چـــۆن دەکوژێتـــەوە، یـــان دادەگیرسێت.

***

بۆ ڕۆژی دواتر چوومە خوارەوە بۆ کافتریاکە. پەنجاوحـەوت منـدالّ لـە بیستوسێ وڵاتی جیاجیاوە هاتبورن و ئامادەبوون بۆ نانی بەیانی و پاشـان یەکـەمین کۆبوونـەوەی پەرلـەمانی نێودەوڵـەتی منـدالان لـە نەتـەوە یەکگرتووەکان دەسـت پـێ بکـەن. مندالـەکان لـە لوبنـان، کامبۆدیـا، کۆسۆڤۆ، بەڕازیل، نەرویج، یەمـەن، مۆزەمبیـق، فەلەسـتین، گواتیمـالا، نیویۆرک، باشوری ئەفریقا، بیرو، باکووری ئێرلەندا، هیندستان، پاپیوا نیو جینی، مالاوی... بوون.

من چاوم دەگێڕا بـۆ (بـا) و (دکتـۆر تامبـا) ژنێکـی سـپی پێسـت هێنامییە لاوە و خۆی ناسـاند "سـلاو، مـن نـاوم (کریسـتین)ە خـەلکی نەرویجم"، پاشان دەستی ڕاکێشا "سلاو، من ئیشمایلم خەلکی سیرالیۆنم"، تەوقەم لەگەلّ کرد.

لەناو زەرفێکدا ناوی خۆمی دەرهێنا و نوساندی بە تیشـێرتەکەمەوە و بزەیەکی کرد و ئیشارەتی کرد تا لە ڕیزدا بوەستم بۆ نانی بـەیانی. پاشـان بەدوای مندالانی تر دەگەڕا کە ناویان پێوە نەبوو.

دوای دوو کوڕ کەوتم. بە زمـانێکی سـەیر قسـەیان دەکـرد، هـەروەها دەیانزانی چی داوا دەکەن. نەمدەزانی نـاوی ئـەو خواردنـە چـی بـوو کـە داوایان کرد. لەماوەی ئەو سـەردانەمدا بـە خواردنـەکان سەرسـام بـووم.

هەموو جار هەمان خواردنم داوا دەكرد، یان ئەوانی تر هەرچییەكیان هەڵگرتایە منیش هەمان شتم هەڵدەگرت. زۆرجار بەختم هەبوو كە حەزم بەو خواردنانە دەكرد كە لە خۆوە لەسەر قاپەكەم دامدەنان. لە دكتۆرم پرسی لە كوێ برنج و ماسی و گەڵای كاساڤا و شلەی بامیێم دەست دەكەوێت پێكەنی وتی: "كە چوویتە شاری ڕۆما دەبێت وەك ڕۆمەكان بكەیت".

قومێكم لە پەرداخە شەربەتە پرتەقاڵەكەم دا و لە دڵی خۆمدا وتم: "دەبوایە خواردنی خۆماڵیم لەگەڵ خۆمدا بهێنایە تا فێری ئەم خواردنانەی ئێرە دەبم".

دوای نانی بەیانی، دوو شەقامان تێپەڕاند بەرەو ئەو بینایەی زۆربەی كۆبوونەوەكانی تێدا دەكرا، دەرگاكە كرایەوە و هەوا ساردەكە تەوژمی هێنا. هێشتا هەر پانتۆڵە هاوینەكە و بلوسێكی قۆڵ درێژم لەبەردا بوو تێ نەگەیشتم چۆن كەسێك لەم وڵاتە ناخۆشە دەژی لەو كاتەوەی هاتووم لە ترسی ئەوەدام دەم و لوت و پەنجەكانم لەسەرمادا لێ نەبنەوە.

یەكەمین بەیانی چەند كاژێرێك دەربارەی ژیانی یەكتر گفتوگۆمان كرد. هەندێكیان ژیانیان خستبووە مەترسییەوە تا بەشداری ئەم كۆنفرانسە بن. هەندێكیان چەندین میلیان بڕیبوو بۆ وڵاتی دراوسێ تا دواجار سواری فڕۆكە ببوون.

دوای چەند خولەكێك لە گفتوگۆ، تێگەیشتین هەموو ئەوانەی لەو هۆڵە دانیشتوون ژیانی منداڵییان پڕ چەرمەسەریی بووە. هەندێكیان دوای كۆنفرانسەكە دەگەڕانەوە بۆ هەمان ژیان. پاش ئەوەی خۆمان ناساند

لە ڕیزێکی بازنەیی دانیشتین تا هەریەك لە ئامادەکارەکان خۆیان بناسێنن.

زۆربەی ئامادەکاران بۆ ڕێکخراوی ئەهلی کاریان دەکرد. ژنێکی بالاّ کورتی سپی پێستی چاو کالّ کە قژێکی ڕەشی درێژی هەبوو، پێی وتین: "من چیرۆك گێڕەوەم".

سەرسام بووم پێی و هەموو بیریم لای بوو. زۆر ڕاشکاوانە قسەی دەکرد و دەستەکانی دەجولاّند. دانی بە وشەکاندا دەنا.

پێی وتین ناوی (لۆرا سیمس)ە. پاشان ئەوانەی پێ ناساندین کە لەگەڵیدا بوون، (تێریس پلایر) ژنێکی پێست کالّ بوو شێوەی ئەفریقایی بوو، تەپڵێکی بەدەستەوە گرتبوو. لۆرا بڕیاری دا کۆڕێك ببەستێت تا یارمەتیمان بدات بە شێوازێکی ڕوون و ڕەوان پەیامەکانمان بگەیەنین و چیرۆکەکانمان بگێڕینەوە. هێشتا لۆرا قسەکانی تەواو نەکردبوو، من بڕیارم دا بەشداری کۆڕەکەی بکەم، بەلامەوە سەیر بوو چۆن ژنێکی ئەمریکایی سپی پێست توانیویەتی ببێتە چیرۆك گێڕەوە. ئەو بەیانییە لۆرا بەردەوام سەیری من و بای دەکرد کە هێشتا جلە ئەفریقاییە هاوینەییەکانمان لەبەردا بوو. نەمدەزانی سەرنجی جلەکانمانی داوە. لە نزیك ئامێری ژوور گەرمکەرەوەکە دانیشتبووین و قۆڵەکانمان لە لەشە بچووکەکانمانەوە پێچابوو. جار بەجار لەسەرمادا دەلەرزین وەك ئەوەی سەرما ڕۆچووبێتە ناو ئێسقانەکانمان. دوای نیوەڕۆ پێش نانخواردن، لێمان نزیکبووەوە "چاکەتی زستانەتان پێیە؟" هەردووکمان سەرمان ڕاوەشاند. غەم ڕووخساری تەنییەوە، زۆری لەخۆی کرد زەردەیەك بکات. ئەو ئێوارەیە چاکەت و

ملپێچ و کڵاوی بۆ هێنااین. هەستم دەکرد شتێکی زۆر گەورەتر لــە لەشــی خۆمم لەبەردایە، بەڵام دڵخۆش بووم، چونکە دەمتوانی بچــمەدەرەوە و بــە شارەکەدا بگەڕێم دوای تەواوبوونی کۆڕەکە. (چەند ساڵانێك دوای ئەو ڕۆژە لۆرا یەکێك لە چاکەتەکانی خۆی پێشکەش کردم، بەڵام لێم وەر نــەگرت، چونکە چاکەتی ژنانە بوو. پاشان بەگاڵتەوە ئــەو ڕۆژەی بیرهێنامــەوە کــە ئەوەندەم سەرمابوو گوێم پێ نەدا چ چاکەتێکم لەبەردایە).

مــن و بــا زیــاتر لــە لــۆرا و تێــریس نزیکبووینــەوە. بــە درێــژایی کۆنفرانسەکە لۆرا باسی ئەو چیرۆکانەی دەکرد کە بە منداڵی بیستبوومن. هێشتا سەرم سووڕمابوو چۆن ژنێك کە هەرگیز لە وڵاتەکەی من نــەبووە و لە ســەرەوەی زەریــای ئەتڵەســی دەژی، چــیرۆکە خێڵەکییــەکانی وڵاتەکــەم دەزانێت.

(ساڵانێك دوای ئەوەی بوو بە دایکم. هەمیشە باسی ئەوەم دەکرد چــۆن لە ناوچەوانم نووسراوە لە وڵاتێك کە بــە چــیرۆك بەناوبانگــە، هــاتووم بــۆ نیویۆرك تا ژنێك ببێتە دایکم کە چیرۆك گێڕەوەیە).

دووەم ڕۆژ پەیوەندیم بە مامەوە کرد، ئەمیناتا وەڵامی دایەوە:

"سڵاو، من ئیشمایلم، دەتوانم قسە لەگەڵ مامە بکەم؟"

"ئێســتا بــانگی دەکــەم، دوای دوو دەقــەی تــر پەیوەنــدی بکــەرەوە" ئــەمیناتا تەلەفۆنەکــەی داخســتەوە. کاتێــك پەیوەنــدیم کــردەوە، مــامم هەڵیگرت.

"ئێستا لە شاری نیویۆرکم!"

مامم قاقای لێدا "دەزانم، ئێستا باوەڕ دەکەم، چونکە ئەوە چەند ڕۆژێکە ناتبینم".

پاشان پەنجەرەی ژووری هۆتێلەکەم کردەوە تا مامم گوێی لە ژاوەژاوی دەرەوە بێت "ئەو دەنگە لە فری تاون ناچێت" بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو پاشان بەردەوام بوو "ئەوێ چۆنە؟"

"تا بڵێی ساردە" مامم پێکەنی.

"ڕەنگە ئەوە سەرەتای دەستپێکت بێت بۆ جیهانی سپی پێستەکان، ئەگەر پێویست نییە دەتوانی هەر لە ژوورەوە بمێنیتەوە"، لەوکاتەدا ڕێگا بەرداوییەکەی ماڵی مامم هاتە بەرچاو، بۆنی گوڵەبەڕۆژەکەی پورم هەر لە لووتمدا بوو.

هەموو بەیانییەك بە خێرایی دەچووین بۆ بیناکە هەموو چەرمەسەرییەکانی ژیانمان بەلاوە دەنا و زیرەکانە باسمان لە ڕێگەچارەکان دەکرد بۆ ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی منداڵانی وڵاتە جۆراوجۆرەکان دەبنەوە.

لە کۆتایی ئەم دانوستانەمان هەموومان چاومان لە هیوا و پەیمانی خۆشبەختی بریسکەی دەهات. هەستمان دەکرد بەهۆی چەرمەسەریمانەوە ڕێگەچارە دەدۆزینەوە و بە جیهانی دەناسێنین. دووەم ڕۆژمان لە نیویۆرك، شەوەکەی من و مادۆکا کە خەڵکی مالاوی بوو، لە شەقامی چلوحەوتەوە ڕۆیشتین بێ ئەوەی بزانین کە بەرەو ناوجەرگەی تایمز سکوێ دەچین. سەیری بینا و خەڵکەکەمان دەکرد کە بە خێرایی دەڕۆیشتن، پاشان ئەو دیمەنانەی لە شاشەیەکی گەورە پیشان دەدرا، من و مادۆکا هەردووکمان سەیری یەکترمان کرد، بەڕاستی بە قەرەباڵغی ئەو شوێنە سەرسام بووین!

یەکێك لە شاشە گەورەکان ژن و پیاوێکی پیشان دا کە جلی ژێرەوەیان لەبەردا بوو، پێم وابوو نمایشیان دەکرد. مادۆکا ئیشارەتی کرد و پێکەنی شاشەکانی تر گۆرانی، یان ژمارەی گەورەی سەربەرەو ژووری پیشاندەدا.

سەرسام مام! لە قوژبنێکدا هەڵکورماین و چاومان برییە دەوروبەر تا چاومان تاوی کرد هەستم بەسەرما نەدەکرد، دیمەنی ئۆتۆمبێل و رووناکی شارەکە سەرقاڵی کردبووم. وامزانی خەو دەبینم. ئەو شەوە پاش گەڕانەوە ئەوەی بینیبوومان بۆ منداڵەکانی ترمان گێڕایەوە. پاشان بڕیارمان دا هەموو ئێوارەیەك پێکەوە بچین بۆ تایمز سکوێ. پێش ئەوەی رۆژی بردنمان بۆ چەند شوێنێکی شارەکە بێت، من و مادۆکا هەر زوو ئەو شوێنانەمان دەزانی. پێشتر چووبووین بۆ رۆك فێلە پلازا تا درەختە رازاوەکەی کرسمس بینین لەگەڵ پەیکەری فریشتەکان کاتێك خەڵکی کە لەسەر بەفر خلیسکێنەیان دەکرد.

ئەوان هەر دەگەڕان. پێم سەیر بوو چۆن چێژیان لەو جێیە دەبینی. ئێمە تەنانەت سەردانی بینای بازرگانی جیهانیشمان کردبوو لەگەڵ (بەڕێز رایت)، کە پیاوێکی کەنەدی بوو لە هۆتێلەکە ناسیمان. ئێوارەیەکیان هەر پەنجاوحەوت منداڵەکە چووینە ناو شەمەندەفەری ژێرزەمینییەوە، هەموویان بێدەنگ بوون، هۆکاری ئەم بێدەنگییەم لە مادۆکا پرسی ئەویش لە وەڵامدا وتی: "خۆ ئەمەش شەمەندەفەرەکانی لای خۆمان نییە"، پاشان وێنەگرەکە (کە دواتر بوو بە پورم، پاش ئەوەی لە نیویۆرك ژیام)، کامێراکەی خستە سەر ئێمە. من و مادۆکاش بۆ وێنەکە خۆمان ئامادەکرد. لە هەموو گەشتێکدا چەند تێبینییەکم لای خۆم هەڵدەگرت

تا لە گەڕانەوەم بۆ ئامۆزاکانم و مام و محەمەدی باس بکەم، پێم وا نەبوو بڕوام پێ بکەن. لە کۆتایی کۆنفرانسەکە هەریەک لە منداڵەکان لە هەموو وڵاتەکان چەند وتەیەکیان پێشکەش دەکرد لە ئەنجومەنی دارایی و کۆمەڵایەتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی وڵاتەکانیان و ئەزموونەکانیان. کەسانی (ڤی. ئای. پی) و دیپلۆما بە قات و بۆینباخەوە بەرێکی دانیشتبوون و گوێیان لێدەگرتین. بە شانازییەوە لەپشت ناوی سیرالیۆنەوە دانیشتبووم و چاوەڕوانی سەرەی خۆمم دەکرد.

لە فری تاون وتارێکیان بۆ نووسیبووم، بەڵام من پێم باش بوو لە قووڵایی دڵمەوە بدوێم. بە کورتی باسی ئەزموونی خۆمم کرد و هیوام بۆ کۆتاییهاتنی جەنگەکە دەربڕی. بەم جۆرە دەستم پێکرد "من خەڵکی سیرالیۆنم، ئەو کێشانەی کاریگەریی دەکاتە سەر ئێمەی منداڵ، جەنگە، کە ناچارمان دەکات لە ماڵەکانمان هەڵبێین، خێزانەکانمان لەدەست بدەین. بێ هیوا بەناو دارستانەکاندا بخولێینەوە. لە کۆتاییدا ڕووبەڕووی سەربازی دەبینەوە. ڕووبەڕووی هەڵگرتنی تەقەمەنی و چەکی قورس دەبینەوە، هەموو ئەمانەش لەپێناو برسێتی و تەنیایی و لەناوچوونی خێزانەکانمانە. بۆ دۆزینەوەی جێیەکی بێ مەترسی. من لەبەر برسێتی و لەناوچوونی خێزانەکەم چوومە ریزی سوپا. پێویست بوو تۆڵەی خێزانەکەم بکەمەوە، لەلایەکی ترەوە پێویستم بە خواردن بوو تا بژیم. تەنها ڕێگەیەک بۆ بەدەستهێنانی هەموو ئەمانە پەیوەندیکردن بوو بە سوپاوە. بوون بە سەرباز کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام ناچار بووم. ئێستا گەڕاومەتەوە بۆ دۆخی ئاسایی و چیتر سەرباز نیم. لێم مەترسن. من تەنها منداڵێکم.

هەموومان خوشك و برای یەکترین. لە ئەزموونەکانمەوە فێری ئەوە بووم تۆڵەسەندنەوە کارێکی باش نییە. من لەپێناو تۆڵەسەندنەوە کەسێکی ترم دەکوشت، پاشان خێزانەکەی ئەویش دەیویست تۆڵە بکاتەوە. تۆڵە... تۆڵە تۆڵە هەرگیز تەواو نابێت".

دوای تەواو بوونی وتارەکانمان، هەموومان ئەو سروودەمان وت کە خۆمان دامانتابوو. پاشان گۆرانییەکانی ترمان وت. ئەو دوانیوەڕۆیە گریاین، پێکەنین. سەمامان کرد. دوانیوەڕۆیەکی تەواو کاریگەر بوو. هەموومان دڵتەنگ بووین کە لە یەك جیادەبینەوە، دەمانزانی ناگەڕێینەوە بۆ جێیەکی ئارام و بێ مەترسی. من و مادۆکا دەستمان کردبووە ملی یەك و بازمان هەڵدەدا. با لەگەڵ دەستەیەك کوڕی تر سەمای دەکرد. دکتۆر لە ناو خەڵکەکە دانیشتبوو، بۆ یەکەمین جار لە هاتنمان بۆ نیویۆرك زەردەخەنەی دەکرد. لۆرا منی هێنایە لاوە پێی وتم کە وتارەکەم زۆر کاری تێکردووە.

ئەو شەوە چووین بۆ چێشتخانەیەکی هیندی، زۆر دڵخۆش بووم کەسێك هەیە لەمپەری دنیا برنج لێبنێت. زۆرمان خوارد، قسەمان زۆر کرد و لەنێوان یەکتریدا ناونیشانمان ئاڵوگۆڕ کرد. پاشان چووین بۆماڵی لۆرا لە (ئیست ڤیلج). سەرم دەرنەدەکرد بۆ بەو جێیەی دەوت (ڤیلج)، هیچ لەوانە نەدەچوو کە من بینیبوومن. سەرپەرشتیارەکانمان لەگەڵمان نەهاتن و گەڕانەوە بۆ هۆتێلەکە.

نەمدەزانی ماڵی لۆرا دەبێت بە ماڵی داهاتووم. جلی چنراو و ئەتەمینی هەموو وڵاتەکانی جیهانی بە دیوارەکەدا هەڵواسیبوو. چەند

پەیکەرێکی ئاژەڵی لەسەر ڕەفەیەکی گەورەی پڕ کتێبی چیرۆك، دانابوو. گوڵدانی گڵینی لەسەر مێزەکە دانابوو کە باڵندەی سەیر و دڵگیر و جوانی بەسەرەوە بوو. ئامێری مۆسیقا ژەنینی لە قامیش دروستکرا و و چەند دانەیکی سەیروسەمەرەی تری دانابوو.

خانووەکە ئەوەندە گەورە بوو کە جێی هەر پەنجاوحەوت منداڵەکەی تێدا ببێتەوە.

هەموومان دانیشتین و گوێمان لە چیرۆك دەگرت، پاشان دەستمان کرد بە سەما. هەموومان دڵخۆش بووین خانووەکە شتێکی لە وڵاتی هەریەکەمانی تێدا بوو. جێیەکی گونجاو بوو تا دوایەمین شەومانی تێدا بەسەربەرین. بوون لەو خانووە وەك چوونە دەرەوەی نیویۆرك و داغڵ بوون بە جیهانێکی تر وابوو.

ئێوارەی داهاتوو، (لۆرا) و (شانتا) لەگەڵ من و با و دکتۆر تامبا هاتن بۆ فرۆکەخانە. سەرەتا هەموومان بێدەنگ بووین پاش کەمێك جگە لە دکتۆر هەموومان دەستمان کرد بە هەنسکدان. لە تێرمیناڵەکە گریانەکەمان زیادی کرد و هەموومان باوەشمان بەیەکدا کرد و ماڵئاواییمان کرد (لۆرا) و (شانتا) ژمارەی تەلەفۆن و ناونیشانی خۆیانیان پێدایین. ١١ی نۆڤەمبەری ١٩٩٦ نیویۆرکمان جێهێشت. دوای هەشت ڕۆژ ١٦ەمینساڵیادی لەدایکبوونم بوو. بە درێژایی گەشتەکەم لە ئاسمان وام هەست دەکرد خەون دەبینم، خەونێك کە نامەوێت هەرگیز خەبەرم بێتەوە لێی. دڵخۆش نەبووم بە ڕۆیشتنەوەم لەهەمان کاتدا بیرۆکەی ناسینی خەڵکی لە دەرەوەی سیرالیۆن خۆشی و هیوای پێ

دەبەخشیم. پێموابوو گەر لە ماوەی گەڕانەوەم بکوژرامایە، ئەوکات یادگاری بوونی من لە وڵاتێکی دەرەوەی سیرالیۆن لەبیر نەدەکرا.

# بیستویەک

هەندێك جار ئێواران باسی چیرۆکی گەشتەکەم بۆ خێزانەکەم دەکرد (تەنانەت محەمەدیش کە هاتبوو لەگەڵمان بژی). وەسفی هەموو شتەکانم دەکرد، فڕۆکە و فڕۆکەخانەکە و هەستت چۆنە کاتێك هەورەکان دەبینیت لەناو فڕۆکەکەدا. هەرکات بیری فڕۆکەخانەی ئەمستەردامم دەکەوتەوە، مووچورکەم پیا دەهات کاتێك بە ڕاڕەوی فڕۆکەخانەکە دەڕۆیشتم. بە هەموو ژیانم ئەو هەموو خەڵکە سپی پێستەم نەبینیبوو جانتاکانیان ڕاکێشن وا بە خێرایی بەرەو ئەملاولا ڕابکەن. باسی هەموو ئەو خەڵکەم بۆ کردن کە ناسیبوومن، بینا بەرزەکانی نیویۆرك، چۆن هەندێك کەس لەسەر شەقامەکان جنێویان دەدا، چۆن هەوڵم دەدا کلووە بەفرەکان بگرم. ئەو ڕۆژانەی تاریکی هەر زوو دەستی بەسەریدا دەکێشا.

مامم دەیوت: "لە گەشتێکی سەیر دەچێت!"

هەستم دەکرد هەموو ئەمانە تەنها لە مێشکی خۆمدا ڕوویان داوە.

من و محەمەد دەستمان کردەوە بە خوێندن و لە خوێندنگەی ناوەندیی (ست. ئێدوارد). دڵخۆش بووم بیری ئەو بەیانییانەم دەکەوتەوە کە دەچووم بۆ خوێندنگەی بنەڕەتی. دەنگی گسکەکان کە گەڵا وشکبووەکانی مانگۆیان بەلاوە دەنا و چۆلەکەکانیان دەترساند، ئەوانیش بە دەنگێکی بەرزتر دەیانجریواند وەك ئەوەی دەربارەی دەنگی گسکەکە پرسیار لە یەکتر بکەن.

خوێندنگەکەم بینایەکی بچووك بوو، دیوارەکانی لە خشتی بە قوڕ لەسەر یەك هەڵچنراو و بنمیچی کانزا دروستکرابوو.

دەرگای پێوە نەبوو، تەنانەت زەمینەکەی چیمەنتۆش نەبوو. ئەوەندە بچووك بوو جێی ئەو هەموو خوێندکارە نەبوو. بۆیە زۆربەی دەرسەکانمان لەدەرەوە لەژێر سێبەری مانگۆکاندا دەخوێند.

محەمەد ئەوەی لەیاد مابوو چۆن لە خوێندنگەی بنەڕەتی و ناوەندیی پێداویستی خوێندنمان نەبوو و مامۆستاکان پێویست بوو لە باخەکانی خۆیان بەروبووم بچێنن و خوێندکارەکانیش یارمەتییان بدەن، تا بژێویی ژیانیان دابین بکەن، چونکە ماوەی چەند ساڵێك موچەیان پێ نەدرابوو.

تا زیاتر باسمان بکردایە، زیاتر بۆم دەردەکەوت کە بەڕاستی لەبیرم نەماوە بوون بە خوێندکار چۆنە، کاتێك لە پۆلدا دادەنیشیت، تێبینی دەنووسیت، هاوڕێی نوێ پەیدا دەکەیت و واجبەکان دەکەیت و ڕقی خوێندکارەکانی تر هەڵدەستێنیت.

بەتاسەوە چاوەڕێی گەڕانەوە بووم، بەڵام یەکەم ڕۆژی خوێندنگە لە (فری تاون)، هەموو خوێندکارەکان دوور لێمان دانیشتبوون. وایاندەزانی من و محەمەد لەهەر کاتێکدابێت دەیانکوژین. هەر زوو تێگەیشتن ئێمە پێشتر منداڵی سەرباز بووین. نەك منداڵیمان لەدەست دابوو، بەڵکو ڕۆحمان بەهۆی ئەزموونی ساڵانی جەنگ تا ئەوکاتەش مەراقی دەدایێ و ئازاری دەداین.

هەمیشە بەهێواشی بەرەو خوێندنگە ڕێمان دەکرد. پێم خۆش بوو، چونکە مەودام هەبوو بیربکەمەوە ژیانم بە چ قەوارەیەکدا دەڕوات. متمانەم

به خـۆم هـەبوو و دڵخـۆش بـووم شـتەکان لـەوە خراپتریـان لـێ بەسـەر نەهاتبوو، بە هەموو ئەم بیرکردنەوانەش بزەم دەکرد. دووبارە بە ژیانی نـاو خێـزان ڕاهاتمـەوە بـە خـەڵکیم دەوت محەمـەد بـرای منـە، تـا خـۆم لـە ڕوونکردنەوەیەکی چەند کاژێری بەدوور بگـرم. دەمزانـی نـاتوانم ڕابـردووم لەبیر بکەم، بەڵام هەوڵم دەدا باسی لێوە نەکەم تا بە تەواوی خۆم بۆ ژیانی ئێستا تەرخان بکەم.

***

ڕۆژێك وەکـو هـەموو ڕۆژانێکـی تـر، زوو لەخـەو هەسـتام و لەسـەر بەردێکی تەخت لەپشت ماڵەکەمانەوە دانیشتم و چاوەڕێی شـار بـووم تـا بەخەر بێتەوە. ئەوکات ٢٥ی مەی ١٩٩٧. ئەمجارە لەبری دەنگـی ئاسـایی کە ڕۆحی بە بەری شارەکەدا دەکرد، گوێم لە دەنگی تەقـە بـوو لـە نزیـك بینای پەرلەمان و بارەگای پەرلەمانی یـەکێك لـە وڵاتـەکانی ئـەمریکا. دەنگی تەقە هەموو خەڵکی بەخەبەر هێنا. بەپەلە چـوومە دالانەکـە بـۆ لای مامم، دراوسێکانیش لە دالانەکانیان بوون. نەماندەزانی چی ڕوویداوە، بەڵام سەربازمان دەبینی لە شەقامی (پادیمبا) ڕایان دەکـرد، ئۆتـۆمبێلی سەربازیی بە خێرایی لە دەوروبەری گرتووخانەکە بوون.

بە درێژایی ڕۆژ دەنگی تەقە لە زیادبووندا بوو، بـە شـارەکەدا دەنگـی دەدایـەوە. خـەڵکی هـەموو هاتبوونـە دالانـەکان و ڕووخسـاریان پـڕ لـە شپرزەیی و سام بوو، لەترسا دەلەرزین. مـن و محەمـەد سـەیری یـەکترمان کرد و وتمان "دیسان؟"

نزیکـــەی دوای نیـــوەڕۆ دەرگـــای گرتووخانەکـــە کرایـــەوە و دەستگیرکراوەکان ئـازادکران. هـەموویان لەلایـەن حکومـەتـە نوێیەکـەوە چەکیان پێدرا. هەندێکیان ڕاسـتەوخۆ چـوونە سـەر مـاڵی ئـەو حـاکم و پارێزەرانەی حوکمیان دابوون، خۆیان و خێزانەکانیان دەکوشـت، گـەر لـە ماڵیش نەبوونایە، خانووەکانیان دەسووتاندن. ئەوانەی تریش چوونە ڕیـزی سەربازەکان و دەستیان کرد بە تالآنکردنی دوکانـەکان. دووکـەڵی خـانووە سووتاوەکان هەموو شارەکەی پڕکرد لە تەم.

کەسێك هاتە سەر ڕادیۆ و خۆی بە سەرۆکی نوێی سـیرالیۆن نـاوبرد، وتی ناوی (جۆنی پاوڵ کۆرما)یە. خۆی بە دامـەزرێنەری (ئەنجومـەنی هێزە چـەکدارە شۆڕشـگێڕەکان) لەقەڵـەم دا. کـە پێکهـاتبوون لـە گرووپـی (هێزەکانی سـیرالیۆن) بـۆ لابردنـی (تیجـان کاببـا)، کـە بەشـێوەیەکی دیموکراسی هەڵبژێردرابوو. ئینگلیزییەکەی کۆرماش وەك ئەو هۆیە خراپ بـوو کـە بـۆ ڕووخانـدنی ڕژێمەکـەی تێجـان خسـتییە ڕوو. ئامۆژگـاری هەموویانی کرد دەست بکەن بە کارکردن و هەمووانی ئاگـادارکردەوە کـە ئەوە فەرمانە. بەدرێژایی وتەکانی، دەنگـی هـاواری سـەربازەکان دەهـات لەخۆشـیدا ئاهـەنگیان دەگێـڕا و لـە لایـەکی تریشـەوە تـووڕە بـوون و جوێندانیان ئەوەندەی نەمابوو دەنگی ئەم نووقم بکەن.

هەر ئەو شەوە پەیامێکی تر بلاوکرایەوە، کە یاخیبووەکان و هێزەکانی سەر بە حوکمەت یەکدەگرن "لەپێناو بەرژەوەندی گەلدا"، حکومـەتێکی مەدەنییانە پێکدەهێنن. دواتر یاخیبووەکان و هێزەکانی سەر بە حکومـەت

تەوقی شارەکەیان دا و وڵاتەکە پارچە پارچە کرا و لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جۆرە یاسایەکی تێدا بەدی نەدەکرا.

ڕەقم لەو بارودۆخە دەبووەوە، ئەمجارە نەمدەتوانی بگرێمەوە ژیانی ڕابردووم، بەدڵنیاییەوە ئەم جارە برِم نەدەکرد.

ئەنجومەنەکەی کۆرما و یاخیبووەکان بە "سۆبیلس" ناودەبران، بە ئاپ پی جی و تەقەمەنییەکانی تر بانکەکانیان دەتەقاندەوە و پارەکانیان دەبرد. زۆرجار بەبێ هۆ بەلای خەڵکیدا تێدەپەڕین ڕایان دەگرتن، دەیانپشکنین و هەرچییەکیان پێبوایە دەیانبرد. دەستیان دەگرت بەسەر کەمپی زانکۆکان و خوێندنگە ناوەندییەکاندا. هیچ نەبوو بە درێژایی ڕۆژ بیکەین، جگە لە دانیشتن لە دالآنەکە. مامم بڕیاری دا خانووەکەی تەواو بکات. لەوکاتەی من لەگەڵیان دەژیام خەریکی دروستکردنی ئەو خانووە بوو. بەیانیان تا نزیکەی دوانیوەڕۆ سەرقاڵی کارکردن بووین، پاشان فیشەکەکان تا ژێر جێخەوەکانمان ڕاویان دەناین، بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ بارودۆخ خراپتر دەبوو، کەڵکی چوونە دەرەوەی نەما، پاش ئەوەی چەند کەسێك کوژران، هەموو دەستمان لە کارکردن هەڵگرت.

چەکدارەکان بە زۆرەملێ خواردنی مارکێتەکان و دوکانەکانیان لە شارەکەدا بردبوو. چیتر خواردەمەنی نەدەهێنرایە ناوەوەی وڵات. ئەو خۆراکە کەمەی مابووەوە لە ناوەندی هەموو شێتییەکاندا بە دەست دەکەوت. لۆرا سیمس پارەی بۆ دەناردمەوە منیش هەندێکیم لێ کۆکردبووەوە. بۆیە من و محەمەد بڕیارمان دا بچین بۆ شارۆچکەکە و گاری و ماسی قوتو و برنج و هەرشتێکی تر بێت، بیکڕین. دەمزانی گەر هاوڕێکانی سەربازگە ببینم

ڕەنگە بمکوژن گەر بزانن چیتر سەرباز نیم. لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی هەر لە ماڵەوە بم پێویست بوو خواردن پەیدا بکەم.

بیستبوومان بازاڕێکی نهێنی لەپشت خانووەیەکی چۆلکراودا هەیە، خواردەمەنی بە خەڵك دەفرۆشت. نرخی هەر خواردنێك دوو ئەوەندەی نرخەکەی خۆی بوو، بەڵام شایەنی ئەو نرخە بوو. بەیانی زوو لە ماڵ دەرچووین، ترسی ئەوەمان هەبوو کەسێك ببینین کە بمانناسێت. سەرمان دانەواند لە کاتێکدا بەلای چەند یاخیبوویەك و سەربازێکدا تێپەڕین. گەیشتین و بازرگانەکان کەلوپەلەکانیان دەهێنایە دەرەوە. هەندێك برنج و ڕۆنی دارخورما و ماسی و خوێمان کڕی. پاش ماوەیەك بازاڕەکە پڕ بوو لە خەڵك بە نهێنی بەپێی توانا کەلوپەلیان دەکڕی.

لە کاتی گەڕانەوە، جیبێکی لاند ڕۆڤەری پڕ لە چەکدار گەیشت و پێش ئەوەی بوەستێت، پیاوەکان بازیان هەڵدا. و چەند فیشەکێکیان بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵکەکە تەقاند. فەرماندەکەیان بە بڵندگۆکەی داوای کرد هەموو خەڵك شتومەکەکانیان و جانتاکانیان دابنێن. دەست بخەنە ژێر سەریانەوە و لەسەر سنگ بکەون بە زەویدا. ژنێك لەترسا دەلەرزی و هەولی دا دەرباز بێت. یەکێك لە چەکدارەکان پەڕۆیەکی سووری لەسەرییەوە بەستبوو، فیشەکێکی بە سەرییەوە نا و دەنگێکی هەڵبزڕکاو هات و بەسەر زەوییە بەرداوییەکە زرمەی هات. ئەمەش ترسی هەموومانی زیاتر کرد. هەموو خەڵکەکە بە هەموو لایەکدا خۆیان فڕێدا و ئێمەش بە دزییەوە شتومەکەکانمان کۆکردەوە بە خۆماتدانەوە ڕامانکرد. ئەو بارودۆخە بۆ ئێمە نامۆ نەبوو.

هەر ئەو ناوەمان جێهێشت، لاند ڕۆڤەرێکی تری پڕ چەکدار گەیشت، کەوتنە تەقەکردن و بە قۆناغە تفەنگەکانیان کەوتنە سەروگوێلاکی خەڵکی. ئێمەش لەپشت دیوارێک کە بازاڕێک و جادەیەکی لە یەکتر جیادەکردەوە، خۆمان حەشاردا. پاشان بە وریاییەوە لەپشت خانووەکانی بەندەرەکە نزیکبووینەوە. ئەوەندەی نەمابوو بە تەواوی لە بەندەرەکە دووربکەوینەوە، شەپۆلەکانی دەریا شەقەیان لە بەلەمێکی نقومبوو هەستاند. بازمان هەڵدایە سەر شەقانە سەرەکییەکە و شتومەکەکانمان لە بن دەستمان نا و ڕێگایماڵەوەمان گرت. گەیشتینە لای (درەختی لۆکە) لە ناوجەرگەی شارۆچکەکە. چەند خۆپیشاندەرێك بەلاماندا تێپەڕین کە دروشمی "نا بۆ کوشتن"یان بەرزکردبووەوە. تیشێرتی سپی و پەڕۆی سپییان بەسەریانەوە بەستبوو. ئێمە بایەخمان پێ نەدان، سووچێکی شەقامەکەمان گرت تا لەوێوە بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە، لەوکاتەدا ژمارەیەك چەکدار هەندێکیان جلی مەدەنی و ئەوانی تر جلی سەربازییان لەبەردا بوو، بەرەو ڕوومان ڕایانکرد و بەناو خەڵکەکەدا تەقەیان کرد. ڕێگە نەبوو لەو حەشاماتە دەرچین، بۆیە ئێمەش چووینە ڕیزەوە. چەکدارەکان گازی فرمێسکڕژێنیان ڕشت. خەڵکەکەش لە لایەکی ڕێگاکە دەرشانەوە و خوێن لە لوتیانەوە دەپرژا. هەموو خەڵك بەرەو شەقامی (کیسی) ڕایانکرد. مەحاڵ بوو بتوانین هەناسە بدەین. قۆڵم خستە سەر لوتم، بۆنی لەوە دەچوو خرابێتە ناو فەردەیەك بەهاراتەوە. جانتاکەم توند گرت و لەگەڵ محەمەدا ڕامکرد، هەوڵم دا لێی ون نەبم. گۆو پێڵووی چاوەکانم قورس بوون و فرمێسك بە ڕوومەتمدا هاتە خوارەوە. تا دەهات تووڕەتر دەبووم، بەڵام خۆم

گرت. دەمزانی کاتی توورە بوون نییە لە شتێك کە ڕەنگە ئەنجامەکەی مردن بێت، ئەو کات کە مەدەنی بووم، زیاتر هەستم پێدەکرد. لەگەڵ حەشاماتی خەڵکی ڕامانکرد و لە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگایەك بووین بۆ ماڵەوە. قوڕگم ئازاری دەدام، محەمەدیش ئەوەندە کۆکی تا دەمارەکانی قوڕگی بەدیارکەوتن. هەرچۆنێك بێت دەربازبووین و محەمەدیش لەو پاڵەپەستۆیە سەری دەرهێنا. ئەمجارەش ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك بەهەموو هێزی خۆیان بەرەو ڕوومان ڕایانکرد، سەربازەکان دوایان کەوتبوون. ئێمەش بەرەو پێشەوە ڕامانکرد، هێشتا خواردنەکەشمان پێبوو. کەوتینە ناو ژمارەیەك خوێندکاری خۆپیشاندەر، لە جادەیەك ئەملاو ئەولاکەی بە بینای بەرز دەورە درابوو.

ماتۆڕسکیلێك کە ماوەیەك بوو بەو ناوەدا دەسووڕایەوە، هاتە خوارەوە و بەرەو قەرەباڵغییەکە ڕۆیشت. من و محەمەد هەر زوو زانیمان چی ڕوودەدات، بە خێرایی ڕامانکردە ناو ژێرابێکەوە. ماتۆڕسکیلەکە بە شەقامەکەدا چووە خوارەوە و نزیکەی بیستوپێنج مەتر لە خۆپیشاندەرەکانەوە دوور بوو. خولایەوە و لەسەر لا وەستایەوە و ڕووی کردە خەڵکەکە. ئەو سەربازەی لەپێشەوە دانیشتبوو دەستی کرد بە تەقەکردن. خەڵك هەموو لەپێناو ژیانی خۆیان ڕایانکرد. ئەو شەقامەی دەقەیەك لەمەوپێش پڕ لە دەنگی نارەزایی بوو، ئێستا گۆڕستانێکی بێدەنگە و پڕ لە لاشەی مردوو بوو، کە تا ئەو ساتەش دەجەنگین و لەو مەرگە کتوپڕەیان هەڵ دەسڵەمینەوە. من و محەمەد بە چەند کوێرە ڕێیەکی نێوان دوو بیناکاندا ڕۆیشتین تا گەیشتینە پەرژینێك، کە دەچووەوە سەر

شەقامێکی سەرەکی، کە گیابوو و لـە لایـەن چـەکدارەکانەوە چـاودێریی دەکرا. بۆ شەش کاژێر لە زێرابەکە ماینەوە چاوەڕوانی شەو بووین. بە شەو چانسی دەربازبوون لـە مـردن زۆرتـر بـوو، چـونکە نیشـانە سـوورەکانی گوللەکان لە تاریکییەکەدا دیاربوون. چەند کەسێکی ترمان لەگەڵ بوون، یەکێکیان قوتابی بوو تیشێرتێکی شینی لەبەردا بوو، دەموچاوی ئارەقاوی و زوو زوو ناوچەوانی بە تیشێرتەکەی دەسڕی.

ژنێکی گەنج پێدەچوو تەمەنی لە بیستەکاندا بێت، پاڵی دابووەوە بـە دیواری زێرابەکە و باوەشی کردبـوو بـە ئەژنۆکانیـدا و دەلـەرزی و خـۆی رادەژەند.

پیاوێکی ڕیشن کە جلەکانی خوێنی کەسێکی تری پێـوە بـوو، سـەری خستبووە ناو هەردوو دەستییەوە.

بەداخ بووم بۆ هـەموو ئەوانـەی ڕوویـدا، بـەڵام بەقـەد ئـەو خەڵکـە نەدەترسام کە پێشتر جـەنگیان نـەبینیبوو. ئـەوە یەکـەمین جاریـان بـوو. دیمەنی ڕووخساریان زۆر بە ئازار بوو. هیوام وابوو مامم زۆرغەمی ئێمـەی نەبێت. تەقەی زیاتر کرا و گازی زیاتر ڕژێنرا، لوتمان داپۆشی، تـا هـەوای دەرەوە کاریگەری گازەکەی لەگەڵ خۆی برد. شەو هەر دا نـەدەهات، لـەوە دەچوو ڕۆژی حەشر بێت. لە کۆتاییدا دنیا تاریـک بـوو، هەرچـۆنێك بێـت لەپشـت خانووەکـان بـە خۆمەڵازدانـەوە و بازهەڵـدان بـە پەرژینەکانـدا گەیشـتنەماڵـەوە. ئەوکاتـەی گەیشـتینە ماڵـەوە، مـامم لـە داڵانەکـە دانیشتبوو، فرمێسك بە چاوەکانییەوە بوو، هەر سڵاوم لێکرد، وەك ئـەوەی خێوی بینیبێت، گـورج هەسـتایە سـەرپێ و بـۆ ماوەیـەکی زۆر باوەشـی

پیاماندا کرد و داوای لێکردین چیتر نەچینەوە ناو شار، بەڵام چار نەبوو پێویست بوو خواردن بکڕین.

***

تەقە بۆ ماوەی پێنج مانگ بەردەوام بوو، دەنگی تەقە ببووە دەنگی نوێی شارەکە. بەیانیان خەڵکی لە دالآنی خانووەکانیان دادەنیشتن و منداڵەکانیان لە نزیک خۆیانەوە دەگرت و سەیری چەکدارەکانیان دەکرد کە تالآنییان دەکرد و دەستدرێژییان دەکردە سەر کچەکان و بە ئەنقەست خەڵکیان دەکوشت. هەرکات دەنگی تەقە زیاتر بووایە، دایکان قۆڵە لەرزۆکەکانیان دەپێچا لە ملی منداڵەکانیان. خەڵکی بە زۆری برنجی کوڵاویان دەخوارد لەگەڵ خوێ و شەکر و گاری سادە و گوێیان لە ڕادیۆ دەگرت بە هیوای ئەوەی هەواڵێکی خۆش ببیستن. بڕێ جار، بەڕۆژ چەکدارەکان خانووەکانیان دەسووتاند و بە ئاشکرا گوێمان لێیان دەبوو تاموچێژییان لە دیمەنی خانووە سووتاوەکان وەردەگرت و قاقا پێکەنینیان دەنواند.

ئێوارەیەک پیاوێک کە چەند خانوویەک لە خوار ماڵی مامەوە دەژیا، گوێی لە ڕادیۆی (پایریەت) دەگرت کە باسی لە تاوانەکانی حکومەت دەکرد بەرامبەر بە خەڵکانی مەدەنی. پاش چەند خولەکێک جیبێکی پڕ لە چەکدار هاتن و لەبەردەم ماڵی پیاوەکە وەستان و پاوەکە و ژنەکەی و دوو کوڕە گەورەکەیان هێنایە دەرەوە و کوشتیانن و لاشەکانیان هەڵدایە

ناو زێرابێکی نزیکی خانووەکەیان. ئەو شەوە مـامم ئەو دیمەنـەی بـینی هێڵنجی دا و ڕشایەوە.

سێ هەفتەی یەکەم خەڵك ئەوەندە تۆقیبوون نەیاندوێرا بێنە دەرەوە لە ماڵەکانیان، بەڵام هەر زوو لەگەڵ دەنگی تەقـە و ئـەو شـێتییە ڕاهـاتن. جموجۆڵ هێدی هێدی ڕووی کردەوە جەستەی شـار. خـەلکی چـوون بـەلای کاری ڕۆژانە و نـان پەیـداکردن. منـداڵان یارییـان دەکـرد و لـە یـەکیان دەپرسی دەنگی ئەو فیشەکە چ جۆرە چەکێکە (ئارِ پی جی)، یان (جی۳)، یان (ئەی کەی) یان (ڕەشاشە)؟ من و محەمەد بـە زۆری بێـدەنگ لەسـەر بەردێکی تەخت لە دەرەوە دادەنیشتین. بیرم لەوە دەکـردەوە کـە ڕێگەیـەکی ئێجگار زۆرمان بریوە تا لە جەنگ تێوەنەگلێینەوە، بەڵام هیچ جێیـەکیش نەبوو بۆی بچین.

بۆ ماوەی پێنج مـانگ هـیچ پەیوەندییـەکم لەگـەڵ لـۆرا نـەکرد لـە نیویۆرکەوە. پێش ئەوە نامەمان بۆ یەکتر دەنارد. پێی دەوتم کـە سـەرقاڵی چییە و پێویستە ئاگام لەخۆم بێت. نامەکانی لـە سەرتاسـەری جیهانـەوە دەهاتن، چونکە لەبەر کاری چیرۆکەکەی پێویست بـوو هەمیشـە گەشـت بکات. هەولّم دا ڕۆژانە پەیوەندی پێوە بکـەم، بـەڵام نـەمتوانی، چـونکە تەلەفۆنەکانی سیالیۆن چیتر بەکارنەدەهێنران. ئێواران کاتی تاریك بـوون و قەدەغەکردنی هاتوچۆ لەگەڵ مامم و ئامۆزاکانم لە داڵانەکە دادەنیشتین و چاومان دەبڕییە دیمەنی شـار. چـیتر گوێمـان لـە کاسـێتی چـیرۆکەکان نەدەگرت. مامم تا دەهات کەمتر و کـەمتر پێدەکـەنی و زیـاتر هەناسـەی

نائومێدیی هەڵدەکێشا. بە هیوای ئەوە بووین بارودۆخ باشتر بێت، بەڵام تا دەهات خراپتر دەبوو.

مامم تەندروستی باش نەبوو. بەیانییەکیان لە داڵانەکە دانیشتبووین، مامم پێی وتین کە تەندروستی باش نییە. ئێوارە تای لێهات و لە ژوورەوە ڕاکشا و لەبەر ئازار دەیناڵاند. من و نالیی چووینە دوکانێکی نزیکەوە و دەرمانمان کڕی، بەڵام تاکەی ڕۆژ بەڕۆژ بەرزتر دەبووەوە. پورە سالیی ناچاری دەکرد نان بخوات، بەڵام لە کۆتایی هەموو ژەمێکدا دەڕشایەوە. هەموو نەخۆشخانە و دەرمانخانەکان داخرابوون. هەموو شارەکە بۆ دکتۆر گەڕاین، ئەوانەی لە شارەکە بوون نەیاندەوێرا ماڵەوە جێبهێڵن نەوەك نەتوانن بگەڕێنەوە بۆ لای خێزانەکانیان. ئێوارەیەك لەتەنیشت مامەوە دانیشتبووم و ناوچەوانیم دەسڕی، لەناکاو لەسەر جێخەوەکەی کەوتە خوارەوە. بە پەلە لەشە درێژەکەیم گرت و سەریم خستە سەر ڕانم. ئێسقانی ڕوومەتەکانی لە ڕووخسارە بازنەییەکەیەوە تێك قووپابوون. سەیری کردم و بە چاوەکانیدا زانیم بێ هیوا بووە. لێی پاڕامەوە بەجێمان نەهێڵێت. لێوەکانی دەیویست شتێك بڵێن، بەڵام لە لەرزین کەوتن و بەجێی هێشتین. لە باوەشم گرت و بیرم لەوە دەکردەوە چۆن هەواڵەکە بگەیەنم بە پورم کە لەوکاتەدا ئاوی بۆ دەکوڵاند لە موبەقەکە. لەوکاتەدا پورە سالی هاتە ژوورەوە و ئاوە گەرمەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە و ڕژا بە من و لاشەی ساردەوەبووی مامم. باوەڕی نەکرد مێردەکەی مردووە، فرمێسك بە چاوانمدا هاتە خوارەوە. هەموو لەشم سڕ بوو. بۆ ماوەیەك نەمتوانی لە جێگەی خۆم بجوڵێم. محەمەد و نالیی هاتن و ئەویان لەدەست وەرگرتم و خستییانە سەر

جێی خەوتنەکە. دوای چەند خولەکێك، هەستامەوە سەرپێ. چوومە پشت خانووەکەوە و بە توندی بۆکسم لە درەختی مانگۆکە دەدا، تا محەمەد دووری خستمەوە. هەمیشە ئەو شتانەم لەدەست دەدا کە بۆ من زۆر بایەخیان هەبوو. ئامۆزاکانم دەستیان کرد بە گریان و دەیانپرسی کێ لەمەودوا بەخێومان دەکات؟ بۆ ئەمە لەم بارودۆخە دژوارە ڕووی دا. چەکدارەکانیش دەستیان کرد بە تەقەکردن.

بۆ ڕۆژی دواتر، مامم نێژرا، من لەپشت کفنەکە دەڕۆشتم و دەنگی پێی خۆشم مشتی لە دڵم دەدا. سەرەڕای ئەو هەموو شێتییەی ناو شاریش خەڵکێکی زۆر ئامادەی مەراسیمەکە بوون. من دەستی محەمەد و ئامۆزاکانم گرت، ئامۆژن ویستی بێت بۆ مەراسیمەکە، بەڵام هەر ماڵەوەمان جێهێشت، ئەو بە زەویدا کەوت. ئیمامەکە چەند سورەتێکی خوێند و مامم نزمکرایەوە بۆ ناو چاڵەکە و قوڕ کرایەوە بەسەریدا. هەر زوو ئەو جێیە چۆڵ کرا، خەڵکی گەڕانەوە سەر کاروباری خۆیان. من و محەمەد ماینەوە، من لە تەنیشت گۆڕەکەوە دانیشتم و قسەم لەگەڵ مامم کرد. داوای لێبووردنم لێکرد کە نەمانتوانی یارمەتی بدەین. پێم وت کە زۆرم خۆش دەوێت و ئاواتەخواز بووم ئەو من بە گەورەیی ببینێت. پاش ئەوەی تەواو بووم، چنگم لە گڵی سەر گۆڕەکە گرت و بە هێواشی گریام.

نەمدەزانی ماوەی چەندە لە گۆڕستانەکەم، تا ئەو کاتەی لە گریان وەستام. دەمەو ئێوارە بوو و زەنگی شەو لێدرا و هاتوچۆ قەدەغە کرا. من و محەمەد بە هەموو هێزی خۆمان بەرەو ماڵەوە ڕامانکرد، پێش ئەوەی سەربازەکان تەقەمان لێبکەن. چەند ڕۆژێك پاش ناشتنی مامم توانیم

پەیوەندی لەگەڵ لۆرا بکەم. پێم وت ئەگەر بێمە نیویۆرک ئایا دەتوانم لەگەڵ ئەو بژیم؟ وتی بەڵێ!

دووبارە پرسیارم کردەوە: "بەڕاستی گەر بێمە نیویۆرک، دەتوانم لە ماڵەکەی تۆ بمێنمەوە؟ دەمەوێت باش بیربکەیتەوە و دڵنیابیت".

-"بەڵێ".

پاشان پێم وت کە من ئەو ژیانە دەهێنمەوە بەرچاوی خۆم و گەیشتمە (کانەکری) پایتەختی (گینی)، کە وڵاتێکی بێ مەترسی بوو، دووبارە پەیوەندی پێوە دەکەمەوە. پێویست بوو بڕۆم، ترسی ئەوەم هەبوو دووبارە ببمەوە بە سەرباز، یان هاوڕێ سەربازەکانم بمکوژن گەر ڕەتم کردەوە بچمە ریزیانەوە. هەندێك لەو هاوڕێیانەی لە سەنتەرەکە بوون و بۆ باری ئاسایی گەڕابوونەوە، دووبارە چوونەوە ڕیزی سوپا.

حەوت ڕۆژ دوای ناشتنی مامم، (فری تاون)م جێهێشت. بە هیچ کەسم نەوت کە دەڕۆم، جگە لە محەمەد، کە پێویست بوو دواتر هەواڵی ڕۆشتنەکەم بدا بە ئامۆژنم، پاش ئەوەی لە غەم و خەفەت تەواو بوو. دوای مردنی مامم خۆی لە دنیا و هەموو کەس بەدوورگرتبوو.

٣١ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٧ (فری تاون)م جێهێشت. دنیا هێشتا تاریك بوو، هاتوچۆ قەدەغەکرابوو، بەڵام پێویست بوو بڕۆم پێش خۆر هەڵهاتن. لەماوەی ئەو کاژێرە ئەوەندە مەترسیدار نەبوو، چونکە سەربازەکان خەو دەیبردنەوە و خەڵکەکەش لەو تاریکاییە پەییان پێ نەدەبردم.

فیشەك دەنگیدایەوە لە شارە بێدەنگەکە و هەوای ئەو بەیانییەش زۆر دڕندانە دەیدا بە دەموچاومدا، بۆنی لاشەی سووتاو و پاوەڕی دەمانچەی

لێدەهات. دەستی محەمەدم گوشی و پێم وت: "گەیشتمە هەر ئەنوایەك، هەواڵت پێڕادەگەیەنم". ئەویش بە هێواشی کێشای بە شانمدا و هیچی نەوت.

جانتایەکی کۆنی بچووکی پواوم پێبوو، کەمێك جلی تێدا بوو. ئەوکات مەترسیدار بوو، جانتای گەورە، یان جوان بگریت بەدەستتەوە، چەکدارەکان وایاندەزانی شتی گرانبەهات و پێیە و تەقەیان لێدەکردیت.

لە دوایەمین سات‌ەکانی شەو بەڕێکەوتم و ماڵئاوایم لە محەمەد کرد کە لەسەر دالآنەکە وەستابوو. هەر دوورکەوتمەوە ترسم لێنیشت، پێشتر ئەم بارودۆخەم بینیوە. لای عەمودی کارەباکەوە وەستام و چەند بۆکسێکی هەوایم بە توڕەبوونەوە وەشاند، پێویست بوو بڕۆم، ئەگەر سەری نەگرت دەبێت بگەڕێمەوە ناو سوپا. حەزم نەدەکرد بەو جۆرە بیر بکەمەوە. بە خێرایی لەپشت زێرابەکانەوە دەڕۆیشتم، لەوکاتەدا ئۆتۆمبێلێکی سەربازیی گەیشت، من تەنها مەدەنی بووم لەسەر شەقامەکە. بە هێواشی بە خۆمەڵازدانەوە، یان گاگۆلکێ لەپشت دیواری زێرابەکان و خانووەکان چەند خالێکی پشکنینم تێپەڕاند. بێ مەترسی خۆم گەیاندە شوێنی وەستانی پاسەکان لە قەراغ شار، کە چیتر بەکارنەدەهێنرا.

نارەقم کردبووەوە و پێڵوی چاوەکانم دەلەرزین. سەیری دەوروبەرم کرد پڕ خەڵك بوو، پیاوەکان پێدەچوو تەمەنیان لە سییەکاندا بێت-چەند ژنێك و چەند خێزانێکی تر لەگەڵ چەند خێزانێکی تر کە منداڵانی تەمەن ٥ ساڵ و گەورەتریان پێبوو، لەوێ بەتەنیشت دیوارێکی بۆگەنەوە ڕیزیان بەستبوو. هەندێکیان چەند تۆپەلێکیان لەبن دەستیان نابوو، ئەوانی

تریش دەستی منداڵەکانیان گرتبوو. چوومە ڕیزی دواوە و بە چیچکانەوە دانیشتم تا دڵنیا بم هێشتا پارەکانم لە گۆرەویەکانمدا ماوە لە قاچی ڕاستمدا. ئەو پیاوەی لە پێشمەوە بوو لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد و بە خێرایی دەچووە لای دیوارەکە و دەگەڕایەوە. ئەویش زیاتر شپرزەی دەکردم. دوای چەند خولەکێك بێدەنگیی و چاوەڕوانی، ئەو پیاوەی لە ڕیزەکەدا وەستابوو خۆی بە شۆفێری پاسەکە ناوبرد و داوای لێکردین دوایکەوین. زیاتر لە شوێنی وەستانی پاسەکان دوورکەوتینەوە بەناو دیوارە چیمەنتۆ داڕووخاوەکاندا، خۆمان گەیاندە گۆڕەپانێکی کراوە کە پاسەکەی لێ وەستابوو. چووینە پاسەکەوە کە بە بۆیەی تۆخ بۆیاخ کرابوو، تەنانەت چوارچێوەی ئاسنینی تایەکانیش، تا بە شەو دەرنەکەوێت. لایتەکانی کوژاندەوە و ڕێگاکەی دواوەی گرتە بەر. ساڵانێکی زۆر بوو ڕێگاکە بەکار نەبرابوو، بۆیە پێدەچوو پاسەکە بەناو دارستان و دەوەنێکی چڕدا ڕێ بکات، کە گەڵای درەختەکانی بە توندی دەیدایەوە بەملاو ئەولای پاسەکەدا. بە هێواشی ئەوشەوە بەڕێکەوت تا خۆرهەڵهاتن. لەکاتی سەرکەوتن بە گردەکان و هەورازەکاندا دادەبەزین و پاڵمان دەنا و هەموو بێدەنگ و کەس قسەی نەدەکرد، ڕووخسارمان پڕ بوو لە ترس، چونکە هێشتا بەشە مەترسیدارەکەی شارەکەمان جێنەهێشتبوو. گەڕاینەوە ناو پاسەکە، دوای کاژێرێك لە پردێکی کۆن داییەزاندین.

پارەمان دا بە شۆفێرەکە و دوو دوو بەسەر پردە ژەنگاوییەکەدا پەڕینەوە. پاشان بە درێژایی ئەو ڕۆژە بەڕێوەبووین بۆ شوێنێکی تری وەستانی پاس. پێویست بوو تا ڕۆژی داهاتوو چاوەڕێی پاسێکی تر بین. ئەوە

تەنها ڕێگە بوو بۆ دەرچوون لە سیرالیۆن بێنەوەی ڕووبەڕووی چەکدارەکان و پیاوەکانی حکومەتە نوێیەکە ببینەوە و ڕقیان لەو خەڵکە دەبووەوە، کە سیرالیۆنیان جێدەهێشت.

زیاتر لە سی کەس بووین لە نزیك دەوەنێکەوە بە درێژایی شەو دانیشتین و چاوەڕێ بووین. کەس قسەی نەدەکرد. ئەوەی ئاگاداری بووین ئەوە بوو کەسمان بە تەواوی لەو شێتییە دەرباز نەببووین. دایك و باوکەکان بە چرپە قسەیان لەگەڵ منداڵەکانیان دەکرد. لەوە دەترسان دەنگیان بێت.

هەندێکیان چاویان بڕیبووە زەوییەکە و هەندێکیان یارییان بە بەردەکانی سەر زەوییەکە دەکرد. بەئاستەم دەنگی چەند فیشەکێك دەهات. لە قەراغی دیواری زێرابەکەوە دانیشتم هەندێك برنجی کوڵاوم خوارد، کە لە زەرفێکدا هەڵم گرتبوو. بیرم دەکردەوە دەبێت کەی بێت لەدەست جەنگ بە تەواوی هەڵبێم؟ ئەی چی دەبێت ئەگەر پاسەکە نەگەیشت؟ دراوسێیەك لە (فری تاون) پێی وتم ئەمە تەنها ڕێگەی دەرچوونە لە وڵاتەکە، تا ئەو کاتەی لەوێ بووم بێ مەترسی بوو، خەمم بوو، دەمزانی چەند بە خێرایی باروودۆخەکان دەگۆڕدرێن.

برنجەکەم خستەوە ناو جانتاکە و دەستم کرد بە پیاسەکردن بە ناو ڕێگاکەدا تا جێیەك بدۆزمەوە ئەو شەوە لێی دانیشم. خەڵکی لەناو درەختەکاندا نوستبوون نزیك جێی وەستانی پاسەکە تا لە گەیشتنی پاسەکە ئاگادار بن.

کەمێك خوارتر لەژێر چەند لقە درەختێکی هەڵۆژەی بەیەکداچووبوو. پیاوەکان ژێر درەختەکەیان لە گەڵا وشکبووەکان پاککردەوە و گەڵای

تازەیان ڕاخست تا جێسەرینێك بۆ خۆیان دروست بکەن، سەرنجم دا یەکێك لە پیاوەکان چەند گەڵایەکی وشکەوەبووی کردبوو بە گسك و ئەو ناوەی پێ پاك دەکردەوە. منیش لە زێرابەکە دوورکەوتمەوە پاڵم دایەوە بە درەختێکەوە و بەدرێژایی ئەو شەوە بیرم لە مامم و دایك و باوکم دەکردەوە. بۆ هەموویان دەمرن، جگە لە من؟ دەستم کرد بە پیاسەکردن تا تووڕە نەبم.

دەمەو بەیان، خەڵکی لە خەو هەستان و بەدەست خۆیان تەکاند. هەندێ لە پیاوەکان بە ئاوی شەونمی ئەو بەیانە ڕووخساریان تەڕ کرد. گەڵای درەختەکانیان بە سەر و دەموچاویاندا دەپرژاند. دوای چەند کاژێرێك لە چاوەڕوانی، دەنگی مەکینەی پاس دەهات، بەپەلە جانتاکانمان کۆکردەوە بەڵام دڵنیا نەبووین کە ئەوە پاسەکە بێت، یان نا، دەنگەکە تا دەهات نزیکتر دەبووەوە تا ئەو کاتەی پاسەکە بەتەواوی هاتە پێش چاومان. هەموو شتەکانمان کۆکردەوە و بەرەو لای ڕامانکرد. شاگردەکە بەناوماندا گەڕا و پارەکەی کۆکردەوە. من نیوەی پارەکەم دا، چونکە تەمەنم خوار هەژدەساڵان بوو. بۆ بارودۆخێکی ئاوا بێمەترسی، نیوەی پارە لە نرخەکەی خۆی زیاتر بوو. لە پەنجەرەکەوە سەرم دەرهێنا و سەیری درەختەکانم دەکرد کە بەلاماندا تێدەپەڕین. پاسەکە هێواش بووەوە و ئەمجارە چەکدار و چەکی گەورەمان بینی لەبری درەختەکان. داوایان لێکردین هەموو دابەزین. پاشان فەرمانیان کرد بەرەو ڕێبەستەکە بڕۆین. ئاوڕم دایەوە و سەرنج دا لەناو دەوەنەکان دا سەربازی زۆری لێبوو بە چەك و نارنجۆکەوە. سەرقاڵی سەیرکردنیان بووم، ئەوەندەم نەمابوو خۆم بدەم لەو سەربازەی بەرەو لای پاسەکە دەڕۆیشت، ئاوڕی دایەوە و بە چاوێکی سوور وەك خوێن لێمی

ڕوانی، وەك ئەوەی پێم بڵێت: "دەتکوژم گەر بمەوێت و هیچ ئەنجامێکیشم دەست ناکەوێت لە کوشتنت"، ئەم جۆرە سەیرکردنە بەلامەوە نامۆ نەبوو.

لەبەر هەندێ هۆ کە هیچ کەس سەری لێ دەرنەدەکرد، پاسەکەیان پشکنی و پاشان سەرکەوتینەوە هەر بەڕێکەوتین سەیری ڕێبەستەکەم کرد تا لەبەرچاو ون بوو. بیرم هاتەوە ئەوکاتەی سەرباز بووم هێرشمان دەکردە سەر ئەم جۆرە ڕێبەستانە... پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ڕابردوو لە بیرکردنەوە وەستام. بەربەستی زۆر هەبوون، لە هەریەکێکیان سەربازەکان بە شێوازێکی جیا ڕەفتاریان دەکرد. هەندێکیان داوای پارەیان دەکرد، هەرچەندە دۆکیومێنتەکانیشت ڕاست بوونایە گەر پارەت نەدانایە، مەترسی ناردنەوە بۆ ناو شارت دەهاتە سەر.

ئەوانەی پارەیان پێ نەبوو، خشڵ، یان کاژێر، هەر شتێکی بەنرخیان پێوەبوایە دەیانبرد. هەر کات نزیك دەبووینەوە لە سەربازەکان دەستم دەکرد بە دۆعاکردن تا بە سەلامەتی دەرچین. نزیکەی کاژێر ٤ی دوانیوەڕۆ گەیشتینە (کامبیا)، بۆ یەکەمین جار دوای جێهێشتنی شارەکە ڕووخساری خەڵکەکە کەمێك ئارام بووەوە. بەڵام هەر زوو ڕووخسارمان ترسی لێنیشت، نووسینگەی کۆچکەران داوای پارەیان دەکرد تا ڕێگەمان بدەن بە بەربەستکەدا بڕۆین. هەموو دەستیان کرد بە ناو گۆرەوییەکانیان و خوار پانتۆڵەکانیان، یان پەڕۆکانی سەریان تا ئەو بڕە پارەیەی پێیان ماوە تەسلیمی بکەن، ژنێك کە دوو کوڕی نزیکەی تەمەن حەوت ساڵانی پێبوو داوای لە پیاوەکە کرد کە پارە نەدات، پێویستە بەو پارەیە خواردن بۆ منداڵەکانی بکڕێت لە (کۆنەکری). پیاوەکە دەستی ڕاگرتبوو و

نەراندی بەسەریدا و داوای لێکرد بچێتە لاوە بوەستێت. ڕقم لەوە دەبـووەوە کاتێك دەمبینی خەڵکی ناوخۆی سیالیۆن داوای پارە لەو خەڵکـە دەکـەن کە لەتاو جەنگ ڕادەکەن. قازانجیان لە پارەی ئەو خەڵکـە وەردەگـرت کـە لەپێناو ژیانیان هەڵدێن. بیرم لەوە دەکردەوە بۆ دەبێت یـەکێك پـارە بـدات لەبری جێهێشتنی وڵاتەکەی خۆی. داوایانکرد سێسەد لیۆن بدەین. نزیکەی پارەی دوو مانگ، تا مۆری دەرچوون لە پاسپۆرتەکانمان بـدەن. بەهـەرحاڵ بە سنوورەکە تێپەڕیم بـۆ (گـینی). ڕێگەیـەکی دوورم لەبەردەمـدا بـوو، هێشتا پەنجا میل تا بگەمە (کۆنەکری) پایتەخت. بە خێرایی ڕامکرد تـا پاسێکی تر سواربم کە بمگەیەنێتە (کۆنەکری). بیرم کردەوە کە ئەو زمانـە نازانم کـە لـە (گـینی) بـەکاردێت، ترسـم لێنیشـت، بـەڵام جێهێشـتنی سیرالیۆن کەمێك ئارامی کردمەوە. پاسـەکانی (کۆنـەکری) لـە لایـەکی خاڵی پشـکنینەوە بـوون و چـەند سـەربازێکی گـینی لێبـوو. لای خـاڵی پشکنینەکەوە خەڵکی پارەیان دەگۆڕییەوە بۆ گینی بەهەر نرخێـك خۆیـان ئارەزوویان لێبوایـە. سـەرەتا وامزانـی سـەربازەکان هەڵوێسـتیان دەبێـت بەرامبەر ئەم بازاڕە ڕەشە، بەڵام وادیار بوو گوێیـان پـێ نـەدەدا. پارەکـەم گۆڕییەوە و بەناو خاڵی پشکنینەکەدا ڕۆیشتم. ژمارەیـەکی زۆر سـەربازی لێبوو بە ئینگلیزی قسەیان نەدەکرد، یان ڕەنگـە واخۆیـان پیشـان بـدەن. چەکەکانیان بە ئاڕاستەی ئامادەکراو دانرابوو وەك ئەوەی چـاوەڕێی شـتێك بکەن کە ڕووبدات. سەیرم نـەکردن لـەوە دەترسـام بمناسـنەوە کـە پێشـتر سەرباز بووم و بەشداری ئـەو جەنگـە بـووم کـە ئێسـتا جـێم هێشـتووە. خانوویەکی تەختە هەبوو پێویست بوو ئـەوە تێپـەڕێنم تـا بگەمـە جێـی

وەستانی پاسەکان. لەوێ خەڵکی دەپشکنران و پاشان دۆکیۆمێنتەکانیان پێشکەش دەکرد. سەربازەکان جانتاکەیان کردمەوە وەخت بوو بیدڕێنن، هەموو شتومەکەکانیان هەڵدایە سەر زەوی. زۆرم شت پێ نەبوو، بۆیە ئەوەندە ئاستەم نەبوو دووبارە پێچانەوەی. سێ پانتۆڵ و دوو فانیلە و دوو کراس. لە خانووەکە هاتمە دەرەوە، هەستم دەکرد هەموو سەربازەکان سەیرم دەکەن. ئەوکات پێویست بوو دۆکیۆمێنتەکان پێشکەش بکەم، بەڵام کامیان؟ ئەوەندەی مێز لێبوو نەمدەزانی بچمە لای کێ، پیاوەکان لەژێر سێبەری چەند درەختێکی مانگۆ دانیشتبوون، جلی سەربازییان لەبەردا بوو. هەندێکیان چەکەکانیان کردبوو بە لایەکی کورسییەکەوە. هەندێکیان خستبوویانە سەر مێزەکان، ئاراستەی خانووە تەختەکەیان کردبوو، بەم شێوەیە خەڵکیان دەترساند، پێش ئەوەی داوای پارە بکەن.

پیاوێك جگەرەیەکی بە دەمەوە بوو لە کۆتایی ڕیزەکەلای ڕاست دانیشتبوو، بانگی کردم و دەستی ڕاکێشا بۆ پاسپۆرتەکەم. منیش دام پێی بێ ئەوەی سەیری بکەم. بە زمانێك قسەی دەکرد کە تێی نەگەیشتم. پاسپۆرتەکەمی خستە ناو گیرفانی سنگییەوە و جگەرەکەی لەدەمی دەرهێنا و دەستی خستە سەر مێزەکە و بە حرس و تووڕەییەوە لێمی ڕوانی. من سەیری زەوییەکەم دەکرد، بەڵام ئەو چەناگەمی بەرزکردەوە و جگەرەکەی لەدەمی دەرهێنا و دووبارە سەیری پاسپۆرتەکەمی کردەوە. چاوەکانی سوور بوون، بەڵام زەردەیەکی پانوپۆڕی بە ڕوومدا کرد و قۆڵەکانی چەماندنەوە و پاڵیدایەوە، منیش سەیرم کرد و بزەیەکم بۆ کرد ئەویش قاقایەکی لێدا و چەند شتێکی وت و دووبارە دەستی خستەوە سەر

مێزەکە. ئەم جارە زەردەکەی نەما و دەستبەجێ پارەکەم بۆ خستە سەر مێزەکە، بۆنی پارەکەی کرد و خستییە گیرفانییەوە، پاشان پاسپۆرتەکەمی لە گیرفانی دەرهێنا و ئاماژەی کرد لە دەرگا گەورەکەوە بڕۆم.

پاسی زۆری لێبوو. نەمدەزانی کامیان دەچێت بۆ (کۆنەکری). پرسیارم لەهەرکەس دەکرد تێنەدەگەیشتن. تەنها وشە کە بە فەڕەنسی دەمزانی بۆنژۆ بوو، ئەویش سوودی بۆم نەبوو.

بە شپرزەییەوە سەیری ئەملاو ئەولای خۆمم دەکرد تا ئەوکاتەی گەیشتمە لای ڕێبوارێك. بە زمانی کریۆ وتی: "واچ ووسایی یو دای گۆو".

وەڵامم دایەوە و تەوقەم لەگەڵ کرد "می نا سۆری سێ"، "هاودی بۆدی".

"می بۆدی فاین، ئین وەیتین یوو دەی دایا یا سۆ پیکین؟"

پێم وت بەدوای پاسدا دەگەڕێم بۆ (کۆنەکری). ئەویش دەچوو بۆ هەمان جێ. پاسەکە پڕ ببوو، بۆیە لە زۆربەی گەشتەکەدا بە پێوە وەستام. لە ماوەی پەنجا میل نزیکەی پانزە خاڵی پشکنین هەبوو، هەموویان بێ ڕەحمانە ڕەفتاریان دەکرد لە هەموویاندا جێبی پڕ تەقەمەنی وەستابوون. دوو سەرباز لەبەردەم تاوەرێکی ئاسنیندا وەستابوون کە لە زێرابێکەوە بۆ زێرابێکی تری ئەولای ڕێگاکە کشابوو و لای ڕاستیشەوە چەند سەربازێك لەژێر کۆختەیەکدا دانیشتبوون، کە بە خێمەیەك سەرەکەی گیرابوو. چەند بەشێکی کەم هەبوون لە کۆختەکاندا کە خەڵکیان تێیدا دەپشکنی. نرخێکی نەگۆڕیان بۆ سیالیۆن دانابوو، ئەوەی پارەی نەدایە لە پاسەکە دەکرایە خوارەوە، ڕەنگ بێ بیگەڕێننەوە بۆ سەر سنووریش. بەهۆی ئەو

پیاوەی لەگەڵم هاتبوو، لە زۆربەی پشکنینەکان قووتار بووم. وایانـدەزانی مـن کـوڕی ئـەوم، بۆیـە دۆکیۆمێنتـەکانی ئـەویان دەپشـکنی و پـارەی هەردووکمانیان لەو دەسەند. دڵنیا نەبووم خۆی زانیبێتی، یـان نـا، بـەڵام بەلایەوە گرنگ نەبوو ئەو دەیویست بگاتە (کۆنـەکری). لـە یـەکێك لـە ڕێبەستەکان منیان دابەزاند و داوایان لێکـردم جلـەکانم داکـەنم، سـەرەتا نەمویست، بەڵام پیاوێکم بینی کەوتبوونە لێدانی تا جلەکانی دابکەنێـت. یەکێك لە سەربازەکان قایشەکەمی بـرد منـیش بـە دەسـت پانتۆڵەکـەم گرتبوو، ئەو قایشەم کە بەلامەوە پەسەندترین بوو، سەری شـێرێکی پێـوە بوو. پەنجەکانم لە لەپی دەستمدا داچـەقاند تـا توڕەبوونەکـەم بڕەوێتـەوە، ددانەکانم جیڕکردنەوە و گەڕامەوە بـۆ نـاو پاسـەکە. لـە ڕێبەسـتێکی تـر سەربازێك داوای لێکردم دەستم بخەمە سەر سەرم تا بمپشکنێت. ئەوکاتـەی دەستم لابرد پانتۆڵەکەم کەوتە خوارەوە هەموو خەڵکەکە دەستیان کرد بـە پێکەنین. سەربازەکە پانتۆڵەکەمی بەرزکردەوە و بە قەیتانێکی پێڵاو بـۆی بەستم کە لە گیرفانی خۆی دەریهێنا. بە خێرایی پەڕەی ناو پاسپۆرتەکەمی هەڵدایەوە و دایەوە دەستم. لەدوای خەڵکەکەوە ڕیزم بەست، زۆر توڕە بووم، بەڵام پێویست بوو هێمن ببمەوە تـا بگەمـە (کۆنـەکری). بیسـتبووم کـە داوای سێسەد لیۆن دەکەن تا بگەمـە ئـەوێ، منـیش تـەنها سـەد لیـۆنم پێمابوو ئەویش پێویست بوو تا گەشـتەکەمی پێتـەواو بکـەم. فرمێسـك لەچاوانم هەڵقوڵا، نەمدەزانی چی بکەم، ڕێگەی گەڕانەوەش نەبوو بۆ (فری تاون). شپرزە و دوودڵ بـووم، پیـاوێکم بـینی کـە پاسـپۆرتەکەی مـۆری لێدرابوو لەو کاتەی بەرەو پاسەکە ڕۆیشت دووجانتای لێکەوتە خوارەوە. بۆ

ماوەیەك دوودڵ بووم دواتر بڕیارم دا جانتاکان هەڵبگرمەوە و دوای بکەوم بۆ ناو پاسەکە، خێرا چوومە دواوە و تا دەهات قەرەباڵغتر دەبوو. سەربازەکان بەدوامدا نەهاتن، بەرە بەرە کەوتە ڕێ و خێراتر بوو، بە نایاسایی هاتمە ناو شارەکە، دەمزانی دواتر کێشەم بۆ دروست دەکات.

گەیشتینە کۆنەکری ترسم لێنیشت. نەمدەزانی بچمە کوێ، بیستبووم لە باڵیۆزی سیرالیۆن ڕێگە دەدرێت بە ئاوارەکان بۆ ماوەیەکی کاتی لە کەمپی باڵیۆز بمێننەوە، بەڵام نەمدەزانی باڵیۆزەکە لە کوێوەیە. لەتەنیشت کوڕێکی فولانی* دانیشتبووم بەناوی جالۆ. وتی لە (فری تاون) ژیاوە و باسی جەنگمان دەکرد، کە چی بەسەر وڵاتەکەدا هێنابوو. پاش ئەوە ژمارە تەلەفۆنی خۆی دامێ و پێی وتم پەیوەندی پێوە بکەم هەرکات پێویستم بە یارمەتی بوو لە شارەکە. دەمویست پێی بڵێم هیچ جێیەکم نییە لێی بژیم، بەڵام پێش ئەوەی غیرەتی ئەوە بگرێت، ئەو دابەزی. بەدوای پیاوەکە گەڕام کە یەکەم جار لەگەڵیدا هاتبووم، بەڵام نەمدۆزییەوە، پاشان گەیشتینە دوایەمین جێی وەستانی پاس و دابەزیم لەدوای خەڵکەکەوە ڕۆیشتم و لەسەر کورسییەکی بێ پشتی تەختە دانیشتم و هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی. لەبەر خۆمەوە دەستم کرد بە قسەکردن "ئاخر ناتوانم بە درێژایی شەو لێرە بم..." ژمارەیەکی زۆر تاکسی لێبوو، هەموو ئەوانەی لە پاسەکە دادەبەزین سواری تەکسی دەبوون. منیش نەمدەویست وەك بێگانەیەکی بێ ئەنوا دەرکەوم،

---

* فولانی: Fulani بەو گەڕۆکانە دەوترێت کە چەند سەدەیەك لەمەوپێش لەپێناو مانەوە کۆچییان کردووە بۆ ناوەڕاست و خۆرئاوای ئەفریقا.

تەکسییەکم گـرت. شـۆفێرەکە چـەند شـتێکی بـە فەڕەنسـی وت، زانـیم دەپرسـێت دەمـەوێت بـۆ کـوێ بـڕۆم. هەرچـۆنێك بێـت تێمگەیانـد "سـیپالیۆن... ئاااهـه... بـالێۆز" سـەیری عـەمودە کارەباییـەکان و گلۆپەکانی سەرشـەقامەکەم کـرد کـە لـە مـانگ زیـاتر دەدرەوشـانەوە. گەیشتمە باڵیۆز، پیاوەکە هێمای بۆ ئاڵای شین و سپی و سـەوز کـرد تـا دڵنیام بکاتەوە ئەوە جێیەکەیە. پارەکەم دا و دابەزیم. چوومە ناو بـاڵیۆز و پیاوێك بە زمانی کریۆ داوای پاسپۆرتی کرد. منیش پێم دا و بردیـانم بـۆ چەند خانوویەك. لە ژوورەوە زیاتر لە پەنجا کەسی لێبوو، پێدەچوو هـەمان بارودۆخی منیان هەبێت. هەندێکیان لەسەر پارچە ڕایەخێك خـەوتبوون و شتومەکەکانیان لـە تەنیشـتیانەوە بـوو، هەنـدێکیان ڕایەخـەکانیان لـە جانتاکانیان دەردەهێنا. زانیم خەڵك بەتەنها شەوانە لێرەن و بـەڕۆژ دەچـنە دەرەوە. لە سووچێکدا دانیشتم پاڵمدایەوە بـە دیوارەکـەوە و هەناسـەیەکی قـوڵم هەڵمـژی. دەنگـی هـەموو خـەڵك کـە هەناسـەی نائومێـدیـیان هەڵدەمژی، بیری ئەو چەند گوندەی دەخستمەوە کـە لـەکاتی هـەڵاتن لـە جەنگ بەلایاندا تێپەڕیبووم. لەوە دەترسام بۆ بەیانی چیم لێ بەسـەربێت، سەرەڕای ئەوەش دڵخۆش بووم (فری تاون)م جێهێشت و چانسی ئەوە نـەما دووبارە ببمەوە بە سەرباز. ئەوە هەندێ ئارامی پێ بەخشیم. برنجەکـەم لـە جانتاکەم دەرهێنا و دەستم کرد بە خواردنی. ژنێك بەرامبەرم دانیشـتبوو، کوڕێك و کچێکی لەگەڵدا بوو تەمەنیان لە حەوت ساڵ زیاتر نـەبوو. بـە چرپە تـا ئـەوانی تـر بێـزار نـەبن، چـیرۆکی دەگێڕایـەوە لەگـەڵ بینـینی

دەستەکانی ئەودا شەپۆلی یادگارییەکانم بردیانەوە بۆ ئەو کاتانەی کە زۆرجار گوێم لە چیرۆك گرتووە تیایدا.

***

کات شەو بوو، دانیشتبووین و قۆڵمان ڕووە و ئاگرەکە درێژکردبوو و گوێمان لە چیرۆك دەگرت. ئاگرەکە دەموچاومانی لە تاریکی شەو ڕووناك دەکردەوە و دووکەڵ بە ئاسماندا بەرز دەبووەوە. (پا سیێ سەی)، باپیرەی یەکێك لە هاوڕێکانم چەندەها چیرۆکی دەگێڕایەوە بۆمان، پاشان لە دوایەمین چیرۆکدا دەیوت: "گوێ بگرن ئەمەیان زۆر گرنگە". قوڕگی پاك دەکردەوە و دەستی پێ دەکرد.

"ڕاوچییەك هەبوو، ڕۆژێکیان چوو بۆ دارستانێك تا مەیموونێك بکوژێت. بۆ ماوەیەك چاوی گێڕا و مەیموونەکەی بینی لەسەر لقی درەختێکی نزم دانیشتبوو. مەیموونەکە گوێی پێ نەدا، هەرچەندە دەنگی پێیەکانی ڕاوچییەکە لەسەر گەڵا وشکەوەبووکان نزیکتر دەبووەوە. کاتێ ڕاوچییەکە نزیکبووەوە، لەپشتییەوە چەکەکەی ئاڕاستە کرد و میلی هێنایەوە، دەستبەجێ مەیموونەکە ڕووی تێکرد و وتی: "گەر من بکوژیت دایکت دەمرێت، گەر نەمکوژیت باوکت دەمرێت"، پاشان ڕووی وەرگێڕا و خواردنەکەی دەجوو، جاربەجاریش سەری، یان لایەکی سکی دەخوراند.

"چیت دەکرد گەر ڕاوچی بوویتایە؟"

ئەمە چیرۆکێك بوو، ساڵی یەك جار بۆ منداڵانی گوندەکە دەگێڕدرایەوە. چیرۆك گێڕەوەکە، بەزۆری تەمەنی گەورەتر بوو. ئەم پرسیارە

بیٚ وەڵامەی لە منداڵەکان دەکرد هەموو ئەو منداڵانەی گوێیـان گرتبـوو داوایان لێدەکرا وەڵامێك بڵێن، بەڵام هیچ منداڵێك وەڵامەکـەی نـەدەزانی، گەر وەڵامێکیشیان پیٚ بوایە نەیاندەتوانی بیڵێن لەبەر ئـەوەی هـەموویان دایك و باوکیان هەبوو. پیاوەکە خۆشی وەڵامەکەی نەدەزانی، هەرکات ئەو پرسیارەم لێـدەکرا پـێم دەوت کـە جـارێکی تـر بـیری لێدەکەمـەوە. بـە دڵنیاییەوە.ئەوەش وەڵامێکی باش نەبوو.

لە ماوەی ئەم دانیشتنانەدا، من و هاوڕێکانم (کـە هـەموو تەمـەنمان لەنێوان شەش بۆ دوانزە ساڵان بوو)، چەند مشـتومڕێکمان دەکـرد. هـیچ وەڵامێك نـەبوو گـەر مەیموونەکـەمان بکوشـتایە یـەکێك دەمـرد، گـەر نەمانکوشتایە، دووبارە یەکێك دەمرد.

ئەو شەوە وەڵامێکمان ئامادەکرد، بەڵام دەستبەجیٚ ڕەتکرایەوە. بە (پـا سیٚ سـەی)مـان وت گـەر ئێمـە ڕاوچـی بووینایـە نەدەچـووین بـۆ ڕاوی مەیموون، لەبری مەیموون چەندین ئاژەڵی تر هەبوون بۆ نموونە ئاسك.

پێش ئەوەی لەتێك لە فستقەکەی بخاتە دەمییەوە. وتی:

"ئەمە وەڵامێکی شـیاو نییـە. ئێمـە بـاس لـەوە دەکـەین کـە ئێـوە چەکەکانتان ڕووە و مەیموونەکە کردووە و ناتوانن ئەوە بگۆڕن".

کە تەمەنم حەوت ساڵان بوو وەڵامی ئەو پرسیارەم هەبوو، بـەڵام لەبـەر دڵی دایکم، لەگەڵ کەس مشتومڕم لەسەری نـەکردبوو. بـە خـۆمم دەوت گەر من ڕاوچییەکە بوومایـە، تەقـەم لـە مەیموونەکـە دەکـرد، تـا چـیتر ڕاوچییەکانی تر نەخاتە هەمان ئەو تەنگوچەڵەمەیەی من تێیکەوتووم.

ناوی کتێب: ڕێگایەکی دوورودرێژ

بابەت: یاداشت

نووسەر: ئیشمایل بییە

ساڵی چاپکردن : ٢٠٠٧

شوێنی چاپ: USA - نیویۆرك

بڵاوکەرەوە: Sara Crichton Books

| | |
|---|---|
| Ishmael Beah | **Author(s)** |
| United States | **Country** |
| English | **Language** |
| Civil War ،History | **Subject(s)** |
| Memoir | **Genre(s)** |
| Sarah Crichton Books | **Publisher** |
| 2007 ،February 13 | **Publication date** |



The True Story
of a Child Soldier

# a Long Way gone


By: ISHMAEL BEAH
Tr: SHENE BOSKANI



بەڕێوەبەرێتیی
چاپ و بڵاوکردنەوەی
سلێمانی
2013